# نامەکانی تولستوی

## ١٨٤٥- ١٩١٠

وەرگێڕانی لە فارسییەوە

حەمەکەریم عارف

٢٠١١/٥/٣١

**پێرست**:

## پێشەکی وەرگێڕی فارسی

گەلێك لە پسپۆڕو شارەزایانی دنیا (تولستوی)یان بە یەکێك لە گەورەترین نووسەرانی مێژوو،و بەرهەمەکانی ئەو، بە تایبەتی (شەڕو ئاشتی)یان بە پڕ بەهاترین و شایستەترین شاکاری چیرۆکڤانی ئەم چەند سەدەیەی دوایی زانیوە. لەگینە ئەم بۆچوونە تا ڕادەیەك موبالەغەئامێز بێتە بەرچاو، لێ ئەوەی گومان هەڵناگرێ ئەمەیە کە کەم نووسەر لە مێژووی ئەدەبیاتی نێو نەتەوەیی و جیهانیدا هەیە کە تا ئەم ڕادەیە نێوو نێوبانگی لە ژێر گومەزی گێتیدا دەنگی دابێتەوە. بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستیە ئەوەیە کە تێکڕای بەرهەمەکانی لە سەرانسەری جیهاندا، لەوانە ئێران، پاچڤەکراوەو هەزاران کتێب دەربارەی شیکردنەوەو شرۆڤەو ڕاڤەی بەرهەمەکانی یان ژیانی هاتوونەتە نووسین.

ئەوەی رەنگبێ بە هەمان ئەندازەی نووسین و بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە ناوادارە بۆ دۆستداران و هەوادارانی ئەو گرینگ بێ، هەمان وردەکاری کەسایەتی مەنگ و مەندو ئاڵۆزو چۆنیەتی بەسەربردنی تەمەنی دوورو درێژیەتی کە گەلێك لە توێژەران و بیوگراف نووسان هەوڵیانداوە وردی بکەنەوەو هەلاجی بکەن. بۆیە زۆر کتێبانی لەم بارەیەوە لەسەر نووسراون، لێ(بەڵام) بێگومان ئەوەی دەتوانێ بە شێوەیەکی دیکۆمێنتاری و باشتر چۆنیەتی هزرو بیرو سۆزو وردەکارییەکانی کەسایەتی نووسەرێك ئاشکرا بکات نووسینەکانیەتی. بە تایبەتی نووسینانی میناکی(وەکو) نامەکانی تولستوی کە لە باری هەمە جۆری و فراوانی و باسی مەسەلەو دۆزە جۆراوجۆرەکانی سەردەمی خۆیەوە کەم نووسەر دەتوانێ شان لە شانی بدات. خۆشبەختانە کۆی ئەم نامانە بەتەواوەتی و بێ هیچ کێماسی و نوقسانیەك بۆ تۆمار کردن لە مێژووی نەمری ئەدەبیاتدا ماوەتەوەو لەو دواییانەدا نامەکانی تولستوی لە ئیتاڵیادا پاچڤە کراوەو بە چاپێکی جوان بڵاوبووەتەوە.

جا چونکە من بۆ خۆم یەك لە ئاشقانی بەهەرمێن (تولستوی)م و یەکێك لە شانازییە رۆشنبیرییەکانم پاچڤەی (ئاناکارنینا)یە بۆ سەر زمانی فارسی، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی نامەکانی ئەو کەڵە نووسەرەدا، قۆڵی هیمەتم لێ هەڵماڵی و کەوتمە وەرگێڕانیان و ئێستاش زۆر خۆشحاڵم کە دەتوانم بیانخەمە خزمەتی توێژەران و زانست پەروەرانی ئازیزی ئێرانی. نامەکان بە گوێرەی ریزبەندی رێڕەوی ژیانی تولستوی پاچڤە کراون و چاوپۆشیم لە چاپی چەند دانەیەکیان کردووە کە بۆ خوێنەری ئێرانی ئەوەندە لەبار نەبووە.

لەبەر ئەوەی کە لە کاتی تەواو بوونی ئەم پاچڤەیەی ئەم نامانەدا، بە بۆنەی سەدو پەنجا ساڵەی یادی لە دایکبوونی تولستوی، وتارێکی جوان لەلایەن پیردوپوادوفر ( Pierrede Boiode Ffre)وە لە رۆژنامەی لۆموندا لە ژێر سەر ناڤی (مدهب هزار سال سوم) بڵاو کرایەوەو کاریگەرییەکی فرەی لە ناساندنی تولستوی دا هەیە، هەوەڵجار کەوتوومەتە وەرگێڕانی ئەو وتارەو دوای ئەوە ئەو کورتە پێشەکیەش کە سیلڤیو برنادرینی (Silvio Bernardini) دەربارەی ڕاڤەو شرۆڤەی نامەکانی تولستوی نووسیویەتی دەخەمە بەر دیدەی خوێنەران.

(مەزەبی هەزار ساڵی سێیەم)

– حەز دەکەی بالیفەکانت بۆ ڕێك بخەم؟
– نـە! نـە! مـن ئامۆژگاریتـان دەکـەم ئـەوەتان لـە یـاد بـێ کـە لـە دنیـادا جگـە لـە لیـڤ تولسـتوی بنیادەمانێکی زۆری دیکەش هەن، کەچی هەموو هۆش و گۆشی ئەنگۆ لای لیڤە.
ئەمـە دوا پـەیڤێك بـوو کـە بـە دەنگـی ڕەوان و بـە شـێوەیەکی پچـڕ پچـڕ، بـەر لـە مـردن لـە زاری تولستوی هاتە دەرێ.
نووسەر بەدەم گیانەڵلاوە کە هەشتاو دووەمین قۆناغی ژیانی دەبڕی، هەفتەیەك بوو لـە وێسـتگە چکۆلەکەی سکەی قیتاری (ئاستاپۆڤو) لە جێگەدا کەوتبوو و سـەدان وێنـەگرو ڕۆژنامـەنووس لـە دەوری خڕ بوو بوونەوە. لە جەرگەی تاریکە شەوی ١٩١٠/١٠/٢٨ بە شێوەیەکی کوتوپڕ بڕیـاری دابوو هاوسەرەکەی و گوندی یاسنایاپولیانای زێـدو زاگـەی خـۆی کـە نزیکـەی نیـو سـەدەی تیـادا بەسـەر بردبـوو، بـەجێ بێڵێـت و بـاقی تەمـەنی لـە دێڕەکـەی مـاری خوشـکیدا بەسـەر بـەرێت. لـەو ژوورەدا کە بەڕێوەبەری وێستگەی ئاستاپوڤو خستبوویە خزمەتی، پەلەی بوو تا زووە ئەوێنـدەر بەجێ بێڵـێ، چـەند بیرۆکـەیـەکی لـە شێوەی وەسـێتنامەدا بـە دەوروبەرەکـەی پـڕ کـردەوە: "خـودا گشتێکی بێ کۆتاییە و مرۆڤ خۆی بە پاژێکی تەواوی ئەو گشتە دەزانێت. هەر خوا هەیـەو بـەس. بەشـەر تـەنیا ڕەمـزو نیشـانەی ئـەوە لـە تەبیعـەت و زەمـان و فـەزادا. تـا خۆشەویسـتی و مەحەبـەت زیاتر بێ، مرۆڤ زیاتر دەبێتە نیشانەی خوداو بوونی حەقیقەتتر دەبێ."
کات کەم بوو و تولستوی پەلەی بوو کە لەم دنیایە بڕوات، گـوتی: "کـاتی هەسـتان، یـانی کـاتی مەرگ هاتووە. خودایا یارمەتیم بدە کە بە تەنیا لە بەرانبەر تۆدا بەسـەر بـەرم و تـەنیا لـە خزمـەتی تـۆدابم". هـەنگێ بەدەسـتە لەرزۆکـەکانی دەفتەرچەی یاداشـتەکانی خـۆی بـۆ سـبەینێ، حـەوتی نۆڤەمبەر هەڵگرت، نووسیبووی: "ژیان جگە لە خەونێك هیچی تر نیە، مەرگ بێدارییە."
ڕۆژی حەوتەمی نۆڤەمبەر خەونەکە کۆتایی هـات و پـەڕجوکاری پیرو زورهـان بارگـەی لـەم دنیایـە پێچـایەوەو ڕۆژی نۆیـەمی نۆڤەمبـەر بـە ئامـادەبوونی چـوار هـەزار کـەس لـە موریـدانی خـۆی لـە گۆشەیەکی کەسکی خاکی (یاسنایا)دا کە ساڵانێکی زۆری تیا بەسەر بردبوو و تەسەوری دەکرد لەوێدا رازو ڕەمزو نهێنی "خۆشەویستی جیهانی" کەشفکردووە، بە خاك سپێردرا.
ژیانی کەڵە مرۆڤان لە ڕاستیدا میناکی خەونە. لـێ خەونـەکانی تولسـتوی لـە زۆر ژیـان حـەقیقی تـر دێتـە بەرچـاو. خۆیشـی لەبـەر چـاوی ئێمەمانانـدا وەکـو یەکێکـە لـەو خەوتووانـەی کـە کافکـا وەسفی کردوون و لە کاتی خەودا چاویان کراوەیەو لە ئێمە زیاتر دەبینن و ڕووداوان بـەر، لـەوەی ڕوو بدەن، پێشبینی دەکەن.
تولسـتوی ڕۆژی ١٨٢٩/٨/٢٨ هاتووەتـە دنیـاو ژیـانی لـە جیهانێکـدا بەسـەر بـرد بـوو کـە هـیچ شتێکی نەدەگۆڕاو بە دەردی حەکیمان و فەیلەسفانی ئەو زەمانە گوتوویانە نەدەبوو هیچ شـتێکی بگۆڕێت. لـە گونـدی یاسـنایا پۆلیانـادا خـەڵکی تـەنیا باوەڕیـان بـە خـواو تـزارو نیشـتمان هـەبوو زاڵی و دەسەڵاتی دەوڵەت و حکومەتیان بەسەر گیان و ماڵی خەڵکیەوە بە کـارێکی بنجـبڕو حـەڵاڵ و ڕەوا دەزانی. کۆیلەکانی لـە مـاڵی ئاغاکـانی خـۆدا دەهاتنـە دنیـاو هـەر لـەوێش دەمـردن و نـەوە لـە دوای نەوە گیان فیداییان بۆ ئاغایان دەکرد. تولستوی لـەم خـوانی تاڵانیـەدا، چـەند سـەد هیکتـار

زەوی، سێ سەد سەر مەڕو ماڵاتو نزیکەی هەزار مسکێنو ڕەعیەتی بە نسیب بوو بوو. باپیری لە باوکەوە لەلایەن پتروسی گەورەوە شەرەفی هاتنە ریزی ئەشراف و ئەرستۆکراتانی پێ درابوو، و لە مبارەیەوە زۆر بە خۆی دەنازی، بەڵام لە نەنك و نەنکە گەورەیەوە ڕەگ و ریشەو ئەسڵ و فەسڵی دەچووەوە سەر قۆناغەکانی هەوەڵی – مسکویی–. لیف نیکولایوفیچ بە ناوی کۆنت تولستوی یەوە هاتە دنیاو لە ماوەی نزیکەی یەك سەدەدا لە سەرانسەری جیهاندا تەنیا بە ناوی تولستوی روتەوە ناسرابوو.

لە سەرەتادا میناکی هەر تاکێکی چینی ئەشراف و ئۆرستۆکرات قۆناغە پێویستەکانی بڕی. لە سوپای قەفقازدا بە پلەی ئەفسەری گەییشت و پاشان بۆ بەڕێوەبرن و رێکخستنی کارەکانی خۆی، شانی دایە بەر کاری ئیداری. خووی بە ژیانی پڕ زەبت و زاکونی سوپایی و لە هەمان کاتدا رابواردن و عەیش و نۆشە بێ سەروبەرەکانی خۆیەوە گرتبوو. ئەو خانووەی کە تیادا لە دایك بوو بوو، لە قوماردا دۆڕاند. لە قرمدا بەشداری شەڕی کرد، لێ نە لە سوپاداو نە لە کاری حکومەتیدا هەستی بە ئاسوودەیی و خۆشی نەدەکرد. لە مبارەیەوە، لە ساڵی ١٨٥٣دا کە تەمەنی لە ٢٥ ساڵ تێ نەپەڕی بوو، نووسیویەتی:

***"دەبێ لە ئەنجامدا قەناعەت بە خۆ بێنم کە کەسێکی ریز پەڕم. یان لە زەمان و سەردەمی خۆم زۆر لە پێشترم و یان لەو کەسە ناکۆمەڵایەتی و نەکلۆکانەم کە هەرگیز هەست بە رەزامەندی ناکەن".***

وێڕای ئەمەش لەو کاتەدا کە بە زۆری خۆنوێنی و قومارو شەهوەتپەرستی و هەوەسڕانی ئەوی بە خۆوە مژول کردبوو، هەمیشە لە پێناوی روحی مەغروورو بێ توانای خۆیدا لەبەر خوا دەپاڕایەوەو داوای بووردنی دەکرد. نەك هەر باوەڕی بە نەمری روح هەبوو بەڵکو باوەڕی بە گەورەیی و شکۆی بێ پایانی رۆحی خۆی هەبوو. لە سباستویلدا بوو کە پەنجا ساڵێك بەر لە سەر هەڵدانی مەزەبی بە ناوبانگی تولستویزم ڕەنگی ئەم فەلسەفەیەی رشت. ئەو مەزەبە نوێیەی کە تولستوی پێشنیازی کرد لە ڕاستیدا هەمان مەزەب و ئاینی مەسیحە ،لێ بەرەچاوکردنی گۆڕانکارییە شارستانییەکان و چاوپۆشی لە باوەڕو ئیمانی کوێرانەو نهێنی. ئەم مەزەبە جگە لە بەختەوەری ئایندە "بەختەوەری بەشەران لەسەر رووی زەوی"ش دابین دەکات.

واز لە سوپا دێنێ، دەکەوێتە گەڕان و سەفەران و زوو بە زوو سەرکە وتنانی گەورە بە دەست دێنێ، لێ بە هیچ جۆرێ هەست بە خۆشی و شادی ناکات. سەرەنجام لە تەمەنی سی و چوار ساڵیدا تووشی سۆنیا بیرس دەبێت ، شێت ئاسا حەزی لێدەکات و زەماوەندی دەگەڵ دەکات و لەگەڵ ئەودا بۆ یاسنایاپولیانا دەگەڕێتەوەو لەوێندەر لە ماوەی چل وهەشت ساڵدا دەبێ بە خودانی سیازدە فرزەندو شاکارە نەمرەکانی خۆی، یەك لە دووی یەك پێشکەش بەتیرەی بەشەر دەکات. لە ساڵی ١٨٦٢دا سەرکەوتنی (قۆزاقەکان)، لە ساڵی ١٨٦٩ سەرکەوتنی (شەڕو ئاشتی)، لە ساڵی ١٨٧٧ شانازی جیهانی(ئاناکارنینا)ی بەنسیب دەبێت. تولستوی پاش ئەم سەرکەوتنانەی، لە تەمەنی نزیکی پەنجا ساڵیدا جارێکی دی گەڕایەوە سەر مەزەبی ئەرتەدوکس و کەوتە ئەنجامدانی ئسوڵی ئاین و ئۆل(دین)، لێ فەلسەفەی ژیان و نهێنی بۆ تاقە

ساتێکیش مێشکی کونجکاوی، ڕێك وەکو هەمان ئەو دەمانەی کە لە هەنبەر جەنازەکەی نیکولایی برایدا مات و مەدهۆش وەستا بوو، مێشکی ڕەها نەدەکردو ئەو هەموو شۆرەت و شانازیی و سەرکەوتنانە زەرەیەکی لە سەرگەردانی روحی ئەو کەم نەدەکردەوە. لە نامەیەکیا بۆ دۆستەکەی نووسیویەتی: ***" چل ساڵ کارو پێشڤەچوونی بەردەوام بۆ دیتنی ئەمەی کە هیچ شتێك نیە، تا ئەو کاتە دەتوانی بژیت کە مەستی ژیان بیت، بەڵام هەر کە نەشئەی مەستی رەوییەوە ئیدی بەشەر بۆی دەردەکەویٚ کە لەم جیهانەدا جگە لە کەڵەك و خاپاندن و تەزویرو قەڵبکاری هیچ شتێکی دیکە نەبووە. هونەر؟ ئەویش جگە لە ئاوێنەی ژیان هیچ شتێکی دیکە نیە و کاتیٚ کە خودی ژیان بیٚ مانا بێت ، ئیدی گەمەی ئاوێنەش هیچ ناسکی و تامێکی نیە."***

دوای دوو ساڵان جارێکی دی لە مەزەبی سەرڤە سەرڤە(سەتحی) دوور کەوتەوەو وێڕای هەوڵ و کۆشش بۆ فێربوون و پراکتیزە کردنی ئوسوڵی ئاین و ڕاوێژ بە زانایانی مەزەب – کە یەکێك لەوانە قوتبی بە ناوبانگ ئامبروزی مامۆستای دۆستویفسکی بوو– نەیتوانی قەناعەت بەخۆی بکات کە مەزەبەکەی هەقەو مەسەلەی تەسلیس و ژیانەوەو گۆڕینی مادەی نان و شەراب بە گیان و خوێنی مەسیح و هەزاران رازو نهێنی دیکە، زەینی پەریشان دەکرد. بۆیە جارێکی دیکە بە وردی کتێبی "ئامۆژگاری لە کویێستاندا"ی خوێندەوەو ناکۆکی و هەڤدژی نێوان کۆمەڵگای مەسیحی و ئەو فێرکردن و پەروەردەیەی کە خۆی مەشخەڵ هەڵگری بوو، مەنجەڵی تورەیی لە دڵیا هێنایە کوڵ و جۆش. لە خۆی دەپرسی: لە کاتێکا کە مەسیح شەڕو زۆرداری و سەروەت و سامان کۆکردنەوەی مەحکوم کردووە، بۆچی کلێسا شەقڵی موبارەکی بە سوپایان دەبەخشێت و دەڵەچەیی و مەرایی لەبەر خاوەن پول و زۆر دەکات؟ کاتی ئەوە هاتووە کە ئاینی مەسیح لەو گۆڕان و ساختەکاریانەی کە بە تۆبزی لیٚی بارکراوە، پاك بکرێتەوە. لەسەر هێم و بناغەی ئەم بیرو هزرانە بوو کە ئیعترافاتەکانی خۆی نووسی. تولستوی باوەڕی وابوو تەنیا دەرککردنی پەیامی مەسیح بەس نیە، بەڵکو دەبیٚ بەگوێرەی ئەو پەیامە بژیت. لەم بارەیەوە نووسیویەتی و دەڵێت: ***"کاتیٚ کە من نێردراوی خودابم ناتوانم بە پەیڕەوکردنی پێنج فەرمانەکە ئیکتیفا بکەم. ئەرکی سەرەکی من ژیان و مومارەسەی ژیانە بە گوێرەی ئەو حەقیقەتانەی کە دەرکم کردووە، بڵاوکردنەوەو رەواجدانە بەو نورانەی کە روناکی کردوومەتەوە."***

ئیدی تولستوی دەکەوێتە دیدەنی زندانیان و پێشوازی میوانان و زیارەتکاران و دەرگای ماڵەکەی خۆی لە ڕووی ئاتاجان و هەژاران دەکاتەوەو بە شێوەی نە ناسێك لە کلێساو دێری ئۆپتیمادا ژیان بەسەر دەبات. تولستویزم لە گۆشەنیگای ئەوەوە وشەو زارەیەکی زۆر سادەیە: پراکتیزەکردنی ژیان لەگەڵ چۆنیەتی ئیماندا.

ئەلکساندەری دووەم: ئازادکەری کۆیلان لە رۆژی ١٨٨١/٣/١ تیروریستان بۆمبێکیان پێدا تەقاندەوەو مرد. تولستوی کە زۆر لەم هەوڵە تیرویستییە پەست و بێزار بوو لە نامەیەکیا بۆ ئەلکساندەری سێیەم دەڵێت: ***" بابی تۆ، ئەو تزارەی روس کە ئەو هەموو چاکەیەی کرد، بە شێوەیەکی ترسناك کوژرا. دیارە تۆ دەرهەق بە بکوژانی ئەو، جگە لە هەستی تۆڵە ناتوانیٚ هیچ هەستێکی دیکەت هەبێت. تۆ هەمیشە فێری ئەوە کراوی کە " هاوڕەگەزانی خۆت خۆش بویٚ***

***دژایەتی دژمنانت بکە" بەڵام من پێت دەڵێم: "دژمنەکانیشت خۆش بوێ‌و دەرهەق بەوانەش کە کینەکێشیت دەگەڵ دەکەن، چاکە بکە.***

***"خاوەنشکۆ! هەرکاتێ ئەمە بکەیت بەچاوی خۆت دەبینی کە چ شەپۆلێکی میهرو مەحەبەت، ڤیان‌و خۆشەویستی روسیا دەگرێتەوە. لە هەنبەر تزارێکدا کە یاسای مەسیح جێبەجێ بکات، هەر هەوڵێکی کودەتایی میناکی مۆمی نێو ئاگر دەتوێتەوە."***

لێ تزار هیچ حیسابێکی بۆ قسەکانی ئەو نەکردو بکوژانی بابی ئیعدام کرد. تولستوی لە دەفتەری بیرەوەرییەکانی خۆیدا ئەمەی نووسیوە: ***"مەحاڵە، شۆڕش هەر ڕوو دەدات، کەس ناتوانێ پێشی بگرێت. سەیر ئەمەیە کە بۆچی تا ئێستا رووی نەداوە."*** لە خۆی دەپرسێت:"لەم کاتەدا چ بکرێ؟" دەبێ چاو لە مەسیح بکرێ کە چۆن لە نێو هەژاران‌و گەدایاندا دەژیا.

کاتێ کە خانەوادەکەی لە مۆسکۆدا ئاکنجی‌و جێگیر دەبێت، چونکە سۆنیای هاوسەری لێبڕا بوو سەرپەرشتی خوێندنی منداڵەکانی بکات. لیڤ هەستدەکات کەندێك ئەو لە هاوسەرەکەی دادەبڕێت. لە ساڵی ١٨٨٣دا ئیدارەی سەروەت‌و سامان‌و ماڵەکەی بەو دەسپێرێت‌و بە خۆی کونجی خەڵوەت‌و گۆشەگیری هەڵدەبژێرێت. پاش شازادە ساڵ بۆی دەنووسێت: "بۆ من درێژەدان بە ژیان بەم شێوەیەی ئێستا ئاسان نیە، چونکە ناتوانم درێژە بە خەبتین‌و کۆشش بدەم‌و زەمینەی تۆڕەبوونی ئێوە فەراهەم بکەم یان لە بەردەم واسواساندا مل بدەمە خەت‌و سەر دانەوێنم.

ئاشکرایە پشتکردنە سەروەت‌و سامانی ئەو تا چ رادەیەك دەوروبەرەکەی، ماڵ‌و منداڵەکەی نیگەران‌و ناڕەحەت دەکرد. ژنەکەی کە زۆر لەم میتۆدو رێبازەی ژیانی تولستۆی پەست‌و قەڵس بوو ئاهی هەڵدەکێشاو دەیگوت: "دابەشکردنی سەروەت‌و سامانی خۆ بەسەر خەڵکانی ترداو خستنە سواڵی فرزەندانی خۆت، لە کاتێکدا هیچ کەسێکی دی گەوجێتی وا ناکات، ئەوپەڕی شێتییە!" دۆستانی تولستوی کە بۆ دیدەنی ئەو دەهاتن بۆ گوندی یاسنایا کە دەیانبینی جلی دێهاتی لەبەر کردووەو دەگەڵ مسکێنەکانی خۆیدا شۆربای جۆ دەخوات‌و لەگەڵ ئەوەشا دوو پێشخزمەت بە دەستکێشی سپییەوە لە خزمەتی دان، دەکەوتنە گومان‌و حیرەتەوە. خۆشی زۆر لەوە ناڕەحەت‌و نیگەران بوو کە هەمیشە خەڵکی بۆ دەروێشی‌و قەلەندەری‌و ریازەتکێشی هاندەدا،و کەچی بە خۆی درێژەی بە ژیانی ئاسایی خۆی دەدا.

لێ تێپەڕ بوونی رۆژگار هێشتا بە تەواوەتی لە پەلوپۆی نەخستووە. تولستوی هەندێجار دووچاری تورەیی دەبێت، ئاگری شاوەتپەرستیەکەی جارانی بۆ چەند دەمێك دەگەشێتەوە، ئاگاداری شۆرەت‌و شانازی خۆیەتی‌و لە نووسینی نامەکانیشیدا وردو بە پارێزە، بەڵام تەبیعەت دەست بە ئاشناکردنی ئەو بە "لەزەتی راستەقینەو باڵای ژیان، کە بریتیە لە فەرامۆش کردنی نەفسی ئەممارەی خۆی" دەکات. خولیاو خەیاڵ‌و ئایدالەکانی ئەو لەمە بە دواوە ئیدی بریتیە لە رزگار کردنی خۆ لە رێگەی کارێن دەستی، فێرکردن‌و پەروەردەی دێهاتیان، یارمەتیدان‌و ئازادکردنی هەژاران‌و بێنەوایانەوە. خۆی لە ڕای(لە پێناوی) دیکوبەرییەکاندا (دەستەیەك بوون لە شۆڕشگێرانی روسیا) بە ئاوو ئاگردا دەدات، چاوپۆشی لە ماف دانانی نووسینەکانی دەکات،

جل‌و بەرگی گوندیاتی لەبەر دەکات‌و قەعدەکەی بەدەستی خۆی دەڕێژێ‌و پاك دەکاتەوە، چونکە باوەڕی وایە "پیاوێك کە قەعدەی میزەکەی خۆی بە پێشخزمەت پاك بکاتەوە شایستەی ناوی مەسیحی نیە".

لێدەبڕێت دارایی خۆی بەسەر هەژاراندا دابەشبکات. هاوسەرەکەی تووڕە دەبێت‌و لێدەبڕێت مافی هەر تەسەڕوفێکی لەو بابەتەی لێ بسەنێتەوە. ئەنجوومەنی بالاّی کلێسای روسیا تەکفیری دەکات‌و ئیدی بەو تەمەنی پیرییەوە ناچاردەبێت سەری خۆی هەڵگرێت و لە یاسنایا بڕوات.

ئەو بە کۆنتی لە دایك بوو بوو، لێ خودای گەورە ئەوی بۆ ئەوە دروست نەکردبوو "کە مەشخەڵی خەڵکی بێت". وێڕای ئەوەش ئامادە نەبوو لە دووری خەڵکی بژی. لە هەنبەر رەنج‌و بەلاّو مەینەتیەکانی ژیاندا چاوو گوێی خۆی دانەخست، بەڵکو دووبارە لە خۆی پرسی: "دەبێ چ بکرێ؟" بەلاّم تەنیا بە کردنی پرسیارەکە دڵی دانەکەوت، بەڵکو ویستی وەلاّمیشی بداتەوە: کۆمەڵێك فێرگەی بۆ دێهاتیان دروستکرد، بەگژ قات‌و قڕی‌و نەخۆشی‌و پەتایاندا چوو، بە دەستی خۆی زەوی کێلاّ، چاوی لە هەموو ئیمتیازاتەکانی خۆی پۆشی‌و ویستی هەموو داراییەکی خۆی بەسەر نەداراندا دابەشبکات. تولستوی پیاوێکی موقەدەس نەبوو بەلاّم هەوڵیدا خۆی بگەیەنێتە دەرەجەی قودسیەت‌و دەشێت بگوترێ هەموو تەمەنی خۆی بۆ پاککردنەوەی نەفسی خۆی‌و خەڵکی دیکە تەرخان کرد.

## چاوخشانێك بە نامەکانی تولستوی دا
## بە پێنووسی سیلیڤو بیرناردینی

تولستوی جۆرە مازوخیەتێکی دەگەڵ بوو کە ناو بە ناو سەری دەکردو بەرۆکی دەگرت. ئەوەتا لە ساڵی ١٨٦٢دا لە جەرگەی یەکێك لەو حەملە مازۆخیانەیدا،و لە تەمەنی سی‌و چوار ساڵیدا دەنووسێت: "من پیرەمێردێکی گەوجی بێ ددانم". تاقە حەقیقەتی ئەم قسەیە ئەوەیە کە لەو تەمەنەدا گەلێك لە ددانەکانی بە هۆی کرموژن و کرمۆڵبوون‌و کیس کردنەوە کە لە منداڵیەوە دەگەڵیا بوون، کەوتبوون‌و هەڵوەری بوون. تەنانەت چەندین ساڵ لەوە پێشتریش خۆی بە پیرەمێرد ناودەبردو تا کۆتایی تەمەن بەردەوام دەمی لە پیری دەکوتا بێئەوەی هیچکەسێك هۆی ئەم رەشبینییەی بزانێت. ڕاستت گەرەکە تولستوی تا کۆتایی تەمەنی هەرگیز پیر نەبوو. نەك تەنیا لەبەر ئەوەی لە تەمەنی هەفتا ساڵیدا دەستی بە خوێندن‌و زمانی عیبری‌و فێر بوونی پاسکیل سواری کردو لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا لە کێڵگەکانیا کاری کشتوکاڵی دەکردو بە پێیان یان بە سواری ئەسپ سەفەری دەکردو درێژەی بە کاری نووسین دەداو مومارەسەی سێکسی دەکردو نێروی ئەقلاّنی بە دەقی خۆیەوە هەر پڕ بەرەکەت بوو، بەڵکو دەشێت بگوترێت تولستوی لە روویەکەوە تەنانەت لە هەرەتی دەورانی پوختەیی‌و سوود وەرگرتن لە تایبەتمەندییەکانی ئەو

دەورانەش نە یتوانی "نێرۆی هاوئاهەنگی دەورانی خەملین و پوختەیی" کە گۆتە ئامارژەی بۆ ئەمە کردووە، بە دەست بێنێ. بەم مانایەی کە بە پێچەوانەی زۆربەی خەڵکییەوە کە کاتێ دەگەنە قۆناغێکی تایبەتی تەمەن، شانازی بەرابردووی سەرکەوتوو ئامێزی خۆوە دەکەن و لەبەر رۆشنایی ئەزموون و تەجرەبەی بە دەست هاتووی خۆ بە متمانەو ئومێدەوارییەوە دەڕواننە ئاینده، هەرگیز لە خۆی رازی نەبوو، و بە گەشبینییەوە تەمەشای ئایندەی نەکرد.

ئەگەر مەبەست لە دەوران و قۆناغی خەمڵین و پوختەیی، ئەو قۆناغە بێ کە مرۆڤ تیایدا ئەنجامی پراکتیکی زیاترو ئەزموونی باشتر بە دەست دێنێ و حەقیقەتی فرەتر لەم ئەزموونانەوە بە دەست دێنێ، ئەوا سەبارەت بە تولستوی دەشێت بگوترێ رێك پێچەوانەکەی ئەو حاڵەتە دروستەو هاتۆتە دی، وەکو دیارە لە تەمەنی نێوان بیست و پێنج ساڵی و چل ساڵیدا زۆر پوختە تر بووە تا لە تەمەنی چل و پێنج ساڵی و بەسەرەوە. یەکەم لەبەر ئەوەی کە لەو قۆناغەی یەکەمدا بەلای کەمەوە ئیمان و باوەڕێکی بتەوی هەبووە، بەو مانایەی کە تا ڕادەیەك ئیماندارەو ئوسوڵ و هێم و بنەماکانی ئاین رەچاو دەکات و لە رۆژانی جەژنی پاکدا رۆژوو دەگرێت، باوەڕی بە نیشتمان و تزار هەیەو تا رادەیەك کۆمەڵگە بە هاوسەنگ و یەکسان دەزانێ و بۆ خۆیشی چ لە رووی رەگ و ریشەو ئەسڵ و فەسڵەوەو چ لە رووی لیاقەت و شایستەییەوە باوەڕی بە هەندێك ئیمتیازاتی تایبەتی هەیەو بۆ ژیانی خۆیشی هەندێ ئارمانجی دیاریکراوی هەیەو دەیەوێ ژیانی خۆی وەقفی کارو خانەوادەکەی بکات و دوای وەدەستهێنانی کۆمەڵێك سەرکەوتن و سەروەت و سامانی پێویست گۆشەیەك بگرێت و بەرەچاوکردنی کۆمەڵێك قەراردادو ویژدانی پاکەوە بکەوێتە درێژەدان بە کاری نووسەرایەتی خۆی و لەم رێگەیەوە بە پێی زەوق و سەلیقەی خۆی بەهرە لە شادی و بەختەوەری وەربگرێت.

بەڵام لە تەمەنی چل و پێنج ساڵیدا شوێنەواری یەکەمین درز لەم حەسارە بتەوەی کە بە دەوری خۆیدا کێشا بوو، دەردەکەوێت. ئەم درزە سەرەتاییانە لایەنی ئەدەبی، یان بە گوتەیەکی دروستتر لایەنی زمانیان هەیە، بریتین لە ناکۆکی نێوان زمانی چینی ئەرستۆکرات و ئەشراف دەگەڵ زمانی میللی ڕەمەکی خەڵکیدا. تولستۆی لە مانگی ئاداری ۱۸۷۲دا لە نامەیەکیا بۆ (ئاستراخوف)ی دۆستی دەنووسێت: ***"تەنانەت زمانی پوشکین- یشم بەلاوە پەشمەو زمانی جەماوەری خەڵکم بەلاوە پەسندترە. هەر شتێك دیارو روون و سوارو جوان بێ بەلامەوە پەسندو خۆشەویستە، و ئەم خەسڵەتانە تەنیا لە شیعرو زمان و ژیانی عەوام دا دەبینم و لە نێو چینی خۆماندا رێك پێچەوانەی ئەوە دەبینم."*** لێرەوە گوێزانەوەی داوەری ئەدەبیی تۆلستۆی بەرەو داوەری ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی کە لە ماوەی دە ساڵی دواترا، مەنجەڵی تورەیی لە دڵیا دێنێتە کوڵ و جۆش و بۆ خەباتێکی ئاگرینی هاندەدات، دەست پێدەکات. ئەم دە ساڵە دەمانگەیەنێتە ساڵی ۱۸۸۰، و بۆیە لەو نامانەی کە لەم کتێبەدا کۆکراونەتەوەو تا ساڵی ۱۸۷۵ی لە خۆ گرتووە، هیچ بەڵگەو قەواڵەیەکی ئاشکرا لەمەڕ ئەو دە ساڵە بەرچاو ناکەوێت، بەڵام مێژوونووسان ئەو دە ساڵەیان بە (قۆناغی قەیران) یان (وەرچەرخانی هزری)ی تولستوی زانیوە.

لەم ساڵانەدا چ گۆڕانکارییەك لە بیرو باوەڕێن تولستویدا رووی داوە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا

دەشێت بگوترێ کە تولستوی لە جیاتی ئەوەی پایەی بەرزی نووسەرایەتی و ژیانی پڕ خۆشگوزەرانی و ئاسودەیی و ئارامی ئەشرافی و لە زەتەکانی مێردایەتی و باوکایەتیەکی بەختەوەرانە بپارێزێت، سەبارەت بە ئارمانج و مەبەستەکانی خۆی هەست بە گومان و دوو دڵی دەکات و پشت دەکاتە هەموو شتێك. لە کتێبی ئیعترافاتنامەکەی خۆیدا کە لە ساڵی ١٨٧٩-١٨٨٠دا بڵاوبووەوە بەوپەڕی وەستایی و لێهاتوویی باسی ئەوە دەکات چۆن باوەڕە دێرێنەکانی یەك لە دوای یەك هەرەس دێنن و ترس و نیگەرانییەکی گیانپروکێن بەسەر رۆحیدا زاڵ دەبێت. بەڵام لە هەنبەر ئەوەدا لەم قۆناغە تازەیەدا ئاگری ئەشقێکی توند سەبارەت بە ژیان و دەرکی مانای ژیان لە دڵیا هەڵدەگیرسێت کە بەرەو شادییەکی دەروونی و بەختەوەرییەکی تازەی ڕادەماڵێت. ئەم وەرچەرخان و گۆڕانکارییە بە هیچ شێوەیەك بە بۆچوون و نۆڕینی تولستوی مایەی حایرمان و سەرسوڕمان نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆری لە بەرگرانە کە خەڵکانی میناکی ئەو هەموو کاتی خۆیان بۆ ئەوە تەرخان کردووە خۆ لە مەرگ بدزنەوەو رۆژگاریان وەکو مێرووانی تۆقیو لە ترس و لەرزدا بەسەر دەبەن.

بەڕای ئێمەی خوێنەران، کە نامەکانی ئەو لە سەرەتاوە تا کاتی نووسینی کتێبی (شەڕو ئاشتی) کە تۆماس مان بە ***(جوانترین رۆمانی جیهان)ی*** داناوە، دەخوێنینەوە، وامان دێتە بەرچاو کە بەلای کەمەوە بە تێپەڕبوونی زەمان جۆرە گەشەکردنێك لە شێوەو تەرزی گوزارشت و دەربڕینی هزرو خەملانی هونەری نووسەرایەتی تولستوی دا هاتووەتە دی، لێ تولستوی بە خۆی نکۆڵی لەم گەشەکردن و خەملینە دەکات و بە چاوی نەفرەت و بێزارییەوە دەڕوانێتە هەموو شاکارەکانی خۆی. لەلایەکی ترەوە دەربارەی کتێبی شادمانی خانەوادەیی دەڵێت: "هەست بە شەرمەزاری دەکەم کە ئەو کتێبەم نووسیوە." سەبارەت بە (ئاناکارنینا) دەڵێت: "لە ڕادەبەدەر بێزارم دەکات" "کەچی سەبارەت بە کتێبی ئەلفبا کە بە تایبەتی بۆ منداڵە گوندییانی نووسیوەو چەندین ساڵی تەمەنی خۆی بۆ تەرخان کردبوو، و ئەوپەڕی توانای خۆی تیا بەکار بردبوو، و چەندین جار دەسکاری کردبوو، بابەتەکانی گۆڕی بوو، دەربارەی ئەو کتێبە بۆ ئالکساندرای پوری نووسیوەو دەڵێت: "بۆ ئەم کتێبە لە هەر هەموو کارەکانی دیکەم پتر خۆم ماندوو کردووەو بە ئەشقەوە مامەڵەم لە تەکدا کردووەو دەزانم کە ئەم کتێبە تاقە کاری گرینگی ژیانی منە". لە کتێبی ئەلفبادا شێوازە نووسینێکی یەجگار سادەو میللیانەی، تایبەت بە دێهاتیان، بەکار دەبات و لە جاران پتر باوەڕ بەوە دێنێ کە ئەدەبیات دەبێ لە خزمەتی گەلدا بێت.

لەبەر ئەمە تەنانەت بە چاوی نەفرەتەوە روانیویەتی (شەڕو ئاشتی)- ش کە بە بۆچوونی هەموو ئەدەبناسان یەکێکە لە مەزنترین شاکارێن چیرۆکڤانی جیهان، ئەوەتا لە نامەیەکدا بۆ ئەلکساندرای پوری، بە ئەرخایەنیەوە دەڵێت: ***"ئێستا سەبارەت بە شەڕو ئاشتی- ش هەست بەبێزاری دەکەم وکە دەیخوێنمەوەو چاوی پێدا دەخشێنمەوە دەرهەق بە هەندێ بەشی، هەست بەشەرمەزارییەکی ئەو تۆ دەکەم کە ناتوانم بۆتی وەسف بکەم، لەوەیە بشێت ئەم هەستە بە هەستی پیاوێك بەراورد بکرێ کە لە مەینۆشییەکی حەیابەرەدا بەشداری کرد بێت و دوای وەهۆش هاتنەوە پەی بە ئاقیبەتی نەنگینی ئەو مەینۆشییە ببات."*** بۆچی تولستوی لە پڕێکا

نووسـینی شـەڕو ئاشـتی بـە بەشـداری لـە مەینۆشـییەکی نەنگینـدا دەشـوبهێنێ؟ چـونکە پـاش نووسـینی ئـەم ڕۆمانـە مەزنـە وەرچـەرخانێك لـە هـزرو هەسـتێن ئـەودا هاتووەتـە دی. تولسـتوی شەڕو ئاشتی لە قۆناغێکی تایبەتی تەمەنی خۆیدا نووسیوە، جا بۆ دەرککردنی گۆڕانی باوەڕی وی دەربارەی ئەم ڕۆمانە دەبێ بچینەوە سەر بەشێك لە بیۆگرافی ئەو، لە ساڵی ١٨٦٢دا پاش بیست ساڵ ژیانی پڕ لە پەریشانیو جەنجاڵو دوودڵی بەردەوام لە نێوان هەڵبژاردنی لەزەتێن دەروونی یان بەدەنی، زۆر بە خەستی عاشقی سوفیابیرس دەبێتو زەماوەندی دەگەڵ دەکات. زاوا تەمەنی لە سیو چوار ساڵیدایەو وەك دەزانین خۆی بە پیر دەزانێ لە کاتێکا بووکێ تازە هەژدە ساڵی تێ پەڕاندووە. تولستوی لەبەر ڕۆشنایی ئەم هاوسەرگیریەدا ئاسوودەیی دەروونیو بەدەنی بەدەست دێنێ. ژنەکەی زوو زوو حامیلە دەبێتو سیازدە منداڵی دەبێت کە ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوەیە تولستوی هەر وزەیەکی شەهوانی خۆی لە دنیای دەرەوە دابڕیوەو بۆ خێزانەکەی خۆیی تەرخان کردووە. بە چەند مانگێك پاش زەماوەندەکەی بۆ پورە ئەلکساندرا دەنووسێت:

"لەعەمراتی خۆما هەرگیز هەستم بەوە نەکردووە کە نیرۆی زەینیو ئەقڵانیم بەم ڕادەیە ئامادەی چالاکیو کاربێ هەروەها دەستم بە نووسینی چیرۆکی شەڕو ئاشتی کردووە، و زۆری پێوە مژولم". هەر لە هەمان نامەدا ئەوە دەردەبڕێت کە باوەڕی خۆی لەمەڕ جەماوەرو کۆمەڵگە بە تەواوەتی گۆڕیوە: "هەڵبەتە هێشتاش پەیوەندیم دەگەڵ خەڵکیدا هەیە لێ پێم سەیرە چۆن ئەوەندەم خۆش ویستوون؟ ئێستا تەنیا مێردو باوکی خانەوادەیەکی بەختەوەرم کە ئومێدەوارە درێژە بە هەمان ڕەوش بدات."

لێ باوەڕی تولستوی دەربارەی ژنان وەکو لە نامەکانیا دەبینرێ لە هەموو ڕوویەکەوە شایستەی شیکردنەوەو وردکردنەوەیە. لە نامەیەکی ١٨٦٣/٣/٢٣دا ئەو خەونە سەیرو غەریبەی خۆی کە بە چاوانی کراوەوە دیتویەتی بۆ "تاتیانا بیرس"ی ژن خوشکی شەرحو شرۆڤە دەکات: "لە پڕێکا سەیری کردووە کە هاوسەرەکەی گۆڕاوە، و بووە بە بوکەڵەیەکی چینی "نەرمو خۆشو سارد". تەنیا سکی زندوو ولە شێوەی قوچەك دابووە" کە سەرەکەی روو لە سەرەوە بوو. تولستوی پاش شەرحی خەوەکەی بەمجۆرە لەسەری دەڕوات "بەو پەڕی ڕاشکاوی ئیعتراف دەکەم هەرچەندە قسەکانم سەیر دەنوێنن، خۆشحاڵمو هەرچەندە کە ئەو لە چینی دروستکراوە هەست بە بەختەوەری دەکەم." ئەم نامەیەی تولستوی لە هەر ڕوویەکەوە بیگری بۆ نیشاندانی نۆڕینی ئەو دەرهەق بە ژنان پەسندو بەجێیە. تولستوی ژن بە بابەتی پاراوکردنی مەیلی پیاوو زاوزێو خستنەوەی منداڵ دەزانێ. شوبهاندنی سکی سوفیا بە قووچەك ئاماژەیە بۆ حامیلە بوونی، چونکە سۆڤیا لەو بە روارەدا حامیلە بوو. هەروەها، بڕینی نامەو نامەکاری تولستوی دەگەڵ ڤالیریا ئارسینیڤادا کە لە زگ (نزیك) بوو زەماوەندی دەگەڵدا بکات، لەم بارەیەوە زۆر پڕ مانایە. نامەکانی تولستوی بۆ ئارسنیڤیا هەمیشە پڕبوون لە پەندو ئامۆژگاری. بەردەوام داوای لێدەکرد کە "دەبێ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ باشتر بێ"و "لە ژیاندا چاکە بخاتە سەرووی هەر ئامانجێکی دیکەوە، کەچی غیرەو حەسودی دەگەیاندە ڕادەی شێتایەتی. لەسەر ئەشقێکی ئەفلاتونی بێگەرد

لە نێوان ئارسینیڤیاو مۆزیکزانێکا بە نێوی مۆرتیر–mortier هێندەی ئەو ماشوقە جوانە ئەزیەت دا کە سەرەنجام لێکدی دوورکەوتنەوە.

چل ساڵ لەوە دوا، و لە ساڵی ١٨٩٨دا لەسەر دەربڕینی مەحەبەتێك لەلایەن سونیاوە بۆ تانیف ی موزیکزانی بە ناوبانگ، هەمان غیرەو حەسودی دووبارە دەکاتەوە، بەڵام ئەوەی سەیرە، ویڕای ئەم بەدگومانیەی لە ژن و لە جەوهەری ژن، نزیکترین و دڵسۆزترین رازدارانی تولستوی بە درێژایی تەمەنی، ژنان بوون. یەکەم پورەکانی و پاشان تاتیانا و ماریا و ئالکساندریا و...هتد.

ئەوەی لە نامەکانی تولستوی دا مایەی سەرسامیە، کەمی بایەخدانە بە ڕووداوو بویەرو پێداویستیە سیاسیەکان، لە کاتێکا ساڵانی دەوروبەری ١٨٦٠ پڕ بویەرترین قۆناغێن مێژووی روسیایە. لە ساڵی ١٨٥٤دا جەنگی روسیا بۆ دووەمجار لە دوای شەڕەکانی ناپلیۆن، روسیای لە ئەوروپا نزیك کردەوە. لە ساڵی ١٨٥٥ دەگەڵ مردنی ئیمپراتۆری ستەمکار نیکۆلای یەکەم و هاتنە سەر تەختی ئالکساندری دووەم قۆناغێکی هەستیار لە مێژووی روسیا دەستی پێکردو ئەم وڵاتە پان و بەرینە دوای سەدان ساڵ لە گۆشەگیری و دوورە پەرێزی میناکی حەیوانێك کە لە قەفەز هاتبێتە دەرێ دەستی بەجم و جۆڵ و پەرەسەندن کرد. لە ساڵی ١٨٦١دا دەرچوونی قەراری ئازادی کۆیلەێن زەوی کۆتایی بە مێژووی دەسەڵاتی خان خانەکێی روسیا هێنا و بوو بە هەوێنی دەستپێکی سەردەمی روسیای تازە. ئەم بویەرە مێژوویانە هاوزەمان بوون دەگەڵ چالاکیەکی گەرم و گوڕو جدی سیاسی و کەلتوری. بەڵام تولستوی لە هەنبەر ئەم بویەرانەدا. بێدەنگ دادەنیشێت و گەمە سیاسیەکان بە هیچ جۆرێ نای بزوێنن، بەڵام ویڕای هەموو ئەمەش ناشێت، تولستوی وەکو توماس مان بە نووسەرێکی ناسیاسی بزانرێ، چونکە لە کاتێکا کە تۆماس مان دوورەپەرێزی لە کاروباری سیاسی گەیاندبووە ڕادەی کۆنە پەرستی، تولستوی دەقاودەق رێگەیەکی پێچەوانەی گرتەبەر، واتا بە ئاراستەی شۆڕش و تەنانەت ئاژاوەگەریدا دەڕۆیی. ئەوەی کە هەمیشە مایەی ناڕەحەتی و بێزاری ئەو بوو، دەستەبەندییە سیاسی و حیزبیەکان بوو. ویڕای ئەمەش دەبێ دان بەوەدا بنرێت کە تولستوی بەزەبری بەرهەم و هزرو بیرەکانی خۆی رۆڵێکی ناڕاستەوخۆو گرینگی لە مەیدانی سیاسەتیشدا گێڕاوە.

## شانازی سوپایی و شۆرەتی ئەدەبی

١٨٤٥- ١٨٥٥

**تولستوی له تەمەنی ٢٣ ساڵیدا ئەم نامە پڕ لە سۆزو گودازو ڕێزو خۆشەویستییەی خوارەوەی بۆ پوری نووسی بوو، پوری گلەیی لە ژیانی دژواری خۆی کردبوو، و لە خودا پاڕابووەوە کە کۆتایی بە تەمەنی ناڕەحەتی بێنێ. تولستوی لە رادەبەدەر هۆگری پورە "ئێرگولسکایا"ی بوو،و گەلێك لە نامەکانی بۆ ئەو نووسراون.**

## بۆ ت. ئا. ئێرگولسکایا
## تەفلیس ١٨٥٢/١/٦

**نامەکەی رۆژی ٢٤/ نۆڤبەر/ی تۆم پێگەیی،و ئەوەتا وەکو هەمیشە بێ هیچ دواخستنێ وەڵامی دەدەمەوە. لەو دواییانەدا بۆم نووسی بوویت کە دوا نامەت رونـدکی(فرمێسك) لە چاوانم هێنـا و هۆی ئەم لاوازیەم دابووە پاڵ بێتاقەتی و نەخۆشیەکەم. لێ ئێستا بۆم دەرکەوتووە کە هەڵە بوومو ئەو بۆچوونەم راست نەبووە. چونکە هەموو نامەکانت هەمان کارم تێدەکەن. رونـدك هـەموو کـاتێ بە ئاسانی لە چاوانم دێنە خوارێ. جاران شەرمم لەم بێ توانایییەی خۆم دەکرد، بـەڵام ئـەو دڵۆپـە روندکانەی کە بەدەم بیرکردنەوە لە تۆو لە مەحەبەت و خۆشەویستی تۆ، لـە چاوانم دێنـە خـوارێ ئەوەندە شیرین و خۆشن کە بێ هیچ هەستێکی کێماسی و بێ هیچ جۆرە شەرمەزارییەك، رێگـەیان دەدەم بێنـە خـوارێ. نامەکـەت هێنـدە خەمناکـە کـە مەحاڵـە ئـەو کـارەم تێنـەکات. هەمیشـە تـۆ ئامۆژگـاری منـت کـردووە، و هەرچـەندە لەوەیـە زۆر جـار بـەگوێم نـەکردبیت، بـەڵام حەزدەکـەم بـە درێژایی تەمەنی خۆم بە گوێرەی دەسـتوورو فەرمانـەکانی تـۆ کاربکـەم. جا ئێسـتا رێگـەم بـدە بـا باسـی ئـەو کاریگـەرییـە بکـەم کـە نامەکـەت پێـی بەخشـیوم، باسـی ئـەو بیرانـە بکـەم کـە پـاش خوێندنەوەی نامەکەت لە زەینمدا رێشاژۆ بووە. ئەگەر جارجار هەندێ بەکراوەیی قسەت دەگەڵدا دەکـەم، لەبـەر ئەوەیـە کـە دڵنیـام لـە رووی خۆشەویسـتییەوە بـۆ مـن، دەمبوریـت. کـاتێ کـە دەنووسیت: ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئێمە بە جێ بێڵی و پەیوەندی بەو ئازیزانەوە بکەیت کە زۆرت خۆش دەویستن و ئیدی هیچ بوونێکی دەرەکیان نیە، کـاتێ دەڵێیت داوات لـە خـوا ئەوەیـە کۆتایی بە تەمەنی پڕ مەشەقەت و خەمناکت بێنێ، پورێ گیان بە داوای بوردنـەوە دەبـێ بڵێم کە بەو داوایەت غەدرت لە زاتی خوایی و من و هەموو ئەوانەی کە دڵمان پڕە لە سۆزو مەحەبـەتی تـۆ، کردووە. ئەوە ناشوکرییە. تۆ داوای مەرگ لە خوا دەکەیت، دەکاتە گـەورەترین کارەسـات بۆ مـن، یـانی گـەورەترین کارەسـات بەسـەر منـدا بێـت. (نـەبێت بـە رووبینی و ڕیایی، خـودا شـایەدە دوو کارەساتی گەورە کە لەگینە بەسەر مندا بێن، یەکێکیان مردنـی تـۆو ئـەویتریان مردنـی نیکولاییـە، واتە مـەرگی دوو بەشـەرە کـە لـە خـۆمم خۆشـتر دەوێـن.) هـەرکاتێ خـودا دوعاکـەی تـۆ گیـرا بکـات**

ئیدی چی بۆ من دەمێنێتەوە؟ ئیدی لەبەر دڵخۆشیو شادی کێ باشتر ببم، سیفەتێن چاکی بە دەست بێنمو لەم دنیایەدا ببمە خودانی ناوی باش؟ هەرجارێ کە نەخشەیەك بۆ دابینکردنی بەختەوەری خۆم دەڕێژم هەمیشە ئەم بیرەم لە خەیاڵدایە کە ئێوە شەریکی بەختەوەری منو لەزەت لە شادی من وەردەگرن. کاتێ کە کارێکی باش دەکەم هەست بە شادمانی دەکەم، چونکە دەزانم کە ئێوە شاد دەبن. بە پێچەوانەوە کاتێ کە کارێکی خراپ دەکەم، ترسی گەورەم لەوەیە نەبادا ئێوەم ئەزیەت دابێ، ئازاری روحم دابن. هەر هەموو میهرو مەحبەتێکی ئێوە بۆ منەو کەچی ئێستا لە خوا دەپارێنەوە کە لێکدیمان جیا بکاتەوە؟ ناتوانم هەستی خۆم سەبارەت بە ئێوە دەربڕم، وشەو پەیڤ بەشی دەربڕینی هەستو سۆز ناکات. دەترسم وا وێنا بکەی فشە دەکەم ئەگەر بڵێم ئێستا لە کاتی نووسینی ئەم چەند دێڕەدا خوڕ خوڕ فرمێسکی گەرم بە چاوانمدا دێتە خوارێ. کە بیر لەم جیابوونەوە کوشندەیە دەکەمەوە، ئەوجا دەزانم ئێوەم چەند خۆش گەرەکەو ئێوە چ دۆستێکی گرانقەدرن بۆ من.

بەڵام ئاخۆ هەر من بە تەنیا ئەم هەستە لە هەنبەر داوای مەرگی ئێوە لە خودا، دەردەبڕم؟ ڕەنگە بڵێن ئەمە زادەی تەنیاییە، لەبەر ئەوەیە تەنیای، هەرچەندە من لە ئێوەوە دوورم بەڵام هەمیشە متمانەو باوەڕتان بە خۆشەویستی من هەبێت،و ئەم متمانەو باوەڕە خەمی دڵتان دەڕەوێنێتەوە. من تا باوەڕو متمانەم بە خۆشەویستی ئێوە دەرهەق بەخۆم هەبێت – وەکو چۆن هەمیشە ئەو باوەڕەم هەیە – لە هیچ شوێنێکی دنیادا هەست بە تەنیایی خۆم ناکەم.

وێڕای ئەمەش وا هەستدەکەم کە سۆزێکی ناپەسەند ناچارم دەکات ئەم قسانە بکەم. یانی بەغیلی بە خەم و ئازاری ئێوە دەبەم. ئەمرۆ  واریقاتێکم هاتە ڕێ، ئەگەر پێشتر جارجارێ باوەڕم بەخودا نەبووبێ، ئەوا ئەم پێشهات و واریقاتەی ئەمرۆ بێ چەندوچوون ناچاری کردم باوەڕو ئیمان بێنم.

هاوینی ڕابردوو هەموو ئەو ئەفسەرانەی کە لە (ستارژی ژورت ) ئۆردوبەزیان کردبوو، هیچ ئیش و کارێکیان نەبوو خۆیانی پێوە مژول بکەن جگە لەوەی سەر بکەنە قوماری قورس. چونکە دوورە پەرێزی لەوان، لەو ئۆردوگایەدا، زۆر زەحمەت بوو. من هەندێجار دەچوومە تەمەشای یاریەکەیانو سەرباری ئەوەی دۆستەکانم زۆریان دەکرد کە بەشداری یاریەکەیان بکەم، زۆر پیاوانە یەك هەیڤی خشت بەرگریم کرد، لێ ئەنجام رۆژێك هەر بۆ خۆشی بڕێ پارەی کەمم داناو دۆڕاندم.جارێکی دیکە یاریم کردەوەو دیسان دۆڕام. بەخت و شانس لێم چوو بوو بەقینا. حەزی یاریم بێدار بوو بووەوە. ئەنجام لە ماوەی دوو رۆژدا هەر پارەیەکم پێ بوو دۆڕاندم، بەو پارەیەشەوە کە نیکۆلای بۆی ناردبووم – نزیکەی دوو سەدو پەنجا رۆبڵی زیوو بوو– جارێکی دیکەش یاریم کردو پێنج سەد رۆبڵی دیکەشم بەبادا دا، چونکە پارەم پێ نەبوو، سفتەیەکم بە وەعدەی مانگی یەکی ١٨٥٢ ئیمزا کرد. لە نزیکی ئۆردوگاکە، باژێروکێك هەیە کە هەموو خەڵکەکەی سەر بەتیرەیەکن بە نێوی چیچینۆ. کورێکی گەنجی خەڵکی ئەم باژێروکە بە نێوی سادۆ دەهات و هەندێجار بەشداری قوماری دەکرد، لێ چونکە نە سیواتی (خوێنەواری) هەبوو و نە حیسابی دەزانی ئەفسەرەکان فریویان دەداو، بۆیە من هەرگیز نەمدەویست یاری دەگەڵ بکەم

و تەنانەت جارێك پێم گوت نابێ یاری بكات چونكە كڵاوی لەسەر دەدەن،و سەرەنجام بڕیارم دا لە جیاتی ئەو یاری بكەم. یاریم كردو بردمەوە. زۆر سوپاسی كردم و جزدانێكی بەدیاری دامێ،چونكە داب و نەریتی ئەم تیرەیە وایە كە دیاریان ئاڵوگۆڕ بكەن، منیش تفەنگێكی چكۆڵەم، كە بە حەوت رۆبڵم كڕی بوو، پێشكەش كرد، جا شەرتی دۆستایەتی راستەقینەو گیانی بەگیانی ئەوەیە كە یەكەمجار دیاری بگۆڕیتەوەو پاشان بۆ فراڤین یان شێو ببیە میوان. هەنگی بە گوێرەی داب و نەریتی كۆنی ئەم تیرەیە – كەخەریكە بەرە بەرە لە ناودەچێت– تا كۆتایی تەمەن دەبێت بە كوناك (واتە دۆستی گیانی بەگیانی) ئەو كەسە، بەڕادەیەك هەركاتێ بۆ نموونە من هەموو دارایی یان ژن یان چەك یان هەموو جەواهێراتەكەی ئەو داوا بكەم دەبێ بێ چەندوچون بمداتێ، ومنیش بەهان شێوە هەرچیەكی لێ ویستم نابێ درێغی بكەم و نەیدەمێ. سادۆ بۆ ماڵی خۆی دەعوەت كردم تا بمكات بە كوناكی خۆی. دەعوەتەكەیم قەبوڵ كرد، پاش ئەوەی بە گوێرەی داب و نەریتی تیرەكەی خۆی پێشوازییەكی شایستەی كردم، داوای لێكردم. لە ماڵەكەدا، هەر شتێك لە چەك و ئەسپ و شتی تر هەڵبژێرم و بۆ خۆم هەڵیگرم. هەوڵمدا كەم بەهاترین شت هەڵبژێرم ، بۆیە هەوسارێكی زیوی كەندەكاریم (بەنەخش ونیگار) هەڵگرت، بەڵام گوتی ئەمە جنێوە بۆ ئەو، ئیدی ناچاری كردم خەنجەرێك كە بەلای كەمەوە بایی سەد رۆبڵی زیو دەبوو هەڵگرم. بابی پیاوێكی دەڵەمەندە، لێ پارەكەی لە ژێر عەردا دەشارێتەوە و تاقە پۆلێك بە كوڕەكەی ڕەوا نابینێ. ئیدی كوڕەش بۆ وەدەستهێنان و پەیدا كردنی پارە دەكەوێتە دزینی ئەسپ و گاوگۆتاڵی تیرە نەیارەكانی خۆیان و هەندێجار بۆ دزینی شتێك كە دە رۆبڵ نایەنێ بیست جار گیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە. وێڕای ئەمەش لەبەر ئاتاجی و چاوچنۆكی و تەماعكاری نیە كە دەست دەداتە دزی. بەڵكو زیاتر هەستی خۆنوێنی و شانازی بۆ ئەم هونەر نوێنییەی هاندەدا، چونكە لە نێو تیرەكەی ئەواندا هەر كەسێك زیاتر دزی بكات بەقەدرتر و بەڕێزترە و بە عەگیدی دەزانن.تا دزێكی لە زەبرتر بی بە قەدرتری. سادۆ جارێ وا هەیە هەزار رۆبڵی لە بەركدایەو جاری واش هەیە عەشتەبای پێ نیە. دوای ئەوەی چوومە ماڵی، سەعاتە زیوەكەی (نیكولایی)م پێشكەش كرد و ئیدی لەوە بەدواوە بووین بەیەك گیان لە دوو جەستەدا. زۆرجار بۆ سەلماندنی وەفاداری خۆی سەبارەت بە من، گیانی خۆی خستووەتە مەترسییەوە. ئیدی ئەم جۆرە كارانە لەلای ئەم خەڵكە شیرپاكە وەكو ئاو خواردنەوەی لێهاتووە، كاتێ كە (ستارژی ژورت)م بەجێ هێشت و (نیكولای)م بە تەنیا لەوێندەر بەجێ هێشت، سادۆ هەموو رۆژێ دەچووە سەردانی و دەیگوت كە غەریبی مندا دەكات و دنیای لێ تەنگ بووەو هەست بە تەنیایی دەكات. لە نامەیەكدا بۆ (نیكولایی)م نووسی كە ئەسپەكەم نەخۆش كەوتووە،و داوام لێكرد بەڵكو لە (ستار ژی ژورت) ئەسپێكی ترم بۆ پەیدابكات. كە سادۆ بەمەی زانی بوو بە هەر نرخێ بووە خۆی گەیاندمێ و ئەسپەكەی خۆی پێشكەش كردمو چەندم كردو كۆشا ئەسپەكەی لێوەرنەگرم، فایدەی نەبوو،و نەبوو. دوای چەند هەڵەیەك كە لە (ستارژی ژورت) بە هۆی قومارەوە كردم ئیدی دەستم بۆ وەرەق نەبردو لە هەمان كاتیشدا هەوڵم دا بەقسەی خۆش و لە ڕێگەی خۆشەویستییەوە سادۆش كە سەرباری ئەوەی كە یاری نەدەزانی، یەجگار شەیدای

قومـار بـوو، و بـەختێکی زۆر باشـی هـەبوو، لـە قومـار دووربخەمـەوە. دوێنـێ شـەو حیسـاب و کیتابێکی پارەو قەرزەکانی خۆم و چۆنیەتی پاککردنەوەیانم کرد.

دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر گەییمە ئەم ئەنجامگیرییەی کە ئەگەر دەست بڵاوی نەکەم سەبارەت بە دانەوەی قـەرزەکانم دوچاری کێشـەی زۆر نـابم، دەتـوانم بـەرە بـەرە هـەموو قـەرزەکانم لـە زەرفی دوو یـان سـێ سـاڵدا بـە تـەواوەتی بدەمـەوە. بـەڵام ئـەوەی زۆر کوڵـەواری کردبووم و کوڵـەی کوتـا بووم، پێنج سـەد رۆبڵـی قـەرزی ئـەم مانگـە بـوو. دانـەوەی ئـەم قـەرزەم لێ بـوو بـوو بـە کـوڵی شـێر، دەمگوت مەحاڵە بتـوانم بیدەمـەوە، بۆیـە ئـەم پـارە کەمـە، زۆر زیـاتر لـە و چـوار هـەزار رۆبڵـەی کـە پێشـتر قـەرزاری ئوگـاروف بـووم، نیگـەران و پەریشـانی کـرد بـووم. گـەوجێتی هـاتنم بـۆ ئێـرەو زیادکردنی برە قەرزێکی دی بۆ سەر قـەرزەکانی پێشـووم دڵیـان پـڕ لـە خـەم و پەژارەیـەکی قـورس کردبـووم. شـەوێ، بـەدەم نوێـژەوە لـە نـاخی دڵـەوە لـە خـوای بـەرزو بـاڵا پاڕامـەوە کـە بـە هـەر شێوەیەك بووە لـەم ڕەوشـە نالـەبارەم رزگاربکـات. کاتـێ کـە چووومـە نـاو جێگـەی خـەوەوە لـە دڵـی خۆمـدا بیرم دەکردەوە: "چ خاکێ بـە سـەری خۆمـدا بکـەم؟ هـیچ ڕێگایـەکم بـۆ پاککردنـەوەی ئـەم قـەرزە شـك نـەدەبرد ". هـەموو ئاقیبـەت و ئەنجامـە نالـەبارەکانی وەعـد نەبردنەسـەرەکەم لـەزەین و هزرم دا شەپۆلی دەداو بەخۆم دەگوت بێگومان بۆ دادگا ڕادەکێشرێم و خۆ ئەگەر خۆم لە دانـەوەی قەرزەکەم بدزمەوە، تاقیب دەکرێم و چی و چی... ئەنجام لـەبن لێوانـەوە گـوتم: "ئـەی خـوای مـەزن یارمەتیم بدە!" ئەوسا لێی خەوتم.

ئـەمڕۆ، بەرەبـەیان نامەیـەکم لـە(نیکـولایی)یـەوە پـێ گەییشـت کـە دەگـەڵ نامەکـەی تـۆو چـەند نامەیـەکی تـردا بـۆم هـاتبوو. لـە نامەکەیـدا نووسـی بـووی: "سـادۆ چـەند رۆژێـك لەمـەپێش هاتـە دیدەنیم، سادۆ لەسەر هەردوو سفتەکەی تۆ دەگەڵ "نورینـگ"دا یـاری کردبـوو، و هـەردووکی لـێ بردبرووەوەو سفتەکانی بۆ من هێنا بوو. لە خۆشیا لـە پێسـتی خـۆی نـەدەهێوری و چـەندین جـار لێی دووبارە کردمەوە: "ئاخۆ برایەکەت بەم کارەی من خۆشحاڵ دەبێت؟" نازانی چەندم چووەتە دڵەوە. ئەم پیاوە بەڕاستی فیدایی تۆیە.

ئایـا پێـت سـەیر نیـە کـە دوعایەکـەم هـەمان بەرەبـەیان گیرابێـت؟ دەمـەوێ بڵـێم هـیچ شـتێك لـەم عینایەتـە خواییـە سـەبارەت بـە پیـاوێکی وەکـو مـن سـەیرتر نییـە. ئایـا ئـەم ئەمەکدارییـەی سـادۆ شایەنی ستایش نیە؟ دەزانم سیرجی برام زۆری حەز لە ئەسپە، بۆیە قـەولم دابویـە لـە گەڕانـەوەدا ئەسپێکی بۆ بەرم.

هەرکـە سـادو بـەم نیـازەی زانـیم، پێـی داگـرت کـە جـوانترین و باشـترین ئەسـپی ئـەم ناوچـە کوێستانیە دەدزێت و بۆمی دێنێ، ئەگەر لە پێناوی ئەم نیازەی مندا جارێك نا، سەدجار گیـانی خۆی بخاتە مەترسییەوە.

تکا دەکەم لـە (تـولا)دا دەمانچـەیەکی شـەش تـیرو سـەعاتێکی زەنگدارم کـە زۆر گـران نـەبێت بـۆ بکڕەو بۆمی بنێرە. سادۆ حەزی لەم جۆرە شتانەیە.

هێشتا هەر لە تەفلیس ئاکنجیم و چاوەڕوانی حەللالی موشکیلات، یانی پارەم. خودا حافیز.

پورێ گیان! لیڤ هەزار جار دەستەکانت ماچ دەکەم..*

***پەراوێز***

****- ئەم نامەیە بە فەڕەنسی نووسراوە.***

## بۆ ت. ئا. ئیرگولسکایا

## مزدۆك، ١٨٥٢/١/١٢

**پوری ئازیزم**

**هەوڵدەدەم ئەو بیرانەی بە مێشکمدا هاتوون بۆتیان بگێڕمەوە چونکە بەردەوام لە بیری تۆدا بووم. هەستدەکەم لە رووی روحیو دەروونیەوە گۆڕاوم. تا نهو(ئیستا) چەندین جار ئەم گۆڕانە لە مندا ڕووی داوە. هەروەها وا وێنادەکەم کە چارەنووسی هەموو ئەندامانی تیرەی بەشەر هەمان شتەو بەشەر چەندیش بژی گۆڕانو وەرچەرخانەکانی تەنیا لە جوزئیاتەکانیدایە. تۆ کە ئەزموونت لە من پترە، بە ئەرك نەبێت پێم بفەرموو ئاخۆ ئەم بۆچوونەم دروستە یان نا؟ وا تەسەور دەکەم ئەو سیفەتو کێماسیانەی کە هێمو بناغەی کەسایەتی هەر تاکێك پێك دێنن هەمیشە وەکو خۆیان دەمێننەوە بەڵام چۆنیەتی دەرکی ژیانو شادمانی بە گوێرەی تەمەنی بەشەر دەگۆڕێت. ساڵێك لەمە پێش من شادمانیم لە لەزەتخوازیو جمو جوڵو رابواردنو گەمەدا دەبینی، کەچی ئەمڕۆکە بە پێچەوانەوە عەوداڵی ئیسراحەتو ئاسودەییم، ئیدی ئیسراحەتو ئارامی بەدەنی بێ یان روحیو دەروونی، بەڵام ئەم ئاسوودەییو ئارامییە بە بۆچوونی من ئاسوودەییەکە دوور لە هەر جۆرە بێزاریو ناخۆشیەك، پڕە لە لەزەتی دۆستایەتیو مەحەبەت. کە من بە لوتکەی بەختەوەریی دەزانم. ئەمە جگە لەوەی وەجدو نەشئەی ئاسوودەیو ئارامی تەنیا دوای ماندوویەتی،و لەزەتی ڤیانو مەحەبەت تەنیا دوای مەحرومیەتو جودایی هەست پێدەکرێت. من ماوەیەکە لە هەردووکیان مەحرومو بێ بەشم بۆیە بەم ڕادەیە تینوی فەیزی دیداری تۆم. هێشتا پێویستە ماوەیەکی تریش تامی مەحرومیەت وەکو پێویست بچێژم. تاکەی؟ خودا بۆ خۆی دەزانێ. ناتوانم کاتەکەی دیاری بکەم، لێ هەستدەکەم کە ئەم حیرمانە پێویستە.**

**ئەو ئەنجامگیرییەی لە موتاڵاو خوێندنەوە مەزەبیو ئەزموونەکانمەوە پێی گەییوم — هەرچەندە ناچیزو کەمە — فێریان کردووم کە ژیان خەباتە، لێ بۆ من جگە لەوەی خەباتە لە هەمان کاتیشدا**

بریتییە لە کەفارەدانی هەڵەو خزینەکانی ڕابردووم. وا تەسەوردەکەم کە کەڵکەڵەی سەفەرم بۆ قەفقاز ئیلهامێکی ئاسمانی بوو. دەستی خودا بوو کە ڕێنوێنی کردم، بۆیە تا ماوم شوکرانە بژێری ئەو دەبم. هەستدەکەم باشتر بووم – هەڵبەتە ئەمە زۆر گرینگ نیە، چونکە لە رادەبەدەر خراپ بووم– زۆر دڵنیام هەر پێشهاتێکم لێرەدا بێتە ڕێ بە قازانجی منە، چونکە خودا وای ویستووە. ڕەنگە ئەم بۆچوونەی من جۆرە توندڕەوییەکی تێدابێ، بەڵام بە هەرحاڵ باوەڕم پێیەتی و بۆیە ئەو کێشەو مەحرومیەت و جودایانەی ئاماژەم کردنێ – هەڵبەتە بۆ گەنجێکی بیست و سێ ساڵەی تۆکمەو بتەوو بەهێز ئەم مەحرومیەتانە کاریگەری بەدەنیان نیە – بەبێ هەستکردن بە ئازارو ناڕەحەتی، بگرە بە جۆرە لەزەتێکیشەوە تەحەمولی دەکەم. چونکە لە بیری شادمانیەکدام کە دڵم روناك دەکاتەوە. ئێستاش دیمەن و ئاسۆی ئەم بەختەوەری و شادمانیەت بۆ وێنە دەکێشم: وام دێتە بەرچاو دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێکی نادیار لە تەمەنم، کاتێ کە نە گەنجم و نە پیر، لە یاسنایا هەوارم خستووەو وەزع و حاڵم بە دڵی خۆمە. هیچ دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەکم نیەو چاوەڕوانی بویەرو ڕووداێن چاوەڕوان نەکراو نیم. تۆش ماڵت لە (یاسنایا)یە. تۆزێك پیر بوویت، لێ هێشتا چالاك و گورج و گۆڵ و ساغ و سەلامەتی. درێژە بە ژیانی جارانی خۆمان دەدەین، من هەموو سپێدەیەك کاردەکەم، بەڵام تەقریبەن هەموو ڕۆژێك یەکتر دەبینین و پێکڤە فراڤین(نیوەڕۆژە) دەخۆین، شەوانە چەند لاپەڕەیەکی جوان و خۆشت بۆ دەخوێنمەوە کە بێتاقەتیت دەربکات. ئەوسا دەکەوینە قسەو باسان، من چیرۆکی ژیانی خۆمت لە قەفقاز، بۆ دەگێڕمەوە. تۆش بیرەوەرییەکانی خۆت، باسی باب و دایکم دەگێڕیتەوە. ئەو چیرۆك و حیکاتە تر سناکانەی کە تا ماوەیەك لەمەو پێش بە چاوانی ئەبڵەق و زاری داچەقیوەوە گوێمان لێدەگرتن، دەگێڕیتەوە. ئەو ئازیزانە وەیاد دێنینەوە کە ئەم دنیایان بە جێهێشتووە. تۆ دەگریت و منیش چاو لە تۆ دەکەم، لێ ئەم فرمێسکانە شیرین و خۆشن. باسی ئەو برایانە دەکەین کە جارجارێك دێنە دیدەنیمان، باسی ماریزای ئازیز دەکەین کە ئەوەندە دڵبەندی (یاسنایا)یەو دەگەڵ هەموو منداڵەکانیا دێت و چەند مانگێك لە دەف(لای) ئێمە بەسەر دەبەن. ئاشنای زۆرمان نابن و هیچ کەسێك ناتوانێ سەغڵەتمان بکات و لە نك(لە لای) ئێمە غەیبەتی ئەم و ئەو بکات، خەونێکی دڵگیرو خۆشە، بەڵام لێرەدا نابڕێتەوە. وا لەبەر چاومە کە ژنم هێناوە، هاوسەرەکەم ژنێکی دلۆڤان، نەفس بەرزو بەسۆزە کە بە هەمان ئەندازەی من تۆی خۆش گەرەکە. منداڵمان هەن کە بە "دایە گەورە" بانگت دەکەن. تۆ لەم ماڵە گەورەیەدا لە هەمان ئەو ژوورەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دایە گەورە تیایدا دەژیا، دەژیت، وەزعی ماڵەکە هەمان وەزعی سەردەمی باوکمە، ئێمەش لەسەر هەمان ژیان دەڕۆین، بەڵام دەورەکان دەگۆڕین. تۆ دەوری دایە گەورە دەبینی، بەڵام هەنگاوی لەوەش هێوەتر دەنەیت و دلۆڤانتر و باشتر دەبیت. منیش وێڕای ئەوەی هیچ کاتێ ڕایەم ناکەوێ بتوانم جێی بابم بگرمەوە، ڕۆڵی ئەو دەبینم و هاوسەرەکەم ڕۆڵی دایکی منداڵەکانمان دەبینێ. ماریزا ڕۆڵی هەردوو پورەکەم، بێئەوەی ڕووبەڕووی بەد بەختییەکانی ئەوان ببێتەوە، دەبینێ. "گاسا"(١)ش ڕۆڵی (پراسکۆڤیا ئیزاڤنا)(٢) دەگێڕێت. بەڵام جێی ئەو کەسەی کە شوێنی جارانی تۆ لە نێو ماڵباتەکەمان بگرێتەوە، هەمیشە خاڵی دەبێت، چونکە مەحاڵە ژنێکی

جوانی سەرڕێژ لە میهرو مەحەبەتی وەکو تۆ پەیدا ببێت، بۆیە تۆ هەرگیز جیّ نشینت نابێت. سێ ئەکتەری تازەش جار جار دێنە سەر شانۆ کە بریتین لە برایەکانی من بەتایبەتی– نیکۆلای، کە خانەنیشین بووە، سەری روتاوەتەوە، بەڵام هەمان پیاوە نەفس بەرزو نەجیبەکەی جاری جارانە.

ئەو وەکو جاری جاران دێنمە پێش چاوی خۆم کە چیرۆکە خەیاڵیەکانی خۆی بۆ منداڵەکانم دەگێڕێتەوە. منداڵەکان دەستە ئارەقاویەکانی – بەڵام شایستەی ماچ– ماچ دەکەنو ئەو دەگەڵیاندا سەرگەرمی گەمەو قاقای پێکەنینە، لە کاتێکا ژنەکەم خواردنی دڵخوازی ئەو لێ دەنێت، بیرەوەرییە هاوبەشە دێرێنەکانی خۆمان لە زەینو هزرا تازە دەکەینەوە، تۆش لە شوێنی هەمیشەیی خۆت دانیشتوویتو بەوپەڕی تاسوقەوە گوێ بۆ قسەکانی ئێمەی پیر کە وەکو جاران بە ناوی (لوڤوکا، و نیکولینا)وە گازمان دەکەی، دەگریتو ئیرادی ئەوە لە من دەگریت کە لە جیاتی چەتاڵ بە دەست نان دەخۆمو گلەیی ئەوە لە و دەکەی کە دەستی نەشتووە.

هەرکاتێ پێشنیازی ئەوەم بۆ بکەن کە ئیمپراتۆریەتی روسیا یان سەر زەمینی (پرو)م بدەنێ یان شای پەرییان بە هەموو توانایەکی پەرجوئاسایەوە لێم بپرسێت گەورەترین ئارەزووم چییە تا بۆمی جێبەجێ بکات، بەوپەڕی راستگۆییەوە بەرسڤ(وەڵام) دەدەمەوە کە جگە لە هاتنەدی ئەو خەونو خەیاڵەی کە بۆ تۆم گێڕایەوە هیچ ئارەزوویەکی ترم نیە. دەزانم تۆ زۆرت کەیف بە پێشبینیان نایەت. بەڵام چ زەرەرێکی هەیە؟ ئاگادار بوون لە ئایندە خۆشە. دەزانم کە لە رادەبەدەر باسی خۆم کردو زۆر بە کورتی باسم لە بەختەوەری تۆ کردووە. ترسی ئەوەم هەیە بەدبەختییەکانی ڕابردوو، هەرچەندە دەمێکە تەواو بوون، کارێکی قوڵی لە دڵو دەروونت کردبێتو نەیەڵێت وەکو پێویست لەزەت لەم ئایندەیە کە بەختەوەری پێوە دەبێت، نەبینی. پوری ئازیزم. پرسیار ئەمەیە: ئایا تۆ رووی بەختەوەری دەبینی؟ لەوەیە هەر بویەرێك، هەر پێشهاتێك بێتە ڕێ، بەڵام بەڕاستی هێڤیو هێڤیداری زۆر خۆشە.

ئەوا دیسان روندك لە چاوانم دێنە خوارێ. نازانم بۆچی کاتێ کە بیر لە تۆ دەکەمەوە دەگریم؟ ئەمانە ئەشکی خۆشیو شادمانین. کاتێ کە هەستدەکەم تۆم ئەوەندە خۆشدەوێ نوقمی شادمانی دەبم. هەر نەگبەتیو بەڵایەکم بەسەرا بێت، مادامێکی دڵنیابم کە تۆ لە دنیادای، خەمم نییەو ناتوانێ بەختەوەریم لە دڵدا بسڕێتەوە. ئەو رۆژەت لە یادە کە لە کازان لە نزیکی میحرابی کلێسای (ئیڤر سکایا) لێکدی جیا بووینەوە؟ ئەو رۆژە کاتێ خودا حافیزیم لێکردیت، وەك بڵێی بە هۆی ئیلهامێکەوە بایەخی راستەقینەی تۆم بۆ هەمووان، بۆ دەرکەوت،و هەرچەندە منداڵ بووم، بەڵام بە چەند دڵۆپە روندکێكو بەو چەند پەیڤو وتە سەروگوێ شکاوانەم، قووڵیو راستگۆیی هەستی خۆم دەرهەق بە تۆ سەلماند. هەرگیز تینو تاوی خۆشەویستی من بۆ تۆ کەم نەبووەتەوە، بەڵام ئەو هەستانەی کە ئەو رۆژە لە نزیکی میحرابی ئیڤرسکایا بەسەر دڵو دەروونما زاڵ بوو، و ئەو سۆزەی کە ئێستا لەم دەمەدا دەرهەق بە تۆ هەستی پێدەکەم، لەگەڵ هەستی بۆنەیێن تردا جیاوازی زۆرە، چونکە یەکجار بەهێزترو ناسكو جوانترە.

دەمەویٚ لەلای تۆ دان بە شتێکدا بنەم کە مایەی شەرمەزاری منەو تەنیا لەبەر ئاسوودەکردنی ویژدانی خۆم ناچارم بیگێڕمەوە، جاران کاتیٚ کە نامەکانی تۆم دەخوێندەوەو ئەو هەموو هەستو سۆزەتم دەرهەق بە یەك بە یەکی ئێمە تیا دەبینی وام هەستدەکرد زۆرت پێوە ناوە، بەلاٚم ئێستا کە سەر لە نویٚ بەو نامانەدا دەچمەوە کە سەرڕێژن لە سۆزو دلٚسۆزی بیٚ سنووری تۆو بەرزی روحت، دلٚنیا دەبم کە هەر کەسێکی دی، جگە لە خۆت، دوای خوێندنەوەی ئەم نامەیەو نامەکەی پێشتری من، تووشی هەمان دوو دلٚی دەبێت کە لە دلٚی مندا سەبارەت بە نامەکانی تۆ پەیدا بوو بوو، بەلاٚم من هەرگیز ئەم تەسەوورە دەربارەی خودی تۆ ناکەم چونکە بە خۆت من باش دەناسیتو دەزانیت رەنگە تاقە سیفەتی باشی من ئەو حەساسیەتە بێت. من جوانترینو خۆشترین ساتەکانی تەمەنی خۆم بە قەرزارباری هەمان سیفەت دەزانم. بە هەرحالٚ ئەمە دوا نامەی من دەبێت کە بەو جۆشو خرۆشو سۆزەوە باسی هەستەکانی خۆمی تیا بکەم، هەلٚبەتە جۆشو خرۆش لە روانگەی بێگانانەوە، بەلاٚم شادمانم کە تۆ حەقیقەتی ئەوە دەزانیت.
خودا حافیز پوری ئازیزم.
هێڤیدارم تا چەند رۆژێکی دی نیکولایی ببینم، و هەنگیٚ جارێکی دی نامەت بۆ دەنێرم.*

***ل. ت***

***پەراوێز***

****- ئەم نامەیە بە زمانی فەرەنسی نووسراوە.***

***١- گاسا: کارەکەری نەنکی تولستوی بوو کە هەموو تەمەنی خۆی لە خزمەت مالٚباتو بنەمالٚەی تولستوییەکاندا بەسەر برد، تولستوی لە (بیرەوەری مولٚکدارێك، و ئانا کارنینا)دا وەسفی کردووە.***

***٢- پراسکوڤیا ئیزاڤنا: ماموری چوونە بازاڕو شت کڕین بوو لە مالٚی تولستوی دا.***

## بۆ س. ن. تولستوی

## ئیسکی ئوردا، ١٨٤٥/١/٢٩

**سیرجی ئازیزم**

چونکە لەوەتای حەرەکەتم کردووە هیچ نامەیەکم بۆ نە ناردوون، لە ئاستی هەمووتان شەرمەزارم. هەست بە کەمتەرخەمی دەکەم. خۆیشم هۆی ئەمە نازانم. ژیانی بیٚ سەر و بەر، وەزع و حالٚی نالەبار، ورەی داروخاو، شەڕ، ئەو کۆسپ و لەمپەرە جۆراو جۆرانەی کە خەلٚکی جیاواز بۆمی دروستدەکەن و زۆر هۆی بیٚ شوماری دیکە وەڕەزو بێزاریان کردووم. بەلاٚم بە بۆ چوونی خۆم هۆی سەرەکی ژیانی ئالۆز و تەژی سۆز و گودازە. لە ماوەی ئەم سالٚەدا ئەزموونان

و حاڵەتی زەینی و دەروونی ئەوتۆم دیتوون و بەسەر هاتوون کە نازانم لە کوێندەرەوە دەست بە شرۆڤە و گێڕانەوەیان بکەم، نازانم ئاخۆ دەتوانم بە دڵی خۆم بیانخەمە سەر کاغەز؟ بۆ نموونە دەبارەی سیلیستریا نامەم بۆ پوریێ نووسیوە، بەڵام بۆ تۆ و نیکۆلاتیسکا نامەی لەو جۆرە نانووسم، چونکە دەمەویێ بە جۆریێ شتەکان بۆ ئەنگۆ شرۆڤەو باس بکەم کە بە باشی تێی بگەن. چیرۆکی شەڕی سیلیستریا ئێستا بووە بە بەشێك لە ئەفسانانی کۆن، یانی کۆن بووە، ئێستا دەبیێ باسی سباستوپل بکەم کە بێگومان ئێوەش بە دڵی لەرزۆکەوە هەندیێ شتی دەربارە دەخوێننەوە، من بەر لە چوار رۆژ بە خۆم لەوێندەر بووم. چۆن باسی ئەو شتەت بۆ بکەم کە بە چاوی خۆم دیتوومە؟ ئەو شوێنانەی کە دیوومن، ئەو کارانەی کە کردوومن و قسەی ئەو ئینگلیزانەی کە ئەسیر یان بریندار بوون، چیرۆکی رەنج و عەزابی ئەوان، پیاوەتی و ڕەندی و مەردی و دلێری دەریاوانان و سەربازانی خۆمان لەلایەك، و داستانی قارەمانیەتی دژمنانمان لە لایەکی ترەوە، بە تایبەتی هی ئینگلیزەکان چۆن وەسف بکەم؟ دیارە لە یاسنایا و پیروگوۆ باسی هەموو ئەمانە دەکرێت و لە هەمان کاتدا لە ڕێگەی چاپەمەنی و بڵاڤۆکانەوە زۆر شتی تر دەزانیت. پاشان باسی ئەوانەت بۆ دەکەم، جاریێ گەرەکمە تۆزیێ باسی (سباستوپل)ت بۆ بکەم. شار لە ئالی(لا، سەمت) باشوورەوە، کە لە کاتی هاتنی دژمندا هیچ سەنگەرێکی لیێ نەبوو، ئابلۆقە دراوە. ئێستا ئێمە لەمبەرەوە، پتر لە پێنج سەد تۆپی کالیبەری گەورەمان دابەستاوەو یەك زنجیرە سەنگەری زەمینی زۆر قایممان لێداوە. یەك هەفتەم لە نێو ئەم سەنگەرە مکومانەدا بەسەر بردو تا ئاخیر رۆژ بە نێو تۆپخانەکاندا کە بە شێوەی زیکزاك دابەسترابوون، لە هاتووچۆدا بووم. دژمن لە قۆڵێکەوە بە درێژایی سیێ هەفتەیە کە نزیکەی دوو سەد مەترێك هاتووەتە پێشیێ، بەڵام ناتوانیێ لەوەی پتر بێتە پێشیێ، هەرکە بجوڵێتەوە رێژنەی گوللە بەسەر تەپڵی سەریا دادەباریێ. ورەی سوپا لەوەسفکردن نایەت. تەنانەت لە سەردەمی یونانی کۆنیشدا ئەو جۆرە قارەمانێتی و دلاوەرییە نەبینراوە. کرنیلف لە کاتی دیتنی نمایشی سەربازەکاندا دەیگوت: "سلاوتان لیێ بیێ کوڕینە!" ئەوجا لەسەری دەڕۆیی:"ئەمڕۆ ئێمە پێویستمان بە گیانبازییە ، ئایا ئامادەن لە ڕای نیشتماندا بمرن؟" سەربازەکان بە یەك دەنگ وەڵامیان دەدایەوە: "ئامادەی مەرگین پایە بەرز!"و هورایان دەکێشا. هەڵبەتە بە درۆوە وایان نەدەگوت چونکە راستگۆیی هەر سەربازێك بە تەواوەتی بە سیمایەوە دیار بوو. شۆخی نەدەکرد بەڵکو بە جدی قسەی دەکرد، بەڵگەش ئەوەیە تا نهو بیست و دوو هەزار کەس ئەو قسەیەی خۆیان بردووەتە سەر.

سەربازێکی زامدار بەدەم ئاوزینگ و گیانەللاوە بۆی دەگێڕامەوە کە چۆن بەبیێ هیچ پشتیوانیەکی تۆپخانە، بیست و چوار فەرەنساوی بە تەواوەتی لە ناو برد بوو، لە حیرساندا زۆڕ زۆڕ دەگریا. تۆپخانەیەك تەقریبەن یاخی بوو بوو چونکە دەیویست بە هەر نرخیێ بووە لە جیاتی ئەو تۆپخانەیەی کە ماوەی سی دانە رۆژ لە بەرانبەر بۆمبارانـدا بەرگری کرد، درێژە بە شەڕ بدات. سەربازەکان زامنی بۆمبەکانیان رادەکێشا، ژنان ئاویان بۆ ئەو سەربازانە دێنا کە لەسەر قوللەو برج و سەنگەرەکانەوە دیدەوانیان دەکردو ئێشکیان دەگرت، گەلێك لەو ژنانە دەکوژران یان زامدار دەبوون. کەشیشان خاچ بە دەست بەناو سەنگەرو قوللەکان دەکەوتن و لە ژێر

ئاگربارانی شەڕدا دوعایان دەخوێند. رۆژی ١٠/٢٤ سەدو شەست کەس لە یەکەکانی گوردانێك (بەتالیۆن) هەرچەندە بریندار بوو بوون ئامادە نەبوون بەرەی شەڕ چۆڵ بکەن. بەڕاستی سەیر بوو. ئێستا دوای ١٠/٢٤ وەزعەکە تۆزێ ئارام بووەو ژیان لە سباستوپل زۆر ئاسایی بەڕێوە دەچێت. دژمن تەقریبەن دەستی لە تیرەندازی هەڵگرتووەو هەمووان دڵنیاین کە شاریان بۆ ناگیرێت، چونکە ئەمە مەحاڵە. سەبارەت بە پلان و نەخشەی دوایی دژمن سێ گریمانە دەکرێت، یان هێرش دەکات، یان بۆ شاردنەوەی پاشەکشەی خۆی دەکەوێتە مانۆڕو چاووڕاوان یان بۆ بەسەر بردنی رۆژگاری زستان دەکەوێتە قایمکردنی سەنگەرو مەتەرێزەکانی خۆی، دوورترین گریمانە، گریمانەی یەکەمەو نزیکترینیان گریمانەی سێیەمە.

من تا ئێستا نەمتوانیوە تەنانەت لە یەك ئۆپەراسیۆنی جەنگیشدا بەشداری بکەم، بەڵام وێڕای ئەوەش مەمنونی خودام کە توانیم ئەم خەڵکانە لە گەرمەی شەڕدا بدینم و لەم زەمانە پڕ لە شانازیەدا بژیم. تۆپ بارانی ١٠/٥ نەك هەر لە مێژووی روسیادا بەڵکو لە مێژووی هەموو جیهاندا وەکو درەوشاوەترین و پڕ شانازیترین شاکاری جەنگی دێتە تۆمارکردن. پتر لە هەزارو پێنج سەد تۆپی دژمن ماوەی دوو دانە رۆژ لە پەستاو بێ بڕانەوە کەوتنە تۆپبارانی شار، کەچی نەك نەیانتوانی شار ناچار بە تەسلیم بوون بکەن بەڵکو نەیانتوانی بیست یەکی تۆپخانەکانی ئێمە لە کاربخەن. خۆ ئەگەر لە فەرزێکا ئەمڕۆکەش لە روسیادا بە چاوی ستایشەوە نەڕواننە ئەم شەڕو لەشکرکێشییە، بێگومان رۆڵەکانی ئایندە، لە هەر شەڕو لەشکرکێشییەکی دیکە پتر ستایشی دەکەن. چونکە هەر نەبێ ئەم خاڵە رەچاودەکەن کە ئێمە بە کۆمەڵە سەربازێکی زۆر کەمەوەو تەنیا بە رمو سەرەنێزەوە بە خراپترین یەکەی جەنگی سوپای روسیاوە — وەکو سوپای چوارەم— دژی هێزێکی زۆر زیاتر لە خۆمان، کە بە باشترین یەکەی هێزی دژمن دەژمێردرێ، و باشترین مەشقیان دیتووەو سێ هەزار دانە تۆپیان پێیە، چووینەتە شەڕەوە. باسی لێهاتوویی و کارامەیی جەنەڕاڵەکانی دژمنیش لەولاوە بوەستێت. بەڵام سوپای ئێمە دەتوانێ بەرگری بکات و سەر بکەوێ — دڵنیام کە لە ئەنجامدا سەردەکەوین— دەبێ سەربازانی بریندارى فەرەنسی و ئینگلیزی بەچاو بدینین. هەموویان چ لە رووی بەدەنی و چ لە رووی سایکولوژی و دەروونییەوە لاوانی شایستەو کوڕانی میللەتی ئازاو بە غیرەتن. قوزاقەکان دەڵێن حەیفە کە بەو جۆرە بە کوشت بچن و بکوژرێن. هیچ یەکێك لە ئەفسەرانی ئێمە بە بالای کورت و رواڵەتی پەرپوت ناهەمواریانەوە لەگەڵ ئەواندا نایەنە بەراود کردن.

جا ئێستا بۆتی باس دەکەم چۆن دەتوانی بە هۆی منەوە لە رێگەی بلاڤۆکانەوە لە هونەرنوێنی هەمان ئەو شێرە کوڕە بە رواڵەت پەرپوت و ناقولایانە ئاگادار ببی. لە سەرکردایەتی تۆپخانەدا، کە بۆم نووسیبوویت لە کەسانی زۆر جدی و شایستە پێکهاتووە، ئەم بیرۆکەیە هاتۆتە ئاراوە کە گۆڤارێکی سوپایی هەرزان — یانی لە دەورو بەری سێ رۆبڵ— و عامیانەو میللی کە هەموو سەربازان بتوانن بە ئاسانی بیخوێننەوە، بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ورەی سوپا چاپ و بلاو بکەینەوە. من ئەم مەسەلەیەم گەلاڵە کردو بۆ شازادەم پێشنیازکرد، ئەویش بیرەکەی پەسەند کرد و هەواڵەکەی دەگەڵ ژمارەیەکدا کە وەکو نموونە ئامادەمان کردبوو، بە مەبەستی وەرگرتنی

مۆڵـەت بـۆ ئیمپراتـۆر نـاردووە. مـن و سـتولیپین(١) خـەرجی چـاپکردنی گۆڤارەکـە لـە ئەسـتۆ دەگـرین. سەرنووسەرییەکەشـی مـن و کەسـێکی دی بـە نـاوی کونسـتانتینوف(٢) کـە پێشـتر سەرنووسەری گۆڤاری قەفقاز بووە و لەم کارەدا شارەزاییەکی فرەی هەیە، لە ئەستۆ دەگرین. لەم گۆڤـارەدا باسـی شـەڕەکان – نـەك وەکـو هـەموو گۆڤارەکـانی دی کـە بابـەتی وشـك و بـێ بنـەما بڵاودەکەنـەوە– و قارەمانیـەتی و هونەرنوێنییـەکانو ژیاننامـەی سـەربازانی دلێـرو عەگیـد بـە تایبـەتی سـەربازانی ئاسـاییو داسـتانانی سـوپاییو دەقـی مارشـێن سـوپایی و وتـارێن سادەو عەوامفام دەربارەی هەندەسەی سوپاییو تۆپخانەو... هتد بڵاودەکەینـەوە. ئـەم بیرۆکەیـە بـۆ مـن زۆرباشـە، رێك پـڕ بەپێسـتی منـە، یەکـەم لەبـەر ئـەوەی کـە بەڕاسـتی حـەزم لـەم جـۆرە کارانەیـەو دووەم ئومێدەوارم کە گۆڤارێکی سوودمەند دەربچێتو چاپەکەشی مایەی ڕەزامەندی بێت. بـەڵام تـا وەڵامـی ئیمپراتـۆر نەیەتـەوە هـەر هـەموو ئـەم نەخشـانە، بەمۆڵـەقی دەمێننـەوە. لـەو ژمـارە نموونەیـەدا کـە بـۆ سانپترسـبۆرگ نێـردراوە منو رستوڤچـوف(٣)، بـێ هـیچ پارێزکارییـەك دوو وتارمـان نووسـیوە کـە زۆر دەگـەڵ نەفەسـی محافەزەکارانـەی ئیمپراتـۆردا ناسـازێت. ئـەو هـەزارو پێنج سەد رۆبڵەی کە لە سەندوقی دادگادا بـە ئەمانـەت دامنـاوە، داوام لـە والـرژان کـردووە بـۆمی بنێرێت، بە کەڵکی ئەم کارە دێت. لەبـەر ئـەوەی لـەم نامەیـەدا هـەر ڕووی دەمـم لـەتۆ بـووە، چـەند وشەیەکیشت دەربارەی والرژان بۆ دەنووسم. پێی بڵێ کە چەند رۆژێك لەمەبەر بە دیداری کۆنـە فەرماندەکەی ئـەو شـاد بـووم. زۆر پـیر بـووە. وەهەرچـەند دەری نـابڕێ بـەڵام دڵنیـام نەخۆشـە. ئـەو پیاوە لە (ئالما)دا هەرچەندە ئازایەتی زۆری نواند، گەوجێتی زۆریشی کرد، سەبارەت بـە والـرژان زۆری پرسیار لێکردم.

خـۆم لـە سـایەی فـەزڵی خواییـەوە باشـمو لـەو رۆژەوە کـە لـە دەرێـی روسـیا گەڕاومەتـەوە ئاسودەترو خۆشتر دەژیم، ژیـانم لـە سـوپادا بـە شـێوەیەکی گشـتی دەکرێ بەسـەر دوو قۆناغـدا دابەشی بکەی. قۆناغێك کە لـە دەرێـی روسـیا بەسـەرم بـردووە – هەمیشـە بێتاقـەتو تـەنیاو بـێ پارەبووم– قۆناغی دووەم کە لە نـاو روسـیادا بـە سـەرم بـردووە، زۆر خـۆش بـوو. ئێسـتاش حـاڵم باشـەو هـاورێی باشـم هـەن، هێشـتا بـێ پـارەم، هەرچـەندە ئەگـەر پـارەم هـەبێ، بـە شـێوەیەك لـە شێوەکان خەرجی دەکەم.

سـەبارەت بـە کـارێن ئـەدەبی ، حـاڵی حـازر هیچـم بـە دەسـتەوە نیـەو بـە گـوێرەی ئامۆژگاریـەکانی پـوریێ کەوتوومەتـە کۆکردنـەوەی ئـەزموون. تـەنیا یـەك شـت تاڕادەیـەك نیگـەرانی کـردووم: ئەمـە چوارەمین ساڵە کە بەبێ ژن دەژیم. دەترسم خرف ببمو ئیدی دەگەڵ ژیانی خانەوادەییدا کە زۆرم حەز لێیەتی، هەڵنەکەم. خودا حافیز! خودا خۆی دەزانـێ کـەی جارێکی دی یەکدی دەبینینـەوە، مەگەر تۆو نیکولینکا سەرێك لە (تامبوف)ی مەڵبەندی سەرکردایەتی ئێمـە بـدەن. حـاڵی حـازر وا دێنە بەرچاو کە ئەم شەڕە درێژە دەکێشێت. دەربارەی جەنگی سیلیسـتریا وەکـو چـۆن پێشـبینیم دەکـرد بـۆ وەرگرتنـی میـداڵو نیشـانە هەڵنەبـژێردرام. لـە جیـاتی ئـەوە دەگـەڵ خـەڵکی تـردا بـۆ دەرەجەی ستوانی بەرزکرامەوەو لـەم رووەوە زۆر خۆشـحاڵم. چـونکە ئـەم چیرۆکـی تەرفیعـەی مـن خەریك بوو بەرە بەرە کۆن دەبوو، و بەڕاستی مایەی شەرمەزاری بوو.

***پەراوێز:***

***١- ستولیپین (١٨٢١-١٨٩٩) لەو زەمانەدا ئاجودانی فەرماندەی تۆپخانەی سوپای باشوور بوو، و پاشان بوو بە فەرمانداری چەند ستانێکی جیاوازی روسیا.***

***٢- کونستانتینوف (١٨١٣-١٨٥٦) فەرمانبەری پایەبەرزی وەزارەتی جەنگ بوو لە شەڕی قرم دا، کە یەکێك بوو لە فەرماندەیی شازادە گرچاکوف.***

***٣- روستوڤچوڤ: بەڕای تولستوی یەکێك بووە لە ئەفسەرە هەر بەوەج و دیمەنەکانی سوپای باشوور.***

## بۆ ن. ن. تولستوی.
## پێگەی سوپایی روباری بعلبك، ١٨٥٥/٢/٣

دوای ئەو نامە سەیرو سەمەرەیەی کە بەشێکی بە شیعرو بەشەکەی تری بە پەخشان بوو، نازانم ئەم دانەیەیان چۆن دەست پێبکەم - نیکولای سرجیویف((١)) دەڵێت وەکو هەڵگەڕانە بە کێوی ئاتوسدا- بە تایبەتی لەبەر ئەوەی کە لەم نامەیەدا دەبێ ئیعتراف بە بویەرو رووداوێکی تاڵ بکەم. بە کورتیەکەی ئەمەیە: ئەو هەزارو پێنج سەد رۆبڵەی کە بۆت ناردووم، هەموویم لە قوماردا دۆڕاند. تکات لێدەکەم هەوڵ مەدە چ بە نووسین و چ بەزارەکی لۆمەم بکەی یان بە تەخسیرکارم بزانی چونکە بە خۆم تاوەکو ئەم دۆڕانە بە وەرگرتنی دەرامەتی کارەکانی خۆم قەرەبوو نەکەمەوە، بەرەنجی شانی خۆم قەرەبوو نەکەمەوە، دەست لە لۆمەی خۆم هەڵناگرم. هەڵبەتە ڕەنگە لە نامەکانی مندا بۆت دەرکەوتبێ کە ئەم پارەیەم بۆچی بووە، و بۆچی نەخشەی بڵاوکردنەوەی گۆڤارە سوپاییەکە پوچەڵ بووەوە. بەڵام سەبارەت بەوەی کە چۆن ئەم هەموو پارەیەم لە قوماردا دۆڕاند، شایانی ئەوە نیە کە بە دوورو درێژی بۆتی بگێڕمەوە، تەنیا ئەوەندەت پێدەڵێم کە بە شێوەیەکی زۆر گەوجانەو بێ تام دۆڕاندم((٢)).

لە سەرەتاکانی هەیڤی نۆڤەمبەرا لە (کیسینف)ەوە بۆ سباستوپل رۆییشتم و تکام کرد کە وەکو ئەفسەری تۆپخانە قەبوولم بکەن چونکە زۆریان پێویست بە ئەفسەرانی تۆپخانەیە. ئێستا لە (قرم)ین و بۆیەش لە (کیسینف)ەوە نامەم نووسیوە، تا پورەکانمان نیگەران نەبن. بەڵام ئێستا سباستوپل لە لایەکەوە شوێنێکی زۆر پڕ مەترسی نیەو لەلایەکی ترەوە بەر لە من ئالسکا((٣)) چووە بۆ ئەوێ و نامەیەکی نووسیوە کە ئەم دێڕەیت بۆ دەنووسمەوە: "لە رێگەی دەریاوە هەر

سیٚ دەوڵەتی تورکیاو فەرەنساو ئینگلتەرا هێرشیان بۆ هێناوین‌و حاڵی حازر شەڕێکی قورس بەردەوامە"((٤)) هەرچەندە باشی نووسیوە، لیٚ بەتەواوەتی دروست نیە، چونکە نزیکەی سیٚ مانگە کە هیچ شەڕێکی گەورە رووی نەداوەو تەنیا سباستوپل گەمارۆ دراوەو ئەم گەمارۆیەش خەریکە درێژە دەکێشێت. هەموو رۆژیٚ نزیکەی پازدە سەرباز بە خۆڕایی دەکوژرێن. شەڕە تفەنگ لە ریزی پێشەوەی سەنگەرەکاندا بەردەوامە، هەردوولا نارنجۆك داوێژنە یەکدی، مین دەتەقێتەوە، ژمارەیەك یەخسیر دەبن‌و کۆمەڵێك فیراردەکەن، بە هەرحاڵ دیل‌و هەڵاتووی ئەوان لە هی ئێمە زیاترە، جارجارێك بیٚ هیچ پارێزو ئامانجێك لە سەنگەرەکان وەدەردەکەون‌و بەرەو سەرەنێزە دەکەونە گیانی یەکتر، جگە لەم وردە رووداوانە هیچ پێشهاتێکی گرینگ لە ئارادا نیە. سباستوپل لە گرتن نایەت. دژمن لە ئێمە زیاتر ئەم حەقیقەتە دەزانیٚ، چونکە لە رووی مادییەوە وەزع‌و حاڵێکی باشتر لە وەزع‌و حاڵی ساڵی ١٨١٣ی نیەو بۆیە چ بەڕای دژمن‌و چ بە بۆچوونی ئێمەش ئەم هۆڤیگەری‌و دڕندایەتی‌و زوڵمە مایەی ئەوپەڕی بێزارییە. سەربازەکان هەمیشە لێکدی دەپرسن: "کەی لە مۆتەکەی سباستوپل رزگاردەبین؟" من لە سەرەتای هاتنمەوە بۆ ئێرە، بووم بە ماموورو بەرپرسی تۆپخانەیەك لە ناو سباستوپل‌و نزیکەی یەك هەیڤم لە نێو مەتەرێزو سەنگەرەکاندا بەسەر بردو پاشان بۆ بناری سیمفرو هۆلی – Simfro holi نەقڵ بووم – تۆپخانەکە لە حاڵی پشوودا بوو– کاتی خۆم بە سەماو پیانۆ ژەنین‌و ڕاوی ئاسك‌و بزنە کێویان بەسەر دەبردو چ دیمەنانێك((٥))... بۆ ئای. ئای. پانایڤ– j. j. panaev.

*ل. ت.*

***پەراوێز***

*١- نیکولای سرجیویف: براو سەرپەرشتیاری یاسایی منداڵەکانی تولستوی بوو، پێدەچیٚ گوتبێتی نامەنووسین بۆ ن.ن تولستوی لە هەڵگەڕان بە کێوی ئاتوس (Athos)دا قورسترو دژوارترە.*

*٢- تولستوی لە ١٨٨٥/١/٢٨دا لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا نووسیویەتی: دوو رۆژو شەوی بەردەوام قومارم کردو ئاکامەکەشی ئاشکرایە: ماڵەکەی یاسنایا پولیاناشم دۆڕاند، هێندە لە خۆم بێزارم ئاوات بە مەرگ دەخوازم.*

*٣- ئالسکا: خوڵام‌و خزمەتکاری تولستوی بوو.*

*٤- تولستوی ئەو ڕستەیەی خزمەتکارەکەی خۆی، دەقاو دەق نەقڵ کردووە.*

*٥- پاشماوەی ئەم نامەیە نەپارێزراوە.*

## بۆ ت. ئا. ئێرگولسکایا

**سباستوپل، ١٨٥٥/٩/٤**

**پوری ئازیزو خۆشەویستم**

**رۆژی بیست‌و حەوتی هەیڤی بوری، رووداوێکی گەورەو پڕ شانازی لە سباستوپلدا رووی دا. نازانم لە بەختداریم بوو یان لە بێ بەختی کە رێك رۆژی هێرشی دژمن گەییمە ناو شارو ئیدی هەموو بەسەر هات‌و بویەرەکانم بە چاوانی خۆم بینی‌و تەنانەت لەسەر داوای خۆم بەشداری شەڕەکانیشم کرد. دڵی خۆت سەخڵەت مەکە چونکە تووشی هیچ مەترسییەك نەبووم. رۆژی ٨/٢٨ واتا رۆژی لە دایکبوونم، بۆ جاری دووەم بە رۆژێکی مێژوویی‌و خەمناك بۆ من دێتە ژماردن، جاری یەکەم کە ئێستا هەژدە ساڵی بەسەرا دەبورێ پورە (ئالکراندرین)م لە دەست داو ئەمجارەیان روخانی (سباستوپل)م بە چاوی خۆم بینی. کاتێ کە ئالاّی فەرەنسیەکانم بەسەر سەنگەرو مەتەرێزەکانی خۆمانەوە بینی، بە دەستی خۆم نەبوو رونك بەچاوانما هاتە خوارێ. بە شێوەیەکی گشتی رۆژێکی فرە خەمناك بوو. (ڤالنتین کولوسین) کە زۆرم خۆش دەویست دیار نەماو کەس نازانێت چی بەسەر هاتووە. نامەوێ جارێ هیچ بۆ داك‌و بابی بنووسم، چونکە ئومێدەوارم یەخسیر بووبێ. بۆ تاقیبی ئەو نامەیەکم بۆ ئۆردوگای دژمن نووسیوە کە هێشتا وەلاّمیان نەداومەتەوەە. پورێ گیان نازانم بۆچی هەر هەموو ئەو کەسانەی کە نامەم بۆ نووسیون وەلاّمیان نەداومەتەوە، ئەوە تۆی، والرژانە، ماریژایە، نیکۆلایە، سیرجییە... ماوەیەکە بیرۆکەی وازهێنان لە سوپا مێشکی مژول کردوم، پێم وایە کارێکی ئاسان بێت، بەلاّم بەر لەوەی بڕیار بدەم‌و هیچ هەنگاوێك بنەم دەمەوێ رەزامەندی تۆ وەربگرم.**

**بۆیە ئەم نامە کورت‌و بێ سەروبەرەم بۆ ناردیت تا لە سەلامەتی خۆمت ئاگادار بکەمەوەو رەزامەندیت لە بارەی ئەو بیرۆکەیەوە وەربگرم. خودا حافیز پوری ئازیزو باش‌و بێ هاوتام! هەزارجار دەستەکانت ڕادەمووسم (ماچ دەکەم)، و سوێندت بۆ دەخۆم کە هەمیشە لە بیری تۆدام***

***دڵسۆزت***

***لیون تولستوی***

***پەراوێز***

****- ئەم نامەیە بە فەرەنسی نووسراوە.***

## هونەرو كۆیلایەتی زەوی

## ١٨٥٦ - ١٨٦٢

# چەند پەیڤێك لەمەڕ ئاشقێنیو چۆنیەتی ژنهێنانی تولستوی

تولستوی لە مەسەلەی ژنهێناندا یەجگار سەختگیر بوو، باوەری وابوو كە ژن دەبێ زۆر بێگەردو داوێنپاك، خوێنەوار، بە سۆزو دلۆڤان بێتو هەمیشە خۆی بۆ بەختەوەریو شادمانی هاوسەرو منداڵەكانی خۆی تەرخان بكات. رۆمانی (ئاناكارنینا) لەسەر هێمو بناغەی هەمان باوەڕو بۆچوونی تولستوی رۆنراوە. تولستوی لەم رۆمانە نەمرەدا ئەوە نیشاندەدات كە شادمانی راستەقینە لە نەفسپەرستیو لە ئاشقێنی توندی مەجازیو نالوژێكیدا نیەو ئاكامو ئەنجامی ئەم جۆرە ئەشقانە جگە لە نابوتیو ناكامی هیچی تر نیە.

زۆر ژنی گەنجو خشكۆك حەزیان لێكرد، لێ تولستوی هیچ یەكێكیانی بە شایستەی خواستنو هاوسەری نەزانیو هێندەی ئیرادو رەخنە لە هەر یەكێكیان گرتو داوای مەرجی هێندە قورسو دژواری لێدەكردن كە لە توانای كەسیاندا نەبوو، بۆیە هەموویان وازیان لێهێنا. ڤالریا ئارسنوڤا

یـەکێك بـوو لـەو کیـژە جـوان‌و ڕندانـە کـە لـە بنەماڵەیـەکی گـەورەو خانـەدان بـوو، لـە رووی کەسـایەتی‌و بـاوەڕی ئاینییـەوە لـە هـەموو حـەزلێکردەکانی دیکـەی تولسـتوی بـاڵاتر بـوو، و تولسـتوی نامەیـەلێکی یـەجگار فـرەی بـۆ نووسـیوە، لـێ ئارسـنوڤا دەری نـەبردو سـەرەنجام تولسـتوی کیـژێکی زۆر گـەنجی پـاکیزەو داوێنپـاکی بـە نـاوی سـۆنیا ئانـدریوڤنا، کـە هـەموو مەرجەکانی ئەوی قەبوڵکرد، خواست.

## بۆ ڤالریا ئارسنوڤا

**١٨٥٦/١١/٨**

**ڤالریای ئازیز**

نزیکـەی هەفتەیەکـە کـە لـە تـۆ دوورم،و لـەم ماوەیـەدا تەنانـەت نامەیـەکی یـەك دێـڕی تـۆم پـێ نەگەییوە. ئایا ئەو نامە ڤێزەونـەت پێگـەیی کە لـە مۆسـکۆوە بـۆم ناردبوویت؟((١)) لـە نووسـینی ئەو جۆرە نامەیە ژێـوان‌و شـەرمەزارم. ئـەمڕۆ گەییمـە پترسـبۆرگ، حـاڵم زۆر خراپـە، بـێ ورەو بـێ حەواسم، لە مۆسـکۆ خـەڵکانێکی کـەمم بینـی‌و لـە ئەنجامـدا زۆر بێتاقـەت بـووم. لەگـەڵ مـاز،(٢)دا دەربـارەی تـۆ قسـەم کـرد. زۆر تامـەزرۆو تاسـەمەندی دیتنـی تۆیـە، هـەروەها لەگـەڵ (ڤولکنسکی)((٣))شدا کە کەم‌و زۆر تۆ ناسێت قسەم کرد، لێ لێی پرسیم ئایا ڕاستە ئاشقی ئەو کیژە بووم کە ئەوی بە بێ کڵاو لە ترامبلا((٤))دا دیتووە؟ چونکە دانی بەوەدا نا کە بە ئاشکرا گوێی لە قسەی خوشکانی کیسلینکی بووە کە گووتویانە ((بەڕاستی ئەم خانم شرباچیڤایە((٥)) ژنێکی سووك‌و کمە. کیژی خوشکەکەی کە کیژێکی خشیك‌و گەنجە بۆ ئێرە هێناوە‌و بە پیاوانی هەمە جۆری ناساندووە‌و خەریکە بە دەستی خۆی بەدبەخت‌و چارە ڕەشی دەکات. گوایە لـەم دواییانـەدا ڕادەسـتی مـوزیکزانێکی کـردووە کـە تـەواو شـەیداو ڕمـودەی خـۆیی کـردووە‌و کـار گەییوەتە ئەوەی کە نامەی ئاشقێنیان بکەوێتە نێوان.)) جا تۆ خۆت حیسابی بکە کە من بە بیستنی ئەم قسانە چەند نیگەران‌و ناڕەحەت بووم. ڤالریـای نازەنین! باوەڕبکـە ئەگـەر چـی وتنـی ئەم حەقیقەتەم لە بەر گرانە، بەڵام هیچ شتێك بێ شوێنەوار نابێ‌و هیچ شتێك بە تەواوەتی لە بیر ناچێتەوە. کاتێ کە دەگەڵ تۆدام ئەوەنـدە لە هەنبەرتدا دەسەوستانم کە ئامادەم باوەڕ بەخۆم بکـەم کـە هـەرگیز ئاشـقی (مرتیـە) نـەبوویت‌و بـە ڕاسـتی‌و لـە کانگـەی دڵـەوە، ڕاسـتگۆیانە منـت خۆشدەوێ، لێ کاتێ کە بەکاوەخۆ، بە هێمنی لە فکران ڕادەچم هەموو شتێك بە چاوێکی دی‌و بە

شێوەیەکی دروستر دەبینم. وەکو قەولم بە تۆ داوە، من قسەی خۆم چەند ڕەقیش بێ، بە ڕاشکاوی‌و بێ پەردە دەکەم‌و گوێ بە ئاکامەکەشی، هەرچیەك بێ نادەم. ئەو شتەی کە دەربارەی "پیاوی ئاقل"و "پیاوی گەلحۆ" بۆم نووسی بوویت، بە تەواوەتی دروستە، بەڵام ئەگەر دەتەوێ ڕاشکاوانەتر مەسەلەکە باس بکەم، دەبێ بەڕاشکاوی بڵێم: بەر لەوەی بۆ بەشداری لە ئاهەنگی تاجگوزاریەکە بڕۆیت متمانەی تەواوم بە دڵی پاك‌و پڕ میهرت هەبوو، هەر چیەکت دەگوت باوەڕم پێ دەکردیت‌و هەستم دەکرد لە کانگەی دڵەوە، بێ هیچ دوو دڵی یەك، بێ هیچ غەل‌و غەشێك خۆشم دەوێ. لە دوای مەسەلەکەی (مرتیە)شەوە هێشتا هەر شەیدای تۆم بەڵام لێم ببورە، دەبێ ڕێك‌و ڕەوان، بێ هیچ پێچ‌و پەنایەك، پێت بڵێم کە ئەو ڕێزەی جارانت لەلام نەماوە، وەکو جاران باوەڕم بە قسەکانت نیە..

هەڵبەتە بە پێچەوانەوەی ویستی خۆمەوە. زۆر لە خۆم دەکەم وەکو جاران باوەڕ بە قسەکانت بکەم‌و ڕێزت بگرم، بەڵام گومان‌و دوو دڵی بەرۆکی زەینم بەر نادات، ئیدی بە خۆت حەکەم بە.. نزیکەی سێ دانە مانگە کە تۆ منت ناسیوە، هەڵبەتە نەتدەزانی بە نیازی خوازگاری تۆم‌و لە ئەنجامدا دڵت دا بە (مرتیە). تۆ خۆت ئەوساکە دانت بەو حەقیقەتەدا نا. نەت دەتوانی نکوڵی لێ بکەیت‌و چونکە تۆ ژنێکی ئابڕومەندی. پاشان خۆت لە دیتنی مرتیە دزییەوە، بەڵام بێ ئەوەی بەتەواوەتی خەیاڵی ئەو لە مێشکی خۆت دەربکەی‌و چیتر نامەی بۆ نەنووسیت. لەم ماوەیەدا زانیت کە من بەجدی نیازی خوازگاری تۆم هەیە. دڵبەندی من بوویت‌و ئەوەتا دیسان ڕاسگۆیانە ئیدیعا دەکەیت هەرگیز (مرتیە)ت خۆش نەویستووە. گەرەکمە بزانم کام یەك لەم هەستانەت ڕاستگۆیانە بووە؟ دەڵێیت لەو ماوەیەدا کە دڵبەندی (مرتیە) بوو بوویت، مە یلێکی زۆرت بەلای مندا هەبووەو ئەمێستا لە مرتیە بێزاریت. ئەم قسانە نیشانەی ئەوەیە کە مرتیە کتێبی ڤارتەری بۆ خوێندنەوە داویتەتێ‌و بەمجۆرە تۆوی نەفرەتی لە دڵتا ڕواندووەو بەڵام من زیاتر بایەخم بەلایەنی دەرونی پەیوەندی خۆم دەگەڵ تۆدا داوەو ، لە ڕاستیدا هەمیشە باشترین لایەنی کەسایەتی خۆمم پێ نیشان داویت، بە جۆرێ کە هەرکاتێ بتەوێ دادپەروەرانە حوکم بدەی، بە هیچ جۆرێ ناتوانیت سەبارەت بە من هەست بە بێزاری بکەیت،و هەرکاتێ بە دروستی هەستەکانی خۆت شی بکەیتەوەو وردبکەیتەوە بۆت بە دیاردەکەوێ کە هەم هەستی بێزاریت لە مرتیەو هەم مەیلی دواترت سەبارەت بە من یەکسانن. هەستی یەکەمتان زادەو بەرەنجامی ئەوەیە کە میناکی هەرکیژێکی پابەند بە پرەنسیپە ئەخلاقیەکانەوە، دەزانیت چونکە لە رووی بەدەنیەوە مایلی (مرتیە)یت، ئەوا لە رووی ئەخلاقیەوە ئایندەیەکی ترسناك چاوەڕوانتە، بەڵام مە یلت بەلای مندا زادەو بەرەنجامی ئەوەیە کە ئایندەیەکی ئەخلاقی‌و خۆش لە بەردەم خۆتا دەبینی، بەڵام مەیلت بەرانبەر بە من هاوتای عەشقت بەرانبەر بە مرتیە، ناکاتەوە. دەبێ دان بەڕاستیەکاندا بنەیت. ئایا بەڕاستی (مرتیە)ت خۆش ویستووە؟ پەیوەندیتان گەییوەتە چ ئاستێك؟ ئایا دەستی ماچ کردوویت؟ لە خەوما ئەوم بینی کە وەکو ڤالرژان((٦)) لێوانی ماچ دەکردیت‌و لەپڕ بە واقی ورەوە لە خەو ڕاپەڕیم. ئەگەر ئەمە وابێ‌و تۆ دانی پێدا بنەیت زۆر خۆشحاڵ دەبم چونکە بەوە بارێکی قورس لەسەر دڵم لا دەبەیت. بەڵێ من ئاشق‌و دڵبەستەی

**تۆمو بۆیە هەمیشە لە نێوان ئەشقی ئاگرینو نەفرەتو بێزاری دا بەرانبەر بە تۆ لە مۆڵەقدام. زۆر لەم هەستی بێزارییە دەترسمو زۆر بەتوندی دژی دەوەستمەوە، تا بە تەواوەتی ئەم حاڵەتەم لێ نەڕەوێتەوە ئامادەنیم تۆ بدینم، چونکە دەبێتە مایەی بەدبەختی هەردووکمان. ئامادەم بەنرخترین دارایی خۆم لە پێناوی گەڕانەوەی ئەو متمانەو ڕێزو ئەشقە پاکەی کە لە سەرەتاوە سەبارەت بە تۆم هەبوو بەختبکەم، هیچ شتێك لەم دنیایەدا نیە کە یەکسەریو بە یەکجارەکی فەرامۆشی بکرێت. ڕەنگە ئەو متمانەیەی پێشوو بگەڕێتەوە، بەڵام ئەویش وەختی دەوێو تۆ بەو تەبیعەتو خووەوە کە هەتە ناتوانی لە هەنبەر زەماندا بەرگری بکەیت، یانی خۆڕاگرو کوڵنەدەر نیت، بۆیە دەترسم ئەشقو ڤیانی تۆ بۆ من کە حاڵی حازر، لە هەموو شتێکی ئەم دنیایە بە نرخترە، لە دەست بدەم. هەست دەکەم ئەم نامەیە زۆر ڤێزەونە، بەڵام وێڕای ئەوەش بێ ئەوەی پێیدا بچمەوە بە هەمان دەقەوە بۆتی دەنێرم تا من وەکو چۆن هەم بناسیتو لە هەمان کاتدا بزانیت چەند ناجسنو ناڕەسەنم. ئەم تەبعو تەبیعەتەی من زادەو بەرەنجامی یەك ملیۆن فاکتەرە. من کەسێکی ڕووبین نیم. توانای ڕووبینیو ڕواڵەتبازیم نیە. لەوەتای لە تۆ دابڕاوم کێشەو نەگبەتی بەرۆکم بەرنادەن. لەلایەکەوە لە ژێر چاودێری پۆلیسی خەفیەم((٧)). لەلایەکی ترەوە کتێبەکانم بە باشی نافرۆشرێن، بێ پارەم، ئەمە جگە لەو هەواڵە عەنتیکانەی کە دەربارەی تۆ لە مۆسکۆوە پێم دەگەن،و هێندەی دی باریان گران کردووم، لە کاتێکدا هیچ زانیارییەکم لەمەڕ خودی تۆ نیە،و لە هەموو ئەمەش خراتر هیچ کەسێك لێرە نیە کە دڵم پێی بکرێتەوە. تەحا کە ژیان لەم دنیادا غەمناكو درێوو ڤێزاوەرە. لە مۆسکۆدا پورە "ناڕەسەنەکەی" تۆم یان بەڕای خۆت "ئازیزترین" ئەندامی خانەوادەکەتان-م بینی، هەروەها ئایرنین- م بینی کە بەتەمایە دەگەڵ یەکێك لە کیژەکانی دولگروکوڤادا زەماوەند بکات. سڵاو لە هەموو کەسوکارت بکەو بمبورە لەوەی کە لەم نامەیەدا گوتوومە. هەنووکە خەریکی جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکانی تۆم لە نامەی داهاتودا وەڵامت دەدەمەوەو کتێبەکانت بۆ دەنێرم.((٨))**

***پەراوێز***

***١ - مەبەست لە نامەیەکی بەرواری ١٨٥٦/١/٢***

***٢ - مازا (masa) خوشکی تولستوی یە.***

***٣ - ڤولکنسکی، ئامۆزازای تولستوی یە.***

***٤ - ترامبلا (tremblai) یەکێك بووە لە شیرینیخانە بەناوبانگەکانی مۆسکۆ.***

***٥ - شرباچیڤا (scerbaceva) یەکێکە لە پورەکانی ئارسنوڤا.***

***٦ - ڤالرژان (valerjan)، مێردی خوشکی تولستوی یە.***

***٧ - تولستوی بە هۆی نووسینی مارشی سوپایی (وەکو چوارەمی ئاب) لەژێر چاودێری پۆلیسی خەفیەدا بوو.***

*٨- داوا لە تولستوی کرابوو، ئەو کتێبانەی کە پێویستن بۆ بەشداری لە تاقیکردنەوەی چوونە زانکۆی ماف بۆ برایەکەی ئارسنوڤا بکڕێت.*

## بۆ و. و. ئارسنوڤا
## پترزبۆرگ، ١٨٥٦/١١/٨

**ڤالریا فلادیمیروفنای ئازیز**، پوشکین دەڵێت "ئەوەی رۆیی ئیتر ناگەڕێتەوە."((١)) بەڵام لە منی بزانە نە هیچ شتێك دەڕوات و نە هیچ شتێك لە بیر دەچێ و فەرامۆش دەبێت. من هەرگیز ناتوانم ئەو هەستەی جارانم دەرهەق بە تۆ هەبێ: ئەو هەستی دڵبەستەیی، رێزو متمانەیەی کە بەر لەوەی بۆ ئاهەنگی تاجگوزاریەکە بڕۆیت، بە تۆم هەبوو. نا، ناتوانم ئەو هەستەم هەبێت. ئەوسا بەجۆش و خرۆشێکی تایبەتیەوە دەستەمۆی ئەو هەستە دەبووم، کەچی ئێستا لێی دەترسم. تۆزێ لەمەوپێش نامەیەکی دوورو درێژم بۆ نووسیت. لێ لە ناردنی ژێوان بوومەوە، بەڵام ڕۆژێ لە ڕۆژان پیشانتی دەدەم. ئەو نامەیە لە ژێر فاکتەری نەفرەت و بێزاری لە تۆ هاتبووە نووسین. بە ڕێزێك کە تۆ بە تەواوەتی نا ناسێت لە مۆسکۆوە بۆی دەگێڕامەوە کە تۆ دڵبەندو ئاشقی (مرتیە)یەی و هەموو ڕۆژێ دەچیتە دیدەنی و نامەو نامەکاریت دەگەڵیدا هەیە. ئەم قسانە زۆریان نارەحەت کردم و بەو پەڕی هێمنی و خوێنساردی بیرم لە زۆر مەسەلە کردەوە و بڕیاری نووسینی ئەو نامەیەم دا کە بۆتی نانێرم. چیرۆکی دڵبەندبوونی تۆ بە (مرتیە)وە بریتییە لە دڵبەندی ژنێکی مجێزساردو ناشی لە بواری ئاشقێندا، و مەسەلەی حەزکردنت لە من، هەردووکیان لە بنەڕەتدا یەکسانن، چیرۆکی یەکەم بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار کۆن بووە، بەڵام چیرۆکی دووەم هێشتا وەکو پێویستە، نەهاتووەتە دی. بە هەرحاڵ تۆ هێشتا ناتوانی هەست بە شکۆی ئەشق و ڤیان بکەی، بەڵام هەرکاتێ لە خۆت بپرسیت کام یەك لەو دوو هەستە حەقیقی ترو بەهێزتر بووە، بە مەرجێ راستگۆیانە داوەری بکەیت، دەیسەلمێنی کە هەستی یەکەم بەهێزتر بووە. تۆ سەبارەت بە ماشوق و دڵداری یەکەم فیداکاربوویت و لای خۆت و خەڵکانی دی ئیعترافت کردووە کە ئەوت خۆش ویستووە، بەڵام سەبارەت بە دڵداری دووەم کەمترین دڵسۆزی و فیداکاریت نەنواندووە. مەگەر تێپەڕبوونی ڕۆژگار چاری ئەمە بکات، ئەویش ڕۆژگارێکی دوورو درێژ. بەوپەڕی پەرۆشەوە چاوەڕوانی نامەێن تۆم. پەژارەیەکی فرە سەرو دڵی گرتووم، هەست بە خەمینی و بێ هێزی دەکەم، تاقەتی هیچ کارێکم نیەو لە هەموو شتێك بێزارم. تا دڵنیا نەبم کە خەیاڵ و فیکری ئەو پیاوە خوێڕی و بێ ئەقڵەت، بە تەواوەتی لە زەین و مێشك دەرچووەو هەمان متمانەی جارانم پێت پەیدا بووەتەوە، بە هیچ جۆرێ حەزناکەم بتبینم. پورە

ئازیزەکەی تۆو هەروەها ماکراسیاو دلگوکوڤام بینی کە بە تەمایە دەگەڵ ئایرنیندا زەماوەند بکات، بەڕاستی پێم سەیرە کە تۆ چۆن، دەتوانی لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا هەڵبکەی‌و بژیت. بۆچی نامەم بۆ نانێری، با نامەی توندی وەکو نامەکانی منیش بێ؟ بۆچی نامە نانێری؟ ڕاستە کوستنیکا((٢))، ڕەئی سەبارەت بە تۆ باش نیە. ڕاستت گەرەکە نەک هەر ڕەئی باش نیە، بەڵکو بە کەسێکی بەڕێزو حورمەتیشت نازانێ، وێڕای ئەمەش گەنجێکە لە ناخا، پاک‌و بێگەردە، و من تەسەوڕم نە دەکرد بەم ڕادەیە باش بێت. لەو دواییانەدا گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا هاتووە. دەقەکانی کتێبی پیرۆز گاڵتەنین، گاڵتەیان پێناکرێ، لەو دواییانەدا لە ڕێگەی خوێندنەوەو موتاڵای ئەم دەقانەوە گەییوەتە حەقیقەتێکی گەورە کە بریتیە لە بایەخ‌و گرینگی چاکەو چاکی. لە بیرتە زۆرجار لەمبارەیەوە هەندێ پرسیارم لێدەکردیت؟ سەرەنجام ڕۆژێ دێت کە تۆش پەی بە گرینگی ئەم بابەتە دەبەی. لێ مخابن ئەم حەقیقەتە گەورەیە تەنیا بە تەحەمولی ڕەنج‌و مەشەقەتان پەی پێ دەبرێ‌و دەست دەخرێت. ئەو لە ڕادەبەدەر بەدبەختی دیتووە، بەڵام تۆ هێشتا نەژیاوی، لەسەرەتای ژیاندایت‌و میناکی(وەکو) پێویست لە زەتت نەجەڕباندووە، ڕەنج‌و زەحمەتت نەکێشاوە. بەڵکو تەنیا خۆشت ڕابواردووە یان بە پێچەوانەوە داخ‌و کەسەرت هەڵکێشاوە. هەندێ کەس تەمەنێک بەسەر دەبەن بەبێئەوەی لەمانای لەزەت‌و ژان بکەن. هەڵبەتە مەبەستم لەزەت‌و ژان‌و سوێی ئەخلاقییە. پێموایە تۆش یەکێک بی لەو جۆرە کەسانە، بۆیە زۆر دڵم بە حاڵت دەسووتێ، جا بەوپەڕی ڕاشکاوی پێم بڵێ ئایا خۆت دەزانیت وایت یان نا؟ بە هەرحاڵ تۆ ئافرەتێکی ڕندو خشکۆک‌و لە ڕادەبەدەر دڵڕفێنی. بۆچی نامەم بۆ نانێری؟ ئەو شتەی کە بەتەما بووم دەربارەی ڕەوشی ژیانی خانم‌و ئاغای چراپوڤسکی بینووسم، ناینووسم تا لە کاردانەوەی تۆ، بە تایبەتی دوای ئەوەی نامەی دووەمی منت پێدەگات، ئاگادار نەبم. ڕاستت گەرەکە نهو زۆر کەمترو گەلێک ئارامتر لە جاران بیر لە تۆ دەکەمەوە، وێڕایی ئەمەش ئەوەندەی بیر لە تۆ دەکەمەوە بیر لە ژنانی دی ناکەمەوە. تکام وایە لە نامەکەتدا بەوپەڕی ڕاستگۆیی‌و ڕاشکاوی بەرسڤی ئەم پرسیارەم بدەوە: "تا چەندو چۆن بیر لە من دەکەیتەوە؟" هەستی من سەبارەت بە تۆ کە هاوتای ئەو هەستەم دەرهەق بە هیچ ژنێکی دی لە خۆدا نەبینیوە، بەمجۆرەیە هەر جارێ کە ڕووداوێکی ناخۆشم، چ بچووک‌و چ گەورە دێتە ڕێ، هەرساتێ کە عیزەتی نەفسم بریندار دەبێت یەکسەر سیمای تۆ دێتە بەرچاوم‌و لە دڵی خۆ دا دەڵێم: "ئەمانە هیچ نیە، گرینگ ئەوەیە دڵم بۆ خاتوونێک لێدەدا." بەڕاستی لەزەتێکی خۆشە. ژیانت چۆن دەگوزەرێ" ئایا کار دەکەی؟ مەعز بۆ ڕەزای خوا! نامەم بۆ بنێرە. کە باسی کاردەکەم گاڵتەت پێ نەیەت، پێم پێ نەکەنیت، کار کردن بە شێوەیەکی ئاقڵانەو سوود بەخش بە مەبەستی گەیشتنە ئامانجی باش، زۆر بەجێیە، جێگەی ڕێزو ستایشە، بەڵام کارکردن بۆ گەیشتن بە ئامانجێن زۆر بچووکی وەک لە ڕەندەدانی پارچە دارێک یان کارێن کەم بایەخی دیکەش، سوودی خۆی هەیە، چونکە مەرجی سەرەکی ژیانێکی ئابڕومەندانەو باش‌و گەیشتن بە بەختەوەری، کارکردنە. کارکردن کۆڵەکەی ژیانە. بۆ نموونە من ئەمڕۆ کارم

کردووه،و له ناخی دڵمەوە هەست بە ئاسودەیی و جۆرە لەزەتێك دەکەم و هەست بە چالاکی دەکەم. ئەمڕۆکە بە هیچ نرخێ ئامادەنیم نامەیەکی بە نێش و ئێشی وەکو ئەوەی کە دوێنێ بۆم نووسیت، بنووسم. ئەمڕۆ دەرهەق بەکاینات و سەبارەت بەتۆ، هەست بە لوتف و میهرەبانی و دلۆڤانیەکی ئەوتۆ دەکەم کە خۆزیا دەخوازم بە درێژایی تەمەن لێم نەبێتەوە. ئاها! خۆزگە دەت توانی پەی بە گرینگی و بایەخی ئایدیالێك ببەی، هەستی پێ بکەیت و وەکو پێویست لە پێناویا دەخەبتیت (خەباتت دەکرد). خۆزگە قەناعەتت دەکرد کە شادمانی ڕاستەقینە و جاویدانی لەبەر ڕۆشنایی سێ شتدا بە دەست دێ کە بریتین لە: کارو مەندی و بێ فیزی و ڤیان! من بە تەواوەتی ئاگام لەم حەقیقەتە هەیە و لە ناخی خۆما هەستی پێدەکەم بەڵام لە سالێکا دەتوانم ئەو پەڕی دوو سەعاتێك بە گوێرەی ئەو حەقیقەتە بژیم. بەڵام تۆ دەتوانی بەو تەبع و سروشتە پاك و بێگەردەی خۆتەوە ، بەوپەڕی نیازپاکی و فیداکاری مل بۆ ئەو بیرە بدەیت، بە هەمان دڵسۆزی و فیداکارییەوە، بە هەمان مەحەبەت و سۆزەوە کە بەرانبەر بە هاوڕەگەزانی خۆت، خەڵکانی وەکو خاتوو ڤرگانی دەینوێنی. هەرکاتێ دوو کەس لەم بیرەدا یەك بگرنەوە، بێگومان خۆیان لە باوەشی بەختەوەری ڕاستەقینەدا دەبیننەوە. خودا حافیز! ئەم حەقیقەتانە بەقسەی ڕووت نایەنە سەلماندن، بەڵکو خودای مەزن لە کات و ساتی خۆیدا لە بنیادەمی دەگەیەنێ. ڤالریای ئازیز ، مەسیح یارو یاوەرت بێ. من نازانم لەم دووە کامیانت پێشکەش کردووم: عەزابی ڕوحی یان لەزەت؟ بەڵام من لە مجۆرە هەڵوێستانەدا ئەوەندە سەتحیم کە بۆ هەردووکیان، چ ئەمیان و چ ئەویان هەر سوپاست دەکەم.

مەعز بۆ ڕەزای خوا هەموو ڕۆژێ نامەم بۆ بنوسە. یان ئەگەر بە پێویستی نازانی دەست بدەیتە قەڵەم یان هەرکاتێ ئارەزووت نەبوو نامەم بۆ بنووسیت، ئەوا تەنیا ئەم ڕستەیە بنووسەو بۆمی ڕەوانە بکە: ئەمڕۆ کە فلانە ڕۆژە تاقەتم نیە نامەت بۆ بنووسم. باوەڕبکە خۆشحاڵ دەبم. تۆبی ئەو خوایە با نامەکانت دەستکرد نەبن، پێیاندا مەچۆوەو دووبارە مەیان خوێنەوە. تۆ بیهێنە بەرچاوی خۆت ئایا پێت وانیە بتوانم ئەوەی کە دڵمدایە لە زۆر رووەوەو دەربارەی زۆر شت ڕتووشی بکەم و خۆنوێنی تیا بکەم؟ بەڵام من دەخوازم بەو پەوپەڕی ڕاستگۆیی و ئابڕومەندی بۆتۆی دەربڕم. تۆش پێویستە وا بکەیت. بە تایبەتی لەبەر ئەوەی کە ژنانێکی زۆرم ناسیون کە لە تۆ هۆشمەندتر بوون، لێ تا نهو هیچ ژنێکم نەدیوەکە بە ئەندازەی تۆ داوێنپاك و دروستکارو ڕاستگۆ بووبێ. ئەمە جگە لەوەی کە هۆش و هوشیاری زۆرو لە ڕادەبەدەر زۆر خۆش نیە، بەڵام پاکی و ڕاستگۆیی چەند زیاتر بێ جوانترو دڵگیرترە. تۆ بڕوانە من چەند لە خەمی تۆدام، بزانە چۆن فێرت دەکەم کە دڵی من بەلای خۆتا ڕاکێشێت. ڕاستت گەرەکە گرینگترین هەستی ئێستای من بەرانبەر بەتۆ ئەشق و ڤیان نیە، بەڵکو ئارەزوویەکی پرتین و تاوەو سەرانسەری بوونی داگیرکردووم. هەوڵبدە هەرچی زووترە نامەی درێژترو ڕاستگۆیانەترم بۆ بنووسیت.و خۆت بە ناوەڕۆك و ئەنجامی نامەکەوە خەریك مەکە، بەڵکو هەستی ئاسایی و سروشتی خۆت بخە سەر کاغەز. هەرکاتێ

**بتوانین بە ئەشقەوە کاربکەین، دەتوانین زۆر باشتر لەم دنیایەدا بژین، بە مەرجێ کار بۆ ئەو شتە بکەین کە خۆشمان دەوێ‌و ئەو کارەشمان خۆش بوێ کە دەیکەین.**
**زنیکای ئازیزو هەروەها پیندیگاسکی((٣)) توند لە هەمێز دەگرم‌و دەستی ئولگا فلادیمیروڤنا توند دەگوشم، بە ناتالیا پتروڤنا بڵێ کە ئۆ. تورگینوڤا نیازی زەماوەندی نەبوو. هەرکاتێ کە هەستت کرد ناتوانی گوزارشت لەو شتە بکەی کە دەتەوێ بۆمی بنووسیت، بە ئاماژەیەك ئاگادارم بکە. دەبێ بوێرانە هەموو مەسەلەکان روون بکەیتەوە. من زۆر شتم، لەوانە زۆر بابەتی ناپەسندم بۆ تۆ باسکردووەو نووسیوە، بەڵام تۆ هەرگیز شتی وات نەکردووە.**

***ل. تولستوی***

***پەراوێز:***

***١- ئەمە بەیتێکە لە کۆپلە شعرێکی پوشکین بەناوی قەرەجەکان***
***٢- کوستنیکا، مەبەست (k. a. jslavin)ە. تولستوی پاشان لە دەفتەری بیرەوەریەکانی دەورانی منداڵی خۆی دا، ئیسلاڤین- ی بە پیاوێکی بەرواڵەت قۆزی دڵگیر، بەڵام لە ڕادەبەدەر گەندەڵ وەسف کردووە.***
***٣- پیندیگاسکی (pindigaskiy) تولستوی براو خوشکە بچووکەکانی ئارسنوڤای بەوە ناوە ناو دەبرد.***

## بۆ و. و. ئارسنوڤا
## پترزبورگ، ١٢-١٨٥٦/١١/١٣

**خاتوونی ئازیز**
**هەست بە گەوجێتی دەکەم، بەڵام خۆم پێ ناگیرێت، هەرچەندە تاقە یەك نامەی یەك دێڕیم لە تۆوە پێنەگەییوە، کەچی دیسان دەستم داوەتە قەڵەم‌و نامە بۆ تۆ دەنووسم. دنیا نیوەشەوەو بەخۆت دەزانی مرۆڤ لەم کاتانەدا چەند ئامادەی دەربڕینی هەست‌و سۆزی خۆی‌و حەماقەتە. دەمەوێ دەربارەی رێڕەوی ئایندەی ژیانی چراپوڤسکییەکان((١)) قەڵەمڕانی بکەم. چونکە بتەوێ‌و نەتەوێ دەبێ لەم جیهانەی ئێستادا بژین. بنەماو پرەنسیپی ژیانی ژن‌و مێردێك بەندە بە دوو فاکتەرەوە: ١- خواست‌و ئارەزووەکانیان. ٢-**

دەرامـەتو دەسـکەوتەکانیان. جـا بابێینـە سـەر باسـی هـەردوو فاکتەرەکـە، چراپوفسـکی پیاوێکـە لـە بـارەی روحییـەوە فـەرتۆسو لەسـەر دەمـی لاویـدا گەوجیـەتی زۆری کـردووەو بەختـەوەریو شـادمانی باشـترین سـاڵانی تەمـەنی خـۆی بـەم شـێوەیە لـە پێنـاوی ئـەم حەماقاتانـەدا بـەخت کـردووە،و ئێسـتاکێ ڕێگـەی ژیـانو پیشـەی بنـەڕەتی خـۆی، یـانی ئەدەبیاتی دۆزیوەتەوە. لە ناخی دڵەوە لە تێکەڵبوونی کۆمەڵایـەتی بێزارەو ئاشقی ژیانێکی خانەوادەیی ئارامو پابەندی دابو پرەنسیپێن ئەخلاقییە.. لە دنیادا لە هیچ شتێك ناترسێت لەوە نەبێ کە ژیان لە چوار چێوەی تێکەڵبوونو پەیوەندیانی کۆمەڵایەتیدا بەفیڕۆ بدات. ئەو تێکـەڵیو پەیوەندییـەی کـە مـرۆڤ دەکـات بـە کۆیلـەی دابو نـەریتانو وای لێـدەکات کـە قـەرزاریاری هـەموو کەسـێك ببێـت. ئـەو باشـترین سـاڵانی تەمـەنی خـۆی بـە ختوخـۆڕایی لـە قەبـەڵی ئـەم هەڵـەو گەوجێتیانـە داوە، بۆیـە نابێ وا تەسـەوربکەی کـە ئـەم قسـانەی تـەنیا بـۆ چونێکی لامسەرلاییە، بەڵکو یەقینێکە لە ئەنجامی بەڵاو مەینەتیەکانی ژیانەوە پێـی گـەییوە، خـاتوو دمبیجکـای ئـازیز، خۆشبەختانە تـۆ هێشـتا گیرۆدەی ئـەم ڕەنجو ئازارانـە نـەبوویت. بەختـەوەری بـەلای ئـەوەوە بریتییـە لـە کـۆڕی سـەما، شـانو ملـی رووت، گالیسـکەی جـوانو بەشکۆ، زێروخشڵو جەواهێرات، ئاشنایی دەگەڵ وەزیرانو گزیرانو سکرتێران.. هتـد بـەڵام دەستی قەدەرو چارەنووس وای قەڵەم لێداوە کە چراپوڤیسکیو دمبیجکایا حـەز لـە یـەکتری بکەن. هەڵبەتە بە قسەی خۆیان، لەوانەشە درۆ دەگەڵ خۆیاندا بکەن. لێ لەم ساتەدا جارێکی دی ئیعترافت بۆ دەکەم کە فرە ئاشقو شەیدای تۆمو بـەمجۆرە ئـەم دوو کەسـە وێـڕای حـەزوو ئـارەزووە نـاکوكو هەڤدژەکانیان توانیویانـە یـەکتریان خـۆش بـوێ. لـەم حاڵـەدا دەبـێ چـۆن ژیانی هاوبەشی خۆیان ڕێکبخەن؟ لە هـەنگاوی یەکەمـدا دەبـێ بەرانبـەر بـە یـەکتر لێبـوردەبن، چاوپۆشـی لەیەکـدی بکـەن.و کامـەیان کـە ئـارەزوو و مەیلـەکانی لـە پرەنسـیپو بنـەما ئەخلاقیەکانەوە دوورترە دەبێ فیداکارییەکی فرەتر بنوێنێ. من ئامادەم هـەموو ژیـانی خـۆم لـە گونـدیدا بەسـەر بـەرمو سـێ کاربکـەم: یەکـەم ئاشـقێنی دەگـەڵ دەمبیجکایـاو دابینکردنـی شادمانی ئەو، دووەم ئەدەبیاتو سێیەم کشـتوکاڵ بـە گـوێرەی زەوقو سـەلیقەی خـۆم، یـانی ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی خۆم دەرهەق بە هەموو ئەو کەسوکارانەی پەیوەندی تایبـەتیان بـە منـەوە هەیـە. بـەڵام لێـرەدا خاڵێـك هەیـە کـە دڵـم کرمـێ دەکـات، ئـەویش ئەوەیـە کـە بـە پێچەوانەی حەزو ویستی خۆمەوە لەم سەردەمو قەڕنە دوا دەکەوم. خـاتوو دەمبیجکایا حـەز دەکات کە لە پترزبۆرگدا بژیو لە زستانێکا بەلای کەمەوە بچێتە سی کۆڕی سەما، لەماڵەکەی خۆیـدا میوانـداری دۆسـتو بنـاژۆ ئازیزەکـانی بکـاتو بـە گالیسـکەکە پیاسـەی کـەنارو کۆڕنیشـی روبـاری نیڤـسکی بکـات! معـەدەلی نێـوان ئـەم دوو جـۆرە ژیانـە بریتییـە لەمـەی کـە پێـنج هـەیڤ لـە پترزبۆرگـدا بـەبێ کـۆڕی سـەما، بـەبێ پیاسـەو گـەڕانی گالیسـکە، بـەبێ ئارایشتو خۆرازانەوەی نائاسایيو بەبێ لەسەر کردنـی تـۆڕی ئالینسـۆنو بـەبێ تێکـەڵاویو حەشرەلای (هەراو زەنا،قورو قەرەباڵغی) زۆر بژینو حەوت مانگەکەی دیکەی سـاڵ لـە دێهـات بژین، چراپوڤسکی لە موڵکەکانی خۆی دوو هـەزار رۆبڵـی زیـو دەرامـەتی دەبێـت – هەڵبەتـە

ئەمە لە کاتێکا وا دەبێ ئەگەر نەیەوێ وەکو خەڵکانی دی خوێنی گوندییانی نەگبەت میناکی زەروو (زالو) بمژێت – جگە لەمە دەتوانێ ساڵی نزیکەی دوو هەزار رۆبڵی زیو لە کارە ئەدەبیەکانی خۆی بەدەست بێنێ، بەڵام ئەمە یان زۆر مسۆگەر نییە، چونکە دوور نیە بخەرەڤێ یان بۆ نەگبەتی نەکارێت هیچ شتێك بنووسێت. خاتوو دەمبیجکایاش سفتەیەکی بیست هەزار رۆبڵی هەیە کە دەتوانێت هەشت سەد رۆبڵ قازانجی لێوەربگرێت، ئیدی بەمجۆرە ئەگەر رێرەوی وەزع و حاڵەکە بەدڵی خۆمان بچێتە پێشێ کۆی ئەم پارانە دەکاتە سێ هەزارو هەشت سەد رۆبڵ. ئایا تۆ دەزانی بەهای ئەم برە پارەیە لە پترزبۆرگدا چەندە؟ ئەم پارەیە لە پترزبۆرگدا بەشی پێنج هەیڤ دەکات ئەگەر لە قاتی پێنجەمدا بژیت، بە چوار ژوور قەناعەت بکەی، ئاشپەزی پیاو ڕانەگریت و بە ئاشپەزی ژن قەناعەت بکەیت، دەبێ بیرو خەیاڵی هەبوونی گالیسکەو تەنوورەی گرانبەهاو تۆڕی ئالینسون بە یەکجارەکی لەسەر خۆت دەربکەی و لە دووی کڵاوی شینباو نەبیت، چونکە ئەم جۆرە کڵاوانە دەگەڵ هەلومەرجەکەدا ناگونجێت. بەم وەزع و حاڵ و شتانەوە دەشێت لە تولا یان لە مۆسکۆ گوزەران بکەی و بژیت و هەروەها لە شەقامی لازاریڤچدا بەسەربەرزی رێ بکەیت. هەڵبەتە دەتوانی لە پترزبۆرگیشدا لە قاتی سێیەم بژیت و گالیسکەو تۆڕی ئالینسون– شت هەبێ، بەڵام لەم حاڵەدا دەبێ خۆت لە خاوەن قەرزو دوکانداران و گەدایان بدزیتەوەو بشاریتەوە،و دەبێ بۆ کوێخا بنووسیت هەر هەموو ئەو دەستورانەی کە بۆ سووککردنی باری قورسی گوندییان دەرکراون و دراون هەر هەمووی تورەهات بووەو بە پێچەوانەوە دەبێ خوێنیان بمژیت و ئەوسا بۆ گوند بگەڕێیتەوەو ساڵانێکی دوورو درێژ لە شەرمەزاری و سەرشۆڕیدا لە نێو جووتیاران و کشتیاراندا بژیت. ئا رێگەیەکی دیم وەبیردا هات، ئەویش بریتییە لە تەرتیب کردنی ژیانێکی سنووردار بەڵام ئابڕومەندانە لە قاتی پێنجەمدا، یانی بەو مانایەی کە هەموو پارەکەمان بۆ ئاسوودەیی ژیان، وەکو تەواوکردنی شتی ناو ماڵی قاتی پێنجەم و خەرجی ئاشپەزی پیاو و ئاشپەزی ژن و شەراب و ئەو جۆرە شتانە بکەین، بە مەرجێ کە دۆستان بە خۆشی و قەناعەتی تەواوەوە بۆ خوێندنەوەی کتێب و گوێگرتن لە مۆزیك و کۆنسێرت بۆ ئەم قاتە بێن نەك تەنیا بۆ رواڵەتبازی، کە هەموو خەمێکیان ئەوە بێت خۆیان بەسەر خزمەتکاران و گێل و نەزاناندا بنوێنن.

١١/١٢: خودا حافیز! دەچم دەخەوم، دەستە ناسکەکانت دەگوشم و هەموو بیرم لای تۆیە. سبەینێ ئەم نامەیە تەواو دەکەم. ئێستا لەبری ئەوە دەبێ لە دەفتەرە زەردەکەمدا هەندێ شتان بنووسم. هەڵبەتە ئەویش هەر پەیوەندی بە تۆوە هەیە، بە ڕاستی پیاوێکی شێتم.

١١/١٣: پاشماوەی ئەم نامەیە، جارێکی دی، دوای ئەوەی نامەی تۆم پێدەگات، تەواو دەکەم . هەنوکە بیرم بە هەندێ شتی ترەوە مژوڵە. بۆ دواجار دەنووسم چیتە؟ ئایا نەساغ و بێتاقەتی یان بە هۆی ئەو پەیوەندییەوە کە لە نێوانماندا چێبووە، و لەبەر شتێك شەرم لە من دەکەیت؟ هەرچییەك بووەو ڕوویداوە، بۆمی بنووسە. لە سەرەتادا لەبەر سۆزو گودازان دڵم دەهاتە کوڵ و جۆش، پاشان دووچاری تورەیی بووم و ئێستا هەست بەبێ موبالاتی و

خوێنساردی دەکەمو لەم ڕووەوە شوکرانە بژێری خوام. ماوەیەکە بە غەریزە بۆم دەرکەوتووە کە ئەم پەیوەندیانە جگە لە نەگبەتی چ بۆ تۆو چ بۆ خۆم هیچی لێنایەتە بەر، بۆیە باشتر وایە تا زووەو درەنگ نە بووە، دەستبەرداری یەکتر ببین. و بەرنامەی قەبوڵ کرن لە زانکۆی ماف((٢))-ت بۆ دەنێرم. هەموو زانیارییەکی پێویستی تیایە، کاتێ کە لە مانگی پێنج دا ناوی خۆت قەید کرد، دڵنیابە ئەو قەواڵەو بەڵگەنامانەی کە ماوەیەك لەوە پێش ناردوومن لە ئەنجوومەنی فێرگەکەدایە. لە بیرت نەچێت کە نیکولینسکا بۆ ئەوەی قەبوڵ بکرێ دەبێ خوێندنو نووسینی زمانی ئاڵمانی بزانێت، کە باوەڕ ناکەم ئەم زمانەی خوێندبێ. هەڵبەتە ئەو کەسەی کە ئەو دەناسێنێ دەبێ زەمانتنامەیەك پێشکەش بکات. کاتێ کە ئەشقم سەبارەت بەتۆ سەر دەکات، زۆرجار بەمن بێ بە پەلە بۆ لای تۆ بێمو ئەوەی لە دڵمدایە بۆتی هەڵڕێژم. بەڵام لە دەمانی میناکی نهودا(ئیستا) کە دەرهەق بە تۆ هەست بە ئازار دەکەمو خۆم سەبارەت بە تۆ تەواو خەمساردو بێ موبالات دەبینم، زیاتر حەزدەکەم بێمە دیدەنی تۆو ئەوەی بووە بە بار لەسەر دڵم هەڵی ڕێژمو بۆتی بسەلێنم کە ئێمە هەرگیز ناتوانین بیرو هەستی یەکتر بخوێنینەوەو دڵ بنەین بە یەکەوەو هەرکاتێ ئێمە یەکدی فریو بدەین، جگە لە خۆمان کەسی تر خەتابار نیە. بە هەرحاڵ تۆبی تو ڕۆحو گیانی باوکت، تۆبی تو موقەدەساتت راستگۆیانە رەفتارم دەگەڵ بکەو فریوی غەریزان مەخۆ..

خودا هەرچی چاکە ئەوەت بۆ بکات.

*دڵسۆزت*

*کۆنت. ل. تولستوی*

***پەراوێز***

[١] - ***چراپوڤسکی: ناوێکی خانەوادەیی گریمانەییە، کە تولستوی پێشوەختە بۆ ئەوەی هەڵبژارد بوو کە ئەگەر ئارسنوڤای خواستو خێزانیان پێکەوە نا، بیکات بەناوی خانەوادەیی خۆیان.***

[٢] - ***زانکۆی ماف: فێرگەی ئیمپراتۆری ماف کە لە ساڵی ١٨٣٥ کرایەوەو تەنیا ژمارەیەکی کەمی خوێندکاری هەرە باشی قەبوڵکرد.***

## پترزبۆرگ، ١٨٥٦/١١/١٧

لە دوانامەمدا کە گوتوومە سەبارەت بە تۆ هەست بەبێ موبالاتیو خەمساردی دەکەم درۆم نەکردووە. هەڵبەتە بێ موبالاتی تەواویش نەبووم، بەڵکو کەمتر بیرم لە تۆ دەکردەوەو هەستم بە تورەیی دەکرد،و ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوەیە کە زۆریش خەمساردو بێ موبالات نەبووم. خەتای هەموو ئەمە لە ئەستۆی ئەم پۆستە نەعلەتیەدایە. ئەمرۆ هەردوو نامەکەتم پێ گەیی. هەردووکیان راستگۆیانەو مەحەبەت ئامێزو بێ ڕتووش بوون. زۆر خاڵیان تیابوو کە خۆشحاڵیان کردمو هەندێ خاڵیشیان-م زۆر بە دڵ نەبوو، بەڵام لێرەدا ئاماژەیان بۆ ناکەم. دەبێ لە دوانامەو نامەی پێشوتریش بمبووری. چونکە هەردووکیانم لەژێر ئەنگێزەی هەستێکی منداڵانەدا نووسیوە کە ئێستا تەقریبەن لە زەینمدا سڕدراونەتەوە. ئەم نامانە لە ژێر گوشارو کاریگەریی تورەییدا نووسراون، بەڵام لە نێوەرۆکەکانیان ژێوان نیم. هەنوکە بەوپەڕی هێمنیو لۆژیکی بیر لە تۆ دەکەمەوە -گلەییم لێمەکە- هەمیشە وەکو کیژێکی نازەنین تەمەشام کردویتو مامەڵەم لەتەکدا کردویت،و بە دۆستایەتی تۆ شادمانم. هەندێجار هەق بە خۆم دەدەم بە ڤالرینکا ناوت بەرم. ئەگەر وا نەکەم خۆم بە گوناهکارو نا دروست دەزانم.. ئەگەر کاتێ بە پارچە موزیکێك بڵێم جوانو دڵگیرەو پاشان بڵێم زۆریش خۆشو دڵگیر نیە، زەرەر لە کەس نادەمو ناکەوێ. بەڵام هەرکاتێ بە تۆ بڵێم دۆستو خۆشەویستی منیت و درۆم کردبێتو تۆش باوەڕ بکەیت، باوەڕکردن بەم قسانە نە بە قازانجی تۆو نە بە قازانجی من نابێت. من رێزم بۆ قسەکانی تۆ هەیە، باوەڕکردن بەو قسانەی تۆ کە خۆتیش وەکو پێویست لە ماناکەیان تێ ناگەیت، بە قازانجی کەسمان نیە، خەریکە ستایشی قسەکانت دەکەم. جارێ باسی ئەم مەسەلانە بەسە. نها(ئیستا) کاتی ئەوە هاتووە پێت بڵێم چ بەشێکی نامەکانت بە تەواوەتی خۆشحاڵی کردووم؟ ئەم نامانە لە هەموو روویەکەوە منیان هێناوەتە جۆشو خرۆشو رێك ئەوەن کە چاوەڕانم دەکرد، یانی بێ پەردەو راستگۆیانەن. بەردەوام لەسەر ئەم شێوازە برۆ،و هەرگیز ئەو بیرو خەیاڵانەی بەمێشکتدا دێن مەشارەوە. ئەوەی کە پێمی دەڵێی زۆر باشتر تێی دەگەم لەوەی کە دەیشاریتەوەو نایڵێی. تۆ لە تەبعو تەبیعەتی پڕ گومانی من کە دیاردەیەکی خودیو خۆڕسك نیە، بەڵکو زادەی جۆرە پەروەردەیەکی تایبەتیە باش ئاگاداری. چاك بزانە کە هیچ شتێك بە خۆڕایی نادەنە بەشەر. هەرچەندە من شتەکان لە جیمبوت((١)) باشتر دەرك دەکەم. بەڵام هەستی من لە ئاستی هەستی ئەودا نیە. بەلای منەوە هەرچیەك لە دنیادا هەیە، لایەنی چاكو خەراپ، ئەرێنیو نەرێنی، پۆزەتیفو نێگەتیفی خۆی هەیە. گومانم لە هەموو کاینات هەیە جگە لەمەی کە چاك، چاکەو، تەنیا بە چەکی چاکی دەتوانی من بگریو ڕامم بکەی. هەرکاتێ مەسیح دەستور بدات کە من بخەنە سەر لێژنەدارێكو ئاگرم تێ بەردەن کفر دەکەم، بەڵام هەرگیز زات ناکەم بڵێم مەسیح چاك نیە. چاکی مەعنەوی، وەکو خۆشەویستی بەشەرو هاونەژادان، شیعر، جوانیو... تاقە شتێکە کە کەمترین گومانم دەربارەی نیەو هەرچەندە

کەمرین گومانم نییە وەهەرچەندە خۆم کاری پێناکەم بەڵام سەری ڕێزی بۆ دادەنەوێنم. بە بۆچوونی خۆم بۆیە بەلای تۆدا مایلم، چونکە تۆ پڕ بە قاڵبی تێگەیشتنی من لە چاکە، چاکیت، بەڵام تۆ تاقەتی ئەم فەلسەفەڕێسییەت نیە. هێرشی تۆ بۆ سەر پورە ئیرگولسکایا، بێ ئینسافییە. ئەمە ئەوە دەسەلمێنی کە تۆ گەنجێکی بێ ئەزموونیت و ناتوانی لە داوەریدا بێ لایەنی خۆت بپارێزیت. نارەحەتم بەوەی کە دەڵێی بەینتان ساردە. چەندین جار دڵنیام کردیت کە ئەو، تۆی خۆش گەرەکەو بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەو ساتەیە کە تۆ بە برازای خۆی بزانێت، بەر لەوەی بڕوات باسی چۆنیەتی پەیوەندی خۆمانم دەگەڵ کرد. پێمگوت پەیوەندیمان دۆستانەیە بەڵام هیچ جۆرە پەیمانداریەکمان لە بە یندا نیەو بەرەو ئەوە دەچم هەستەکانی خۆم تاقی بکەمەوە. جا زۆر لەوە نارەحەت بوو کە لە بری چوون بۆ کڵێسا، بۆ پترزبۆرگ دەرۆیشتم، گوتی: دیسان تاقیکردنەوەیە؟ بە هەرحاڵ ئەو چ تۆو چ منی زۆر خۆشدەوێ و هەرکاتێ بە پێچەوانەی پرەنسیپی ئەخلاق و ئابڕومەندییەوە سەبارەت بە تۆ رەفتار بکەم زۆر عاجزو پەست دەبێ. بە بۆچوون و باوەڕی ئەو هەرکاتێ پیاوێکی گەنج کیژێك بخاتە سەر کەڵکەڵەو سەودای ئەشق و ئاشقێنی و پاشان ئازاری بدات و وای لێبکات گومان لە پایەداری پیاو لەسەر ئەشق و ڤیان بکات، پیاوەکە لە سەرێتی بەوپەڕی تواناوە کار بۆ ڕەواندنەوەی خەیاڵە زێڕینەکانی کیژێ و کەمکردنەوەی ئەو جەزرەبەیە بکات کە لە پێشێتی. بەڵام دەبێ پەی بە سادەیی روحی ئەوو ئەو باوەڕە رۆمانتیکیانە بەرێ کە لە هەموو تەمەنیا دەربارەی ڤیان و لەخۆبردەیی و فیداکاری لە مێشکی خۆیدا کۆی کردووەتەوە. ئەو ژنێکی نازدارو نازەنینە، کەچی تۆ لە چاکەی ئەودا بە دەورو خولی ناتاشادا((٢)) دێیت و حەزت لێکردووە، ناتاشا کەسێکی بەدڵ و دەروونە بەڵام بێ ئاوەزوو کەللە پوتە. کەسایەتیەکی بچووك و خاپینۆك و بێ سەرو بەرەو هەر لەبەر ئەوە خوشیت پێیدا چووە چونکە ڕووبێن و زمانلوس و ڕیاکارە، حەزدەکەم هیچ جۆرە پەیوەندییەکت لەگەڵیا نەبێت. خۆشی و شادی ئێوە، خۆشی و شادی منە بەڵام بەس نیە، شەوانتان بە خۆڕایی لە دەست دەچێ. ئێوە خۆتان خاوەنی... – ئەم خاڵانە شوێنی ئەو خەسڵەت و سیفەتە جوانانەیە کە ئێستا لەزەینمدا بۆ تۆم ریز کردوون، لێ(بەڵام) نایانخەمە سەر کاغەز– لە شوێنێکدا ئاماژەت بە کتێبێکی زۆر خۆش کردووە کە خوێندوتەوە، چ شتێکت بەم هەموو لەزەتەوە خوێندووەتەوەو چی لێ حاڵی بوویت؟ زۆر حەزدەکەم بزانم. بە هەرحاڵ ئەم شتە کۆسپ و لەمپەر نیە کە بچی بۆ کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێی دێهاتیان. بە خۆت دەیبینی کە تاقیکردنەوە خۆشیەکی تایبەتی هەیە. بچۆو هەستی خۆتم لەو بارەیەوە بۆ بنووسە، من بە هیچ جۆرێ خۆم تاقی نەکردووەتەوەو هیچ ژنێکم نەدیتووەو بۆ هیچ شوێنێ نەرۆیشتووم و دەتوانم بە ویژدانی ئاسودەوە دڵنیات بکەم کە لە ماوەی ئەم سێ هەفتەیەی دواییدا هیچ ژنێك تەنانەت بۆ یەك دەمیش سەرنجی ڕانەکێشاوم. بەڵام لە هەموو ئەم ماوەیەدا بە جۆش و خرۆش و لەزەتێکی تایبەتیەوە خەریکی گرینگترین هەڤرك و ڕەقیبی تۆ، واتا ئەدەبیات بووم. چیرۆکێکی کورتم بۆ گۆڤاری کتێبخانە نووسیوەو خەریکم چیرۆکێکی دیکەش بۆ گۆڤاری

ساڵنامەی نیشتمان دەنووسم. شوقەیەکی بچووك، جوانو هێمنو ئارامم هەیە. پیانۆشی تیایە. قەڵەمەکەم هەمان قەڵەمی ئیڤان ئیڤانوڤیچە((٣)) کە جیرەجیری لە بەیانیەوە تا ئێواریٚ ئاسمانی ژوورەکەی پڕکردووە. دەمویست زیاترت لەمەڕ چۆنیەتی ژیانی چراپۆڤسکی بۆ بنووسم، پاشان ئەوەم بە بیردا هات کە تۆ خۆت دەتوانی پاشماوەکەی بنووسیتو تەواو بکەی. دەبیٚ چ بکەی؟ چۆنو لە کویٚ؟ بۆچوونی خۆمت لەمبارەیە بۆ دەنووسم. تۆ لە دەربڕینی بیروباوەڕی خۆت کۆمەکەوە، ئەگەر هەڵەش بکەیت مینـاکی هەر کەسێکی ئابڕومەندو پڕ سۆز لە رووی دڵپاکییەوە هەڵە دەکەیت. ترسی ئەوەم هەیە کە وێنەکەت بەم زووانە لە مۆسکۆوە نەگات. بە هەرحاڵ من دەستی ئەو کەسانەی کە منەتباریانم ماچ دەکەم. دەڵێم وێنەیەکم ئامادە بکەنو سبەینیٚ بۆتی ڕەوانە دەکەم. خودا حافیز! مەسیح ئاگادارتان بیٚ. زنیکا لە باوەش دەگوشم بەو مەرجەی کە ئەو لە زەینی خۆیدا، لە دڵی خۆیدا ڕێگەی ئەو کارەم بدات. لە وەڵامی ئەو چەند خاڵەی کە بە خەتی ناخویای (نا روون) خۆت نووسیوتە، لیٚ من لەبەر رۆشنایی وشەی ڤالریدا کە ئێستا بە تەواوەتی شارەزای بووم ،ماناکەیم دۆزییەوە، دەڵێم: "خۆزیا باوەڕکردەنی بوایە!"

حاڵم باشە.

ئەدرەسەکەم بەمجۆرەیە: گۆشەی مسکانسکایای گەورەو ڤوزنسنکا یا ماڵی بلومر خاتو ڤرگانی ئازیزو سیٚ جار نازەنین! دەربارەی ئەو مەسەلانەی کە خەمی منن، واتە سەلامەتیو ورەی خۆتم بۆ بنووسە. ئەو خەتە تێکەڵو پێکەڵو ناخویایە لەزەتێکی فرەی بە ئاغای چراپ... بەخشیوە، بە تایبەتی کە ئەم ئاغایە وا وێنا دەکات کە تۆ کەمێك لوتفت سەبارەت بەو هەیەو خانم د. چراپ باش دەناسیت. تکای لە تۆ ئەوەیە زیاتر باوەڕت بە پەیوەندیو ڤیانی پاکی ئەو هەبێت.

*ل. تولستوی.*

***پەراوێز:***

***١ - جیمبوت (gimbut): سەرپەرشتیارو چاودێری لێرەوارەکانی دەڤەری یاسنایا پولیانا بوو***

***٢ - ناتاشا: مەبەست ئوختونیسکایا، کە ژنێکی نەجیمزادە بوو،و دووچاری هەژاریو دەست کورتی بوو بووو لە ماڵی تولستوی دا دەژیا.***

***٣ - ئیڤان ئیڤانوڤیچ: سکرتێری تولستوی بوو.***

## بۆ و. و. ئارسنوڤا

## پترزبورگ، ١٨٥٦/١١/١٩

ئازیزم! مەمنونم کە نامەت بۆ ناردووم. سێ نامەتم پێ گەییوە، بەڵام وێنەکەتم پێ نەگەییوە. خەمت نەبێ هیچ کەسێك نە نامەکانتو نە وێنەکانت نابینێو هەرگیز ناتوانێ بیبینێ. ئەمە پێنجەمین نامەیە کە بۆتی دەنووسم. دوا نامەت لە ڕادەبەدەر ناڕەحەتی کردمو هەست بە شەرمەزاری دەکەم کە ئەزیەتم داویت. ئیدی چ بکەم؟ ئەمە زۆر باشترە لەوەی کە گومانو دوو دڵیەکانم وەشێرم. نها وەڵامی یەك بەیەکی ئەو خاڵانە دەدەمەوە کە باستکردوون.

١- دەربارەی کروڤسکی، داوەرییەکی باشت کردووە بەڵام داوەرییەکەت تەواو ڕاستگۆیانە نیە. تۆ لە دەرکی ئەم بیرەی من کە ئەو دەوڵەمەندەو تۆ هەژاریت، ترساویت. جا چونکە ئەو مامو باوەپیارەی(زڕباوك) تۆیە لەگینە وا وێنا بکات تۆ بە تەمابی پارەی لێبسەنی. ئەگەر من لە جیاتی تۆ بام بڕیاری بنجبڕم دەدا کە هەرگیز تاقە پولێکی لێ قەبوڵ نەکەمو ئەوجاش هەر کاتێ پێویستی کرد ڕێزو حورمەتی بگرم.

٢- دەڵێیت ئامادەیت هەموو شتێك لە پێناوی نامەیەکی مندا بکەیتە قوربانی. لە خودا دەپارێمەوە هەرگیز بیری وا نەکەیتەوە. نابێ ئەو جۆرە قسانەت بەزاردا بێت. ئەم "هەموو شتە" ئایا "داوێنپاکی"ش دەگرێتەوە کە ئەوە نەك نابێ بۆ پیاوێکی بێ سەروبەری میناکی من بکرێتە قوربانی بەڵکو بە هیچ شتێکی ئەم دنیایە نابێ بگۆڕدرێتەوە؟ لە مبارەیەوە باش بیربکەرەوە. بەبێ پابەندی تەواو بە پاکیو داوێن پاکییەوە مەحاڵە بتوانی لەم دنیایەدا بە باشی بژیت.

٣- عادەتی بێدار بوونەوەت لە شەودا، عادەتێکی باشو جوانە.

٤- بۆچی کۆمیدیاکەی ئەسترۆفسکی-ت بە دڵ نەبوو؟

٥- زیاد کردنی وشەی زنیجکا ناڕەوایە. ئایا ڕاستە کارت گەییوەتە ئەوەی کە پەناوەبەر فاڵچیو ئەو جۆرە گاڵتەبازاڕە بەریت؟ خۆت لە هەر هەموو ئەو هۆکارو ئەنگێزانەی کە بەرەو ئەو خۆشخەیاڵیو خەیاڵپرسیانەت دەبات دووربگرە، بە تایبەتی خۆت لە تەمەڵیو بێکاری بپارێزە. نەڵێی بە خۆڕایی وەختی گرانبەهای خۆمان لە دەست دەدەین. بە پێچەوانەوە هەردووکمان زندووینو ژیانمان لێوان لێوی سۆزێکی شیرینو جوانە کە دەبێ لە خودا بپارێینەوە لە ئایندەشدا ئەمجۆرە ژیانەمان بەنسیب بکات.

٦- ئازیزم! قەت بیرت لەوە کردووەتەوە کەسێك بە ئەندازەی بابت خۆشی نەویستبێ؟ وێڕای ئەوەش تۆ شایستەی خۆشەویستیو ڤیانێکی بە هێزترو بەرزتریو بۆیە ئەم ئەشقو ڤیانە بە دەست دێنی. ئیدی دنیاو کاری دنیا وایە.

٧- واز لە بیرۆکەی شێتانەی هاتن بۆ پترزبۆرگ بێنەو لە مبارەیەوە هیچ شتێکم بۆ مەنووسە. ئەگەر پارەت هەیەو لێت زیادە بڕۆ مانگێك لە مۆسکۆ بەسەر ببە. و ئەوسا دەتوانی سەرێکی پترزبۆرگ-ش بدەیت.

٨- مەعز بۆ ڕەزای خودا وا تەسەور نەکەیت کە من کەسێکی بێ کەمو کوڕی بم. بەم قسانە ناڕەحەت دەبم.

ئەگەر هۆشمەندم هونەرێکی گەورەم نەکردووە، خۆ لە پاڵ ئەوەدا دڵم تەژی بەغیلی و دوو دڵی و بەدگومانی و هەزارو یەك جۆرە کرێتی و پوخڵەواتە. تاقە شتێك كە لە مندا هەیەو مایەی خۆشویستن بێ، پاکی و بێگەردی هەستەکانمە. هەرگیز تۆم فریونەداوەو فریویشت نادەم، تۆ لە قوماشێکی تریت و تەبیعەت و سروشتێکی ناسك و جوانت هەیە، و گومان و دوو دڵی هەمیشە دڵتان ئازار دەدات. ئەگەر شتێك مایەی خۆشەویستی بێ خۆشتدەوێ، ئەگەر شتێکی قێزەون بدینی، بێزاری خۆت دەردەبڕی. تۆ پەی بە زۆر شت لەو شتانەی كە بە دڵی منن نابەیت، بەڵام منیش هەرگیز ناگەم بەو ئەشقە بەرزەی كە تۆ دەتوانی بیگەیتێ و بە دەستی بێنی "بەمەرجێ خۆت نەخەڵەتێنی." بەمجۆرە من ناتوانم خۆم بە شایستەی تۆ بزانم، تۆ، ئازیزەکەم هەرگیز نابێ ئەوە بڵێی كە شایستەی ئەشقی من نیت. من بەجدی خۆم بە شایستەی ئەم ئەشق و ڤیانە سەر ڕێژەی تۆ نازانم. بەڵام ئەم جیاوازی تەبع و خووەی من كە لە گۆڕان نایەت و خۆ ئەگەر بشگۆڕێت بەرەو خراپتر دەگۆڕێت، سەبارەت بە ئایندەمان نیگەرانم دەکات، بۆیە پێویستە لەسەر هەر یەکێکمان مل بۆ فیداکارییەك بدات! سەبارەت بە من بەشی هەرە زۆری حەزو کەڵکەڵەی ئەدەبی و هونەریم كە بە گرینگترین فاکتەرو کۆڵەکەی ژیانی من دەژمێردرێت، وێڕای ئەشق و ڤیانی تۆ، لە دەرێی بازنەی زەوق و حەزی تۆدا دەبێت، و تۆش دەبێ خۆت لەسەر ئەوە ڕابێنێ كە ئەو هەست و سۆزە زۆرەی بەسەر منیا دەبارێنی، بەرانبەرەکەی لە مندا نابینیتەوە. رەنگە لە هەرەتی جۆش و خرۆشاندا، هەستی من زۆر لە هەستی تۆ زیاتر بێت،و سوور بزانە ئاست و رادەی رێزو منەتباریم سەبارەت بە ئەشق و ڤیانی تۆ بۆ تاقە ساتێکیش کەم ناکات. ئەو فاکتەرەی كە دەشێت ئێمە وەکو شیرو شەکر ئاوێتە بکات، چاکییەکە من لەبەر رۆشنایی لۆژیکدا بە دەستم هێناوەو تۆ لە ڕێگەی دڵتەوە بە دەست هێناوە. جگە لەمە لە خودا دەپاڕێمەوە كە ئایندەمان بە هەمان شێوە بێت كە تۆ بە دەم پیاسەکردنەوە بە ناو هۆڵی ماڵەکەدا بەردەوام خەوی پێوە دەبینی، من بە زەبری ئەقڵ و لۆژیك تۆم گیرۆدەی ئەشقی خۆم کردووە. تۆ بە زەبری دڵی پاکی خۆت منت گیرۆدە کردووە. هەردووکیان هەوێن و ماکی چاکی و چاکەکارین و ئێمە بە هاوکاری یەکتر پەروەردەی دەکەین. تۆ من فێری خۆشەویستی دەکەیت و من فێری بیرکردنەوەو هزرینت دەکەم. چۆن دەبێ تۆ زەرورەتی کارو ڤیان بۆ ژیان، دەرك بکەیت، بەڵام پەی بە تەوازوع و نەفسشکێنی نەبەی؟ ئایا کار خۆی لە خۆیدا جۆرە تەوازوعێك نیە؟ ئەدی ڤیان و ئەشق؟ تۆ خۆت لە نامەیەکی پێش دوا نامەتدا نووسیووتە كە هەست دەکەیت لە رووی خۆپەرستییەوە منت خۆش ویستووە. زۆر ڕاستە، بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنەیت كە مانای ئەم رستەیە ئەوەیە كە لە ڕاستیدا منت خۆش نەویستووە. ناکرێ کەسێکت لەبەر رازیکردنی مەیل و لەزەتی خۆت خۆش بوێ، بەڵکو دەبێ لەبەر خاتری لەزەت و رازیکردنی مەیلی ماشوق، ئاشق ببی. بەڵام هەوڵدان بۆ ڕونکردنەوەو دەربڕینی ئەوەی لە ناخی دڵدا هەستی پێدەکەی چ سوودێکی هەیە؟ بێزەحمەت هەمیشە بە دوور و درێژی باسی سەرگەرمی و مەشغەڵەتەکانی خۆتم بۆ بنووسە، بڵێ چ کتێبانێك دەخوێنیتەوە، چ سەرگەرمیەکت هەیە و چەند سەعاتی بۆ تەرخان دەکەی؟ عەسران بە خۆڕایی لە دەست مەدە، تکا دەکەم کارێك بۆ خۆت بدۆزەوە، نەك هەر لەبەر

ئەوەی مژول بوون و سەرگەرمی زۆر بەسوودە، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە دەرفەتت بۆ دەڕەخسێنێ کە بەسەر سیفەتی دزێوو ناپەسندی تەمەڵیشدا زاڵ ببیت. لێرەدا هەڵوەستەیەکم کردو بە دوور و درێژی لە خوو تەبیعەتی تۆ ڕامام، عەیبی گەورەی تۆ لاوازی ئاکارو ڕەفتارە کە سەرچاوەی هەموو وردە عەیبەکانی ترە. هەوڵبدە ویست و ئیرادەی خۆت پەروەردە بکەیت. خۆت بەوە ڕابێنە کە دژی داب و نەریتانی ناپەسند بخەبتی. ئەگەر فێرکردنی زورنیکات(١) لە شان گرانە، هەوڵبدە کارێکی تر، کە بە دڵی خۆت بێ، ئەنجام بدە. بەبێ کار هیچ بە هیچ ناکرێ،و بە بێ کار مەحاڵە بگەیتە بەختەوەری. هەرجارێ هەواڵێکی تازەم دەربارەی پێشکەوتن و پێشڤەچوونەکانی خۆت بۆ بنووسیت لە خۆشیاندا هەڵدەپەڕم، لە پێستی خۆمدا ناهێورم. بۆ خاتری خودا بچۆرە گەشت و گەڕان و شەوان زوو بۆ ماڵ بگەڕێوەو ئاگات لە سەلامەتی خۆت بێ. زنیکا بۆی نووسیوم کە لاواز بوویت. هەواڵێکی ناخۆشە. من بە دڵنیایی بۆ مانگی یەك دەگەڕێمەوە. باوەڕبکە پڕ بە دڵ حەزدەکەم بێمە لای تۆو هەرگیز لێت دوور نەکەومەوە، چونکە ناتوانم لەو ڕووەوە درۆت دەگەڵ بکەم، تەنانەت ئەگەر بمەوێ درۆش بکەم ڕێك پێچەوانەکەی دەڵێم. بەر لە سێ ڕۆژ شەوێکم دەگەڵ ئۆلگا ئالکساندروڤنا تورگینارا بەسەر برد. کیژێکی خوێن شیرین و دڵپەسندە، بە دەستی خۆم نەبوو دەگەڵ کیژە خانمێکی دیکەدا کە ماوەیەکە دەیناسم، بەراوردم کرد. نەخێر، تا نها هیچ کیژێکی هاوتای کیژە ئاشنایەکەی خۆم نەدۆزیوەتەوە. کیژە ئاشنایەکەی من جوانترەو باشترین دڵی جیهانی هەیەو لە ڕووی ناسکیشەوە بالاترە. بەلام تورگینارا خوێنەوارترو کۆمەلایەتی ترەو حەزی لە شیعرەو لە شیعر دەگات. هەمیشە لە خۆم دەپرسم ئایا من ئاشقی تۆم یان نا؟ وەلامی خۆم دەدەمەوە نەء، لەگەڵ ئەمەشدا شتێك من بۆ لای تۆ ڕادەکێشێت و وام دێتە بەرچاو کە دەبێ زۆر لێکدی نزیك ببینەوەو باوەڕبکە هێشتا تۆ باشترین دۆستی منیت.

ئەمێستا جارێکی دی دەنووسمەوە خانم و ئاغای چراپوفسکی دەبێ چۆن بژین، کەل و پەل و ناو ماڵیان سنووردارو کەمە، و تەنیا لەبەر ڕۆشنایی کارو جۆرە لیهاتوویەك لە کاردا، کە مخابن ئاغای چراپوفسکی فڕی پێوە نیەو خانم چراپوفسکی- ش کەمێکی کەمی لێدەزانێ — زۆر بەجێیە کە ئەم لێهاتووییە بە گوێرەی توانا، لە خۆدا پەروەردە بکەن- دەتوانن پێنج هەیڤ لە شاراو حەوت مانگ لە دێهاتدا ژیانێکی هەژارانە، لێ(بەلام) ئابڕومەندانە بۆ خۆ دابین بکەن. دەتوانن پێنج مانگی زستان، ساڵێك لە هەندەران، ساڵێك لە پترزبۆرگ و ساڵێکی دی لە هەندەران و... بەسەر بەرن. دەبێ بە هەر نرخێ بووە مودەتێك لە پترزبۆرگ یان لە هەندەران بژین تا لە زەمان و سەردەمی خۆیان دوانەکەون و بە دێهاتی نەژمێردرێن، چونکە دێهاتی بوون و بە دێهاتی مانەوە خۆی لە خۆیدا جۆرە نەگبەتیەکە.

مەبەست لە دواکەوتن لەسەردەم و زەمانی خۆت. ئەوە نیە کە ئاگادار نەبیت چ مۆدێکی کلاوو ئێلەکان لە ڕەواجدایەو برەوی پەیدا کردووە، بەڵکو دواکەوتن ئەوەیە کە نەزانی چ کتێبێك — ی تازە بلاوبووەتەوە، لە ئەوروپادا چ باسە، بیروباوەڕی نوێ دەربارەی خۆ پارێزی لە کڕین و فرۆشتنی مرۆڤان و دزینی پارووە نانی دێهاتی چیە، چونکە هەر خوێندکارێکی ئەمڕۆ بگری

دەزانێ کە ئەم جۆرە کارە مایەی شەرمەزارییە. لە پترزبۆرگدا خانمو ئاغای چراپوڤسکی تەنانەت بەبێ تێکەڵبوونی کۆمەڵایەتیش دەتوانن چەند ئاشنایەکی کەمو دیاریکراویان هەبێ، ئەم ئاشنایانە نابێ لە نێو ئەو خەڵکانەدا هەڵبژێردرێن کە تەنیا ڕواڵەتیان بەرچاویەو، وەکو سەگی پێ سووتاو بەرەڵلای کوچەو کۆڵانن، بەڵکو دەبێ لە نێو خەڵکانی فامیدەو بە ئەدەبو پاکو بێگەردا بێنە هەڵبژاردن. ئەم هەڵبژاردنە، بە تایبەتی لەلایەن خانم چراپوفسکییەوە دەبێ ڕەچاو بکرێت، چونکە ئەو بە حوکمی گەنجێتیو جەوانی خۆی حەزدەکات ئەوەندەی لە توانادا بێ خەڵکانی زۆرتر بناسێتو هیچ مەرجێکی بۆ ئاشناو دۆستانی تازە نیە جگە لەوەی پیاوانی ئاسایی بنو شوێنەواری گەوجایەتی تەواویان بە سیماو تەوێڵەوە دیار نەبێت. بەڵام ئاغای چراپوڤسکی بەپێچەوانەوە دڵنیایە ئەم سووکە مەرجانە بەس نیە، بەڵکو دەبێ لە هەڵبژاردنی دۆستو ئاشنای تازەدا ئەوپەڕی جدیەتو پارێز ڕەچاو بکرێت، چونکە ئەگەر لە فەرزێکا ئاشنایەتی دەگەڵ کەسێکی بێ قەدرو قیمەتا، زەرەرێکیشی نەبێت، ئەوا بێگومان ئاشنایەتیو دۆستایەتی دەگەڵ سی کەسی لەو بابەتە کەسانەدا ئەگەر زیانێکی زۆریشی نەبێت، زیانی گشتی نەبێ، ئەوا بەلای کەمەوە ئازادیو ئیسراحەت لە مرۆڤ دەستێنێو هەڵدەگرێتو ژیانی لێ تاڵ دەکات.

ئەمە جگە لەوەی ئاغای چراپوڤسکی لەبەر ڕۆشنایی ئەدەبیاتو گفتوگۆ دەگەڵ خانم چراپوڤسکی ئازیزدا، و هەروەها خانم چراپوڤسکی لە سایەی موزیک لەلایەکو تێکەڵبوونی دەگەڵ ئاغای چراپوڤسکی لەلایەکی ترەوە هەرگیز لە ماڵەوە بێزارو بێتاقەت نابن. چراپوڤسکییەکان، هەموو دەرامەتێکیان ڕوو لە زیادی دەکات ،و بۆ ڕازانەوەو جوانکردنی ماڵەکەیانو ڕازانەوەی ژوورەکان، کڕینی تابلۆ، مۆزیکا، خواردنو خواردنەوەی باش بە جۆرێ تەرخانی دەکەن کە ماڵەکەیان لە هەر شوێنێکی دیکە جوانترو دڵگیرتر بێت،و دیارە بەڕێوەبردنی کاروباری ماڵەکەش لە عۆیەی خانم چراپوفسکی دا دەبێت. لە کاتی چوونە پترزبورگو هەندەران، چراپوفسکیو خانم کەمتر یەکدی دەبینن، چونکە کۆڕو کۆبوونەوەو سەرقاڵی، لێکدیان دادەبڕێت، لەبەر ئەوە زوو زوو یەکتر نابینن. بەڵام کاتێ کە لە دێهات جێگیر دەبن، چونکە هەوڵدەدەن هاتووچۆی هیچ کەسێکی بێگانە نەکەن، دەتوانن بە تەواوەتی لێکدی تێر بن. سەبارەت بە کاروباری ماڵەکە هیچ جۆرە ناکۆکیەکیان ناکەوێتە بەین، چونکە هەرکەسەو بە کاری خۆیەوە مژوڵ دەبێت. ئەمە بە مەسەلەی هەرە گرینگی ژیانیان دەژمێردرێت. ئاغای چراپوفسکی هەوڵدەدات ئاواتە دێرینەکەی خۆی بێنێتە دیو خانم چراپوفسکی- ش هەوڵدەدات بە هەموو هێزو توانای خۆیەوە لەم کارەدا پشتیوانی لێبکاتو هانی بدات. ئەم ئارەزووە دێرینە دەکاتە هەوڵو کۆشش لە پێناوی دابینکردنی ئەو پەڕی شادمانی بۆ دێهاتیەکانی خۆی. جگە لەمەش ئاغای چراپوفسکی نووسەرایەتی دەکات، کاری نووسین دەکات، کتێبان دەخوێنێتەوە، دەکەوێتە توێژینەوەو مۆتالا،و دەرس بە خانم چراپوفسکی دەڵێتەوەو "بەنازی دڵم" گازی دەکات. خانم چراپوفسکی خەریکی مۆسیقاو ئەدەبیات دەبێتو بەشداری لە جێبەجێکردنی نەخشەکانی مێردەکەی دا دەکاتو لە ئەنجامدانی ئەرکە سەرەکیەکەیدا یارمەتی دەدا. نها وەکو

فریشتەیەکی بچووك لە بەرچاوی گوندییەکاندا بەرجەستەی دەکەم کە جلێکی سادەو ئاسایی لەبەر کردووەو بە زوڵفانی سوورەوە هەموو رۆژێ دەچێتە دیدەنی دێهاتیەکانو لە کوختەکانی خۆیاندا سەریان دەداتو هەموو رۆژێ دوای ئەنجامدانی کارێکی باش بۆ ماڵ دەگەڕێتەوە، بەوپەڕی دڵخۆشیو ئارامی لە خەو ڕادەبێتو(هەڵدەستێت) خودا خودایەتی رۆژ ببێتەوەو سەر لە نوێ دەست بە ژیانو چاکە کردن بکاتەوە، بۆیە ئاغای چراپوفسکی لە جاران زیاترو لە ڕادەبەدەر دەی پەرستێت. ئەوسا جارێکی دی بۆ شار دەڕۆنەوەو ژیانی مامناوەندی، بەڵام پڕ کاری خۆیان کە لە هەژاریو ڕەنجو ئازاریش بە دەرنابێت دەست پێدەکەنەوە. بەڵام چونکە دڵنیان لەوەی کە خەڵکانێکی ئابڕوومەندو پاك سروشتنو بە هەموو تینو تاوێکەوە یەکتریان خۆش دەوێو دۆستو ئاشنایانی دڵۆڤانیان هەیە، هەر یەکەیان بەوپەڕی ئاسودەییەوە خەریکی کاری خۆ دەبێ. لەوەیە هەندێجار وا ڕێکبکەوێ کاتێ کە بە کۆنە گالیسکەیەکی کرێ لە دیدەنی دۆستێکی متەوازیع بۆ ماڵ دەگەڕێنەوە، بە نزیکی ماڵێکی ڕازاوەی پڕ روناکی دا تێ بپەڕن کە خەڵکی لەوێدا بێ خەمو خەیاڵ لەسەر نەزمی ئاهەنگی ڤاڵسی شتراوس خەریکی سەماو رەقسین بن، لەم حاڵەدا خانم چراپوفسکی ئاهێکی قووڵ هەڵدەکێشێتو لەفکران ڕادەچێت. بەڵام پێویستە هەر لە ئێستاوە خۆی بە تەواوەتی بەم بیرە ڕابێنێ کە هەرگیز ئەو جۆرە حەسرەتو داخە ناخوات. بە پێچەوانەوە زۆر دڵنیا دەبێت کە زۆربەی ئەوانەی بۆ ئەم کۆڕی دانسە دەعوەت کراونو ئەو بەغیلیان پێدەبات یان لەوەیە هەر هەموویان لەو لەزەتی پاکییە بێ بەشو مەحروم بن کە ئەو بە دەستی هێناوە، وەکو ئەشقو ڤیانی ئارامو بێ سەر یەشە، خۆشەویستیی بێگەرد، جوانیو جەلالی ژیانی خانەوادەیی، ژمارەیەکی دیاریکراو لە دۆستانی ڕاستگۆ، شیعر، مۆزیكو لە هەموو ئەو لەزەتانەش زیاتر، لەزەتی بەجدی ژیان لەم جیهانە، لەزەتی چاکەکردنو لەزەتی ئاسودەیی ویژدان. هەرکەسەو عەودالی لەزەتێن تایبەتی خۆیەتی، بەڵام باڵاترین لەزەت کە مرۆڤ بتوانێ لە تەمەنی خۆیدا بیگاتێ لەزەتی چاکەکاریو ئەشقو ڤیانی پاكو شیعرو هونەرە. جا چونکە خانمو ئاغای چراپوفسکی ئەم ڕێگەیەیان هەڵبژاردووە، پێویستە باوەڕی تەواویان هەبێ کە ئەم ڕێگەیە باشترین ڕێگەیەو نابێ ڕێگەیەکی دی بگرنە بەرو پێویستیە پشتیوانی یەکدی بکەنو ئەو چاڵو قۆرتانەی کە لە گۆشەو کەنارانداا هەن بە یەکدی نیشان بدەنو بە کۆمەکی مەزەب کە هەمیشە هەمان ڕێگە بە رۆڵەکانی تیرەی بەشەر نیشان دەدات، هەوڵبدەن هەرگیز ئەم راستە ڕێیە بەرنەدەن، چونکە بچووکترین هەنگاوی هەڵە هەموو شتێك بە بادا دەداتو ئیدی دۆزینەوەی بەختەوەری لە دەست چوو مە یسەر نابێت. مخابن ئەگەری ئەم هەنگاونانە هەڵانە زۆرە کە دەکرێ هەندێکیان بژمێرین: نازو غەمزەو عیشوەگەریو دلبەری کە ئاکامەکەی بێ متمانەییو بەغیلیو حەسوودیو نەفرەتو بێزارییە. حەسودیو غیرەی خۆڕایی، پێداگرتنو مکوڕ بوون لەسەر شتی بچووكو هیچ کە ڤیانو متمانە لەق دەکات، پەنهانکاری کە دەبێتە مایەی بەدگومانی، بێکاریو دەست بە تاڵی کە مایەی بێزاریی هەردوو لایەن، توڕەیی کە دەبێتە مایەی قسانی ناشیرینو نابەجێو ژنو مێرد دەکات بە دوو منداڵی گڕو گری وڕکن، بێ سەروبەریو خەمساردی لە جێبەجێکردنی نەخشەو بەرنامەدا، و بە تایبەتی گوێنەدان بە بە باری داراییو

دەست بڵاوی و کە هەموو کارەکان لاسەنگ دەکات و ورە دەروخێنێ و نەخشەو بەرنامان دەسڕێتەوەو بە تەواوەتی ئاسودەیی و ئارامی لە بەین دەبات و دەبێتە مایەی ڕەنج و ئازاری بەرانبەرەکەت و هەنگێ دەبێ هەر بڵێی ئەم نانە بەو ڕۆنە.

جادەیەکی سەخت و دژوارە، لێ لە هەمان کاتدا جوانەو تاقە ڕێگە یە بۆ گەییشتن بە بەختەوەری. کەواتە ئەوە دێنێ کە بە خۆماندا ڕابگەین و هەر هەموو ئەو هۆکارو سۆنگانەی کە لەسەری ڕا ئاماژەم کردنێ و دەبنە مایەی هەنگاونانی هەڵە، ببەزێنین.

هەرکاتێ بڕینی ئەم ڕێگایە، زۆر سەخت و دژوار هاتە بەرچاو، ئامۆژگاری چراپوفسکییەکان دەکەم ئەم ڕێگەیەی خوارەوە بگرنەبەر: لە پترزبۆرگدا بژین و لە جیاتی قاتی چوارەم لە قاتی یەکەم یان دووەمدا دانیشن و سی دەست جلك بۆ خانم چراپوفسکی بکڕن، لە هەر هەموو کۆڕو ئاهەنگەکانی سەماو ڕەقسیندا بە شداری بکەن، هەموو جۆرە کۆڕێکی ڕەقس و سەما بسازێنن، هەموو جەنەڕاڵ و ئاجودانەکان بۆ ماڵی خۆ دەعوەت بکەن، و لەم رووەوە بە خۆ بنازن، بە گالیسکەی خسوسی خۆیان هەموو ڕۆژێ بە کەناری روباری نوسکیدا پیاسە بکەن. جگە لەمانە ئامۆژگاری خانم چراپوفسکی دەکەم بکەوێتە عیشوەگەری و دلبەری و دڵچەڕێنی، و بە ئاغای چراپوفسکی–ش دەڵێم دەستبەرداری قومار نەبێت و بەمجۆرە ناچارین دوای ماوەیەکی کەم لە دەستی خودان قەرزان هەڵێن و پەنا بۆ گوندی بەرن و لەوێندەر بێزارو بێتاقەت مۆڕە لە یەکدی بکەن... بڕینی ئەم ڕێگایە زۆر ئاسانە. ئەوەندە بەسە مرۆڤ هیچ هەوڵێکی چاککردنی خۆی نەدات . ئیدی گشت ئەم بویەرو پێشهاتانە خۆبەخۆ چێدەبن. خانم و ئاغای چراپوڤسکی هەرکە جادەی یەکەم گوم بکەن، بە ئاسانی دەچنە سەر جادەی دووەم و دەتوانم بڵێم چوونە سەر جادەی دووەم شتێکی بەڵگە نەویستە، چونکە ئاغای چراپوڤسکی پیاوێك نیە ئەهلی کار بێ،و خانم چراپوڤسکی– ش کەسێکی بە ئیرادەو زاکون نابێت. بەڵام ڕێگەی یەکەم دەبێتە مایەی وەدی هاتنی خەونانی جوان و پڕ شادمانی! خۆ ئەگەر ئێستا لە سوچی هۆڵێکی (سوداکوڤۆدا) دانیشتبام زۆر شتم بۆ دەگێڕایتەوە. بە هەرحاڵ هیوادارم تۆ خۆت بە تەنیا پەی بە جوانی ئەم خەونە ببەی. ئەگەر ئەمەت کرد، خاڵێك هەیە لە بیری مەکە — من پاش بیرکردنەوەیەکی جدی و لە ئەزموونی ژیانەوە قسان دەکەم– ئەویش ئەوەیە کە ڕێگەیەکی مامناوەندی نیە، بۆیە دەبێ لە نێوان ڕێگەی یەکەم و ڕێگەی دووەمدا بە ناچاری یەکێکیان هەڵبژێری. بەوپەڕی جدی ڕێگەی یەکەم هەڵبژێرەو هەر ڕۆژو هەر ساتێك خۆت بەوە تەڵقین بدە کە دەبێ ئەم ڕێگەیە بگریتەبەر، دەنا بەبێ ئەوەی لە دەستی خۆتا بێ دەکەویتە سەر ڕێگای دووەم، واتە دەکەویتە هەمان زەلکاوو زۆنگاوەوە کە هەمیشە لە هەزار کەسا، نۆ سەدو نەوەدو نۆ کەسی تێدەکەوێ و لە قوڕاوو سیاناودا دەچەقن. ئەم نامەیە زۆری درێژە کێشا، کاتەکەم زیاتر بە بیرکردنەوەو هزرینەوە تێپەڕی تا نووسین. نهو سەعات دووی پاش نیوەشەوە. دەربارەی خۆم، حاڵم باشەو مژولی کارم — چ کارێك؟ تۆ هێشتا سەر لەم جۆرە کارانە دەرناکەی– کەمترین خەڵك دەبینم و زۆر کەم دەچمە دیدەنی خەڵکی و تا کۆتایی مانگی دوانزە ئەم حاڵە بەردەوام دەبێت. تا ئێستا نەمتوانیوە وێنەیەکی خۆم بگرم. خەمت نەبێ یەکسەر دەیگرم. خودا حافیز نازەنینم! بە

**پـەروەردەکردنی کەسـایەتی خـۆت ڕابگـە. یـەك دڵ و یـەك ڕێ بـە. ورەت بـەرز بـێ. بخوێنـەوەو هەمیشە خۆشت بوێم لـێ بە تـۆزە ئارامیـەکی زیـاترەوە. بوونی تـۆو خۆشەویسـتی تۆ بە جـۆرێ دڵی تەژی(پڕ) بەختەوەری کردووم کە ئەگەر لە پڕێکا بڵێی ئیتر خۆشم ناوێی نازانم چیم بەسـەر دێت؟ بۆ خاتری خوا نەکەی شتی وا تاقی بکەیتەوە.**

**زنیکا لـە هـەمێز دەگوشـم. دەسـتی ئالینکا دەگوشـم. پێیـەکانی ناتاشـا-ش مـاچ دەکـەم. ئیڤان ئیڤانوڤیچ دوێنـێ شـەو چـوو بـووە تەمەشـای (ئوگونـۆتی(٢))، بـەڵام زۆری بـە دڵ نـەبوو، کەچـی ئالسکا دەیگوت زۆر باش بوو.**

**خەتای ئیڤان ئیڤانوڤیچی دۆستی تۆیە کە کتێبەکان دە ڕۆژێك درەنگ گەییونەتە دەستت. لە نێو چیرۆکەکانی نۆرگینیفدا چیرۆکی کابرای جولەکە، وتیوسکوف مەخوێنەوە چونکە بۆ کیژان بـاش نین. ئەوانەی کە حەزدەکەم بیانخوێنیتەوە بریتین لە ئاندرێ کولوسف، سستی،و دوو دۆسـت، لـە کتێبـانی ئینگلیـزیش دا حەزدەکـەم بـە تایبـەتی دوو کتێبـان دەسـت نیشـان بکـەم یـەکێکیان نیکـولاس نیکلبییـە(٣) ئـەویتریان بـازاڕی مـەکارەی خۆنـوێنی(٤)یـە، یـەکێکیان سمیگـاروف(٥) وەیخـوێنیو ئـەویتریان زورزنیکـا بیخوێنێتـەوە. دوای ئـەوەی چـیرۆکەکەی (تورگینیـف)ت خوێندەوە بۆ پوریێی بنێرە، ئەو "سۆناتە(٦)"یەی کە دەربارەی چیرۆکەکە بۆم نووسیویت قورس نیە. بە بۆچوونی من شیعرەکانی جوانە. زۆرم حەزلێیە نامەی ترت بۆ بنووسم، زۆر شتم پێیە کە پێتی بڵێم، لێ بە گومانم،و چاوەڕوانی هـەواڵی تۆشم ئایا ڕاستە بە تـەمای شـوو بـە گرومـوڤ(٧) بکەی؟ ئەگەر ئەمە ڕاست بێ ڕێك لـە چیرۆکێکی فەرەنسـی دەچێت. ئـەمڕۆ لـە دوڕیـانی شـەقامی مسکانسکایای گەورەو قۆزنسنکایادا، بلۆکی بلومری ژمارە ١٤دا شوقەیەکم گرت. ئەگـەر حـەز دەکەی بزانیت بیرکردنەوەم دەربارەی تۆ چۆنە، مخابن دەبێ ئەوەت پێ بڵێم کە دوای سـەفەرم لـە مۆسکۆ، تۆزێك سـارد بـوو بوومـەوە، بـەڵام نهـا جارێکی دی روو لـە گـەرم بوونـە، تکایـە نامـەم بۆ بنێرە،** ***بۆچی نامە نانووسیت؟ خودا حافیز خاتوونی ئازیز. مەسیح یارو یاوەرت بێ!.***

***کۆنت لیون تولستوی***

***پەراوێز:***

***١ - زورنیکـا، نـاوی میللـی یـەکێك لـە خوشـکەکانی ئارسـنوڤایە بـە نێـوی ئیڤگینیـژا (Evgenija).***

***٢ - ئوگونوتی، تولستوی لێرەدا ئاماژەی بۆ ئۆپرای "ئوگونی" لە دانانی میئیربیر کردووە.***

***٣ - نیکولاس نیکلبی: ڕۆمانی چارلز دیکنزە.***

***٤ - بازاڕی مەکارەی خۆنوێنی: چیرۆکی ویلیام تاکرییە.***

***٥ - سمیگاروف: ناوی برایەکی بچووکی ئارسنوڤایە.***

***٦ - سوناتە: مەبەست پارچە موسیقایە.***

*٧- گرومۆڤ: ئەندازیاری تەلارکاری دەڤەری تولایە.*

## بۆ و. و. ئارسنوڤا
## پترزبۆرگ، ٢٣/ ١٨٥٦/١١/٢٤

ئا ئێستا نامە پڕ جۆش، جوانو سەرنج راکێشەکەی ١١/١٥ی تۆم پێ گەیی. "ئازیزی دڵەکەم!" گلەییم لێ مەکە کە لە نامەکانمدا بەو ناوە دەتدوێنم، چونکە ئەم وشەیە پڕ بە پێستی ئەو هەستو سۆزەیە کە بەرانبەر بە تۆ هەمە. بەڵێ "ئازیزی دڵەکەم" زۆر جار بە دەم دواندنی تۆوە حەزم کردووە لە بری هەر ناوێکی دی بەو ناوەوە بانگت بکەم. دەمەوێ ئەم نامەیە لە کورتی ببڕمەوە ، ئەگەر قەڵەم جڵەوم لە دەست نەسەنێ. دنیایەك کاری بەپەلەو دژوارم هەیە کە چەندین شەوە خەویان لە چاوانم تاراندووە. بەخۆت دەزانی کە بەڵێنم داوە لە ساڵی ١٨٥٧ەوە بەرهەمەکانم تەنیا لە گۆڤاری سەردەمدا بڵاوبکەمەوە، بەڵام ئێستا قەولم داوە چیرۆکێك بە دروزنینو بابەتێکیش بە کرایوسکی بدەم بۆ گۆڤاری مێژووی نیشتمان، و دەبێ تا ١٢/١ ئەم کارانە تەواوبکەم. بە هەر زەحمەتێك بووە چیرۆکێکی(١) کورتم بۆ دروزنین نووسی، بەڵام ئەو بابەتەی کە بۆ کرایوسکی-م نووسیوە بە ڕای خۆم باش نیەو زۆر لێی ڕازی نیم. هەستدەکەم دەبێ دەستکاری بکەمو پێیدا بچمەوە، لێ وەختم کەمە. بێتاقەتم، بەڵام بەردەوام کاردەکەم. لەلایەکەوە دەبێ قەولو بەڵێنەکەم بەرمە سەرو لەلایەکی ترەوە دەترسم شۆرەتی ئەدەبیم زەدەدار بکات کە دانی پێدا دەنەم بە هەمان ئەندازەی ئەو خاتوونەی کە تۆ باشی دەناسیت، بەلامەوە ئازیزە، بۆیە لە باری دەروونیەوە شەپرێوم. لە خۆمو هەموو کاینات بێزارم. بۆیە لە خۆم بێزارم چونکە بە خۆڕایی بەڵێنم داوە، لێبڕاوم کارە نیوەچڵەکانی پێشووشم تەواوبکەم، کەچی بۆ نەگبەتی لەم کاتەدا بیرو نەخشەێن تازە بۆ کارێن تازەتر کە ئەفسوناوی دێنە بەرچاوم، بەرۆکی هزرو بیری گرتووم. دوا نامەی تۆم لەو کاتەدا پێگەیی کە گیرۆدەو دەستەمۆی ئەو بارە دەروونیە بوو بووم، بۆیە زۆرم سێبوری پێهاتو سوکنایی بە رۆحم بەخشی، جا ئەگەر تۆ بەو شێوەیە خۆشت بوێمو بە تەنگمەوە بێیو بەو شێوەیە دەرچیت کە ئایدیالو ئاواتی منە، ئیدی من چ باکم بە خەڵكو کاروباری ئەم جیهانەیە؟ لە ناوەڕۆکی نامەکەتەوە ئەوەم بۆ دەرکەوت کە خۆشت دەوێم، و بە شێوەیەکی جدی تر لە هەوڵی دەرککردنی ژیاندایتو ئێستا حەزت لە چاکەو چاکە کارییەو لەزەت لە نەفسکوژیو نەفس شکێنی دەبینیو زیاتر بەرەو خەملینو پوختەیی دەچیتە پێشێ. ئەمە رێیەکی بێ کۆتاییە، لێ یەجگار جوانە،و تاقە رێگەیە کە لەم دنیایەدا مرۆڤ بەرەو

شادمانی دەبات. ئازیزی دڵەکەم! خودا یارو یارمەتیدەرت بێ! هەمیشە هەڕە پێشێ. دلۆڤان و دلۆڤانتر بە، خۆشەویستی بکە بە پیشەی خۆت، خۆشەویستی و خۆشەویستی. نەك هەر منت خۆش بوێ، بەڵکو هەموو مەخلوقاتی خودات خۆش بوێ! خەڵکی، سروشت، مۆزیك، شیعرو هەرچی جوانیەك لەم دنیایەدا هەیە خۆشت بوێ، ئەقڵ و ئاوەزی خۆت هەمیشە پەروەردە بکە تا بتوانی ئەوەی لەم دنیایەدا شایستەو لایەقی خۆشەویستی و ڤیانە بناسیت و تێی بگەیت. ڤیان و مەحەبەت تاقە ئامانجی بنەڕەتی و تاقە فاکتەری بەختەوەری ئێمەیە لەم دنیایەدا. هەرچەندە ئەو بابەتەی کە دەمەوێ باسی بکەم و بیخەمە ڕوو بە هیچ جۆرێ پەیوەندی بە بابەتەکەمانەوە نیە، لەگەڵ ئەوەشا حەزم لێیە ئاماژە بۆ یەك ئەنگێزەو سۆنگەی گرینگی دیکەی پێویستی ژن بە گۆڕان و پوختەبوون بکەم. ئامانجی سەرەکی ژن جگە لە بە ژن بوون، بە دایك بوونە،و جا بۆ بە دایك بوون، نەك تەنیا بە ژن بوون – ئایا بە دروستی جیاوازی نێوان ئەو دووانە دەرك دەکەی؟– پێویستی بە گۆڕانە. ئازیزی دڵەکەم! – زۆرم کەیف بەم عینوانە (دایك بوون) دێت – جا نابێ لەبەر ئەو سەرنجانەی کە هەنووکە بۆتی ریز دەکەم، گەردی بێزاری بنیشێتە سەر پەڕەی پاکی زەینت.

١- تۆ بەردەوام دەڵێی ئەشقم پاکە، بەرزەو... بەڕای من گوتنی ئەشقم بەرزەو... وەکو ئەوەیە کە کەسێك بڵێت: "کەپوو و چاوانم جوانن". ئەم حوکمە دەبێ خەڵکانی دی بیدەن.

٢- لە و پاشکۆ جوانەدا کە بۆ باسی ژیانی چراپوڤسکییەکان تەرخانت کردووە، وا دەنوێنی کە زۆرت دڵ بە ژیانی دێهاتەوە نیەو پێت باشترە جار جار بۆ تولا بڕۆیت. خودا بکات کە ئەم بیرە زوو لە مێشکت دەربچێت. من لەم نامەیەی دواییمدا نا، لەوەی پێشتردا بۆم نووسیبوویت کە مانای گوند بۆ ئێمە دەبێ تەنیا ئارامی و چالاکی بێ و بەس، بەڵام تۆ وا دیارە ناتوانی گوند بەو مانایە تەحەمول بکەیت و دۆستان و ئاشنایانی تولا تۆ بە دێهاتی، کە لە ڕادەبەدەر ترسناکە، لە قەڵەم دەدەن. بەڵام ئەوە بزانە چراپوڤسکییەکان یان دەگەڵ کەسدا تێکەڵ نابن و یان دەگەڵ باشترین کۆڕو کۆمەڵگەی سەرانسەری روسیادا هاتووچۆو تێکەڵاویان دەبێ،و مەبەستم لە باشترین کۆمەڵگە ئەو کۆمەڵگەیە نیە کە مایەی عینایەتی ئیمپراتۆر بێت، یان بە سەروەت و سامان و دەوڵەمەندییەوە بفشێت، بەڵکو مەبەست کۆمەڵگەیەکە کە ئەندامەکانی بریتی بن لە رۆشنبیران و زانایان و هونەرمەندان، ڕاستە ژوورەکانیان لە قاتی چوارەمدا دەبێت،لێ بەرجەستەترین پیاوانی روسیا لەو ژوورانەدا کۆ دەبنەوە . بۆیە خودای گەورە لە ئاشنایان و خزمانی تولا بە دوورمان بگرێ. دەبێ لێیان دووربکەوینەوە، چونکە هیچ پێویستییەکمان بە دۆستایەتی وان نیە. زۆرجار ئارخایەنم کردویت کە ئاشنایەتی و هاتووچۆ دەگەڵ کەسانی نە زەروریدا زیانی زەق و نەنگینی لێدەکەوێتەوە.

٣- سەیرە! تۆ وا وێنا دەکەیت کە خودان زەوق و سەلیقەی. لەگینە هەشت بێ، لێ هونەری بەکار هێنانەکەی نازانی. بۆ نموونە جلێکی فاخیر بە کلاوێکی شینی ئاسمانی و گوڵێن

سپییەوە جوانە، بەڵام بۆ خانمێك گونجاوە كە لە مەیدانانی ئەسپ سواری ئینگلیستاندا بە سواری ئەسپێكی بەرچاوی ڕەوتە بكات، یان لە قاڵدرمەی خانووەكەیەوە كە بە یەك دنیا ئاوێنەو گوڵدانی كامیلیا رازابێتەوە، سەر دەكەوێ، بەڵام لە هەلومەرج و ژینگەی هەژارانەی قاتی چوارەم و بە گالیسكەی كرێ لە گوندا، هەمان جلك و كڵاو بەڕاستی مایەی گاڵتەیەو هەق نیە هەر باس بكرێ. هەندێ ژنانی وەكو چرباچیڤا(٢)و تەنانەت لەو خراپتریش هەن كە بەم جۆرە شیكپۆشییەوە، واتە بە جلكی ڕەنگاو ڕەنگی سەرنجڕاكێش و قژی لوول، سەرپۆشی فەروو ومانتۆی سپییەوە، بە هەرحاڵ لە تۆ باشتر دێنە بەرچاوو ئەنجام ئەوەیە كە تۆ وەكو ئەوانت لێدێ. ئەو كیژو ژنانەی كە ماوەیەكی كەمیان لەشارانی گەورەدا بەسەر بردووە، هەمیشە لەم ڕووەوە دووچاری هەڵە دەبن. بەڵام جۆرە ناسكی و زەوقدارییەكی تایبەتی دیكە هەیە كە هیچ پیاوێكی جوانپەرست و بە زەوق نیە دڵی بۆی لێنەدا. ئەم ناسكییە پەسندە بریتییە لە تەوازوع و بێ فێزی و دوورە پەرێزی لە هەر شتێكی نائاسایی و سەیرو سەمەرە كە زۆر زەق و ناجۆر بنوێنێ. دەیقەتی زۆر لە شتی بچووكی وەك جۆری پێڵاو، یەخە، دەستكێش، خاوێنی نینۆك، قژی داهێنراو زیانی نیە. من تا سەر مۆخ بەرگری لەم جۆرە بە زەوقی و زەوقدارییە دەكەم بە مەرجێ كە مرۆڤ لە كاروبارێن جدی زۆر دوور نەخاتەوە. زەوقی هەڵبژاردنی ڕەنگێن تۆخ و زەق و ناشیرین، وێڕای ئەوەی نە شازو مایەی پێكەنینە، هێشتا بۆ كیژێكی ناشیرین و نا قۆڵا تا ڕادەیەك قابیلی چاو پۆشییە، بەڵام بۆ كیژێكی وەكو تۆ بەو دەموچاوە دڵفرێنەوە، هەڵەیەكە لە بوردن نایەت. ئەگەر من لە جیاتی تۆ بم، قانونی ئارایشتی خۆم لەسەر بناغەی سادەیی و ڕەچاوكردنی هەموو وردەكارییەكان ڕۆدەنێم.

٤- چوونە گەلەری! ئاه! خودایا! ئەمەیان ئەسڵەن شایەنی باس نیە، بە هەرحاڵ ئەوەی تێپەڕی و تەنانەت نیازو مەبەستی تۆ بۆ خوێندنی مۆزیك لە زانستگەی تولا، لە هەنبەر ئەو ڕاستگۆییە دڵگیرو ڤیان و ئەشقە پاكەی كە لە نامەكانی تۆدا ڕەنگیان داوەتەوە هیچ نیە. بیكە بە خاتری خوا، ڕێگە نەدەیت سەرنجەكانی من باشترین سیفەتی تۆ، كە ئەو ڕاستگۆییە، بشێوێنی. ئالنیكا حەزی لە كێ كردووە؟ ناگوترێ؟ وادیارە بە چاولێكەری تۆ كەوتووەتە سەر ئەم هەواو هەوەسە. خودا حافیز تا سبەینێ. لە پۆستەخانەوە نووسراوێكم كراوەتە سەر كە بچم رۆبڵێك بدەم، پێم وایە هەقی پۆستكردنی وێنەكەی تۆ بێ. دەترسم بە وەرگرتنی وێنەكە زۆر لە ئێستا شێت تر ببم. ببورە كە من هێشتا وێنەم نەگرتووە، دەرفەتم نیە، دەستم ناگات، تەنانەت نام پەرژێ نامەی دوورو درێژ بۆ تۆش بنووسم، لە كاتێكا بە خۆت دەزانی نامە نووسین بۆ تۆ چ لەزەتێك بە من دەبەخشێت. ئازیزی دڵەكەم خودا حافیز! پێت خۆش بێت یان ناخۆش بێ، من هەر ئەو دەستەواژەیە بەكار دێنم. مەسیح یارو یاوەرت بێ.

١١/٢٤: تۆزێ لەمەپێش، دوای تەواوكردنی كارەكانی ئەمڕۆ كە وەكو بۆم نووسیوی گیرۆدەیان كردووم، كتێبێكم كردەوەو بابەتێكی زۆر جوانم خوێندەوە كە بریتی بوو لە

(ئیفی جینی)یەکەی گوتە. تۆ ناتوانی ئەم لەزەتە گەورەو لەوەسف نەهاتووەی تێگەییشتن‌و خۆشویستنی شیعر دەرك بکەیت - ڕەنگە بە تێپەڕ بوونی رۆژگار دەرکی بکەی- بەلاّم گرینگ ئەوەیە کە نازانم بۆچی هەستی ئەم لەزەتە، تۆی بیر خستمەوەو ئەوەتا ئارەزوویەکی بەتین‌و تاو هەڵی پێچاوم کە نامەت بۆ بنووسم. "ئازیزی دڵەکەم!" هێشتا وێنەکەتم وەرنەگرتووە. وێنەیەکی خۆمیشت بۆ دەنێرم. داومە بە ئیڤان ئیڤانوڤیچ. نزیکەی مانگێکە کە تۆم نەدیتووە، بەلاّم تەقریبەن هەمیشە لە بیری تۆدام، جاریٚ بەبیٚ متمانەیی، جاریٚ بە توڕەیی، بەلاّم زۆربەی کات بە ئەشقێکی شێتانەوە. کەچی هیچ هەوڵێك بۆ تاقیکردنەوەی هەستەکانم نادەم. لەوەتای سەفەرم کردووە ژیانم زۆر تەریکترو بیٚ سەرو سەداترە لەو کاتەی کە لە یاسنایا بووم. لە ١٢/١دا دوا مۆری خۆم هەڵداوێم، قیروسا چ دەبیٚ با ببیٚ. حاڵی حازر زۆر مژولی ئامادەکردنی بابەتێن ژمارەکانی دیسامبەرم‌و هێشتاش کارە سەرەکیەکەم واتا پێداچوونەوەی چیرۆکی "لاوی"م دەست پێنەکردووە. پێموایە دەبیٚ هەموو مانگی دیسامبەر بەم کارەوە بەرمە سەر.

چوویت بۆ کۆڕی سەما؟ ئایا هەندێجار بۆ فێر بوون دەچیتە نك (مرتیە)؟ هەردوو کارەکە زۆر زەرورین‌و ئامۆژگاریت دەکەم لێیان غافڵ مەبە. بێزەحمەت ئازیزەکەی دڵم بە گوێم بکە. کاری مۆزیك بەرەو کوێی بردوویت؟ زۆرجار دەیهێنمە بەرچاوی خۆم کە چۆن دوای پێنج هەفتەی دی بۆ (سوداکروڤۆ) دێم‌و دوای ئەوەی ماوەیەك لە پاڵ سۆپادا قسەو باسمان کرد، دەچیتەسەر پیانۆکەت‌و بە پێشکەوتنە گەورەو نا ئاساییەکانی خۆت سەرسامم دەکەیت. ئەگەر تەمەڵی نەکەیت، بێگومان سەرکەوتن بە دەست دێنی. خودا حافیز ئەی کیژی ئازیزو دلبەر! دەستە ناسکەکانت دەگوشم. مەسیح یارو یاوەرتان بیٚ. لەوەیە سبەینیٚ نامەیەکی تریشت بۆ بنووسم. وەکو جاران نامەم بۆ بنووسە، بەلاّم زیاتر باسی سەرگەرمیەکانی خۆتم کە. چیت دەویٚ؟حەزت لە چیە؟

زنیکای دلبەر

پیندیگاسی

ئولنیکای شەیدا

ئاخۆ دەبیٚ ماوەیەکی زۆر بەم خەمباری‌و نامرادییە بەسەر بەرین‌و ڕەنجی بێهودە بدەین؟ ئێوە چ دەڵێن؟ بە بۆچوونی من ئەم ڕەوشە زۆر ناخایەنیٚ. پێم وایە نامەکەی دوێنێم گەوجانە بوو... لەو نامەیەدا نازانم بۆچی، زۆر بە خۆ فشی بووم.

***پەراوێز:***

***١ - چیرۆکێك: مەبەست لە چیرۆکی (دەرەجە لیٚ سەندنەوەیە).***

***٢ - چرباچیڤا: پوری ئارسنوڤایە.***

## بۆ و. و. ئارسنوڤا

## پترزبۆرگ، ٢٧- ١٨٥٦/١١/٢٨

دوێنێ دووەمین نامەتم کە پاش ڕێوڕەسمی کمونیون(١) نووسی بووت، و ئەمڕۆکەش نامەیەکی پێش ئەو نامەیەتم پێگەیی. نازانم بۆچی ئەم نامانە، بە پێچەوانەی نامەکانی پێشووتەوە هیچ لەزەتێکیان پێ نەبەخشیم، نازانم لەبەر ئەوەیە خەتەکەی ناخۆشە، یان من گۆڕاوم، یان لەبەر ئەوەیە لە دوانامەتدا ناوی (مرتیە)ت بردووە. بە هەرحاڵ، لە کانگای دڵمەوە سڵاوت بۆ دەنێرمو زۆر شادو خۆشحاڵم کە هەموو ئەم مەسەلانە بە هەند وەردەگریت. من پێموایە کە ئینسان دەبێ کەمتر قسە بکات تا زیاتر هەست بکاتو، نابێ بەو ئومێدو هیوایە بێت کە دەشێت هەموو شتێك لە نوێ دەست پێ بکرێتەوە،و تۆ نابێ باوەڕی تەواوت بە ئەنجامدانی ڕێوڕەسمان لە کڵێسادا هەبێ، چونکە بە تەواوەتی لە ڕابردوو دابڕاویت. ڕاستە ئەم بۆنەو ڕێوڕەسمانە لە ژیانا کۆمەکی فرە بە بنیادەم دەکاتو دەبێتە مایەی خاوێن بوونەوەو پاکبوونەوەی دڵو دەروون، بەڵام بەو جۆرەش نیە کە تۆ تەسەوری دەکەیت. بۆ نموونە تۆ دەڵێی دوای جێبەجێ کردنی ئەم ڕێوڕەسمانە زیاتر ئاگاداری خۆت دەبیو تا ئەوپەڕی توانا کار بۆ چاککردنی خۆت دەکەی، کار دەکەیت – ئەمەیان من لە جیاتی تۆ زیادی دەکەم– هەموو ئەمانە زۆر باشنو لە خودای گەورەم داوایە کە لەم ڕووەوە پشتیوانت بێ، بەڵام چیرۆکی (مرتیە)، هەمان چیرۆکەو وەکو خۆی دەمێنێتەوە، یەکەم بابەتی نەخوازراوو ناخۆش ئەوەیە کە وەکو من دەیبینم وەختی خۆت بە فیڕۆ دەدەیت. یانی کاتەکەت بە فیڕۆ دەڕوات. دوێنێ چووم بۆ ماڵی ئەو، تورگنوا و لەوێندەر گوێم لە تریو((٢)) (Tkio)ی بتهۆڤن بوو. ئاهەنگو ئاوازەکەی هێشتا لە گوێمدا دەزرنگێتەوە. بەڕاستی نەشئە بەخشە. مەحاڵە ژنێك بدینمو بتوانم دەگەڵ تۆدا بە راوردی نەکەم. ئەم ژنە لە هەموو ڕوویەکەوە بێ هاوتایە، بەڵام بە دڵی من نیە. بەڵام وێڕای ئەمەش نابێ بێ ئینسافی دەرهەق بکرێ. پوری بۆی گێڕامەوە کە لە پترزبۆرگدا سەعات حەوت لە خەو ڕادەبێو هەموو ڕۆژێ تا سەعات دوو خەریکی پیانۆ ژەنین دەبێتو عەسرانیش وەختی خۆی بە خوێندنەوە دەباتە سەر. لە ڕاستیدا هەرچەندە میناکی تۆ بە تواناو بەهرەدار نیە، بەڵام لە مۆزیکدا باش پێشکەوتووە. بابەتێکی دیکە کە بەڕای من لەڕادەبەدەر ترسناکە ئەوەیە کە تۆ (مرتیە)ت بۆ تولاو سوداکروڤو دەعوەت نەکردووە. چەندین جار بە تۆو بە زنیکام گوتووە هەرکاتێ بخوازی بە تەواوەتی پەیوەندی دەگەڵ (مرتیە) ببڕیت، دەبێ بیدینی، بەڵام تۆ ناتەوێ باوەڕ بە قسەکانی من بکەی. حەزدەکەم لە قسەکانم نەڕەنجێیو وا نەزانی کە من گیرۆدەی بەغیلیو غیرە بووم، بەڵام هەوڵبدە بەوپەڕی هێمنی خۆت لە جێی من دابنەیتو لە چاوی منەوە بڕوانە بویەرو پێشهاتەکان: خانم دمبیجکایا((٣)) ئاشقی پاس پاس((٤)) بوو،و بە خۆی لەنك زنیکا دانی بەم ڕاستیەدا ناوە. لە داخا ئاه هەڵ مەکێشە، ئەمە کارەساتێك نیە بەڵکو تا ڕادەیەك پێشهاتێکی دڵگیرو خۆشە. خانم دەمبیجکا دڵنیایە کە پاس پاس نەك بە دڵی، بەسەد دڵ ئاشقی ئەوەو ئێستا پەیوەندیان بڕاوە، بەڵام بە تەواوەتی نەبڕاوە. دەرهەق بە من بە ئینسافەوە حوکم بدە. من تەواو دڵنیام تۆ ئێستا هیچ هەستێکی ئاشقێنیت سەبارەت بەو نیە، لێ ئەم شتە لە لای ئەو ساغ نەبووەتەوەو هێشتا لەو

باوەڕدایە کە تۆ حەزت لێی کردووە. ئایا تۆ هەست بەم حەقیقەتە دەکەیت کە تا ئێستا نیوە دژوارەکەی ڕێگاکەی بڕیوە؟ ئایا ئەو شتانەت وە بیردێنەوە کە ئەو شەوە لە سەر پیانۆکە باسمان کردن؟ ئەگەر تۆ ئاشق ببی چ دەبێ؟ تۆ گوتت کە  شتی وا هەرگیز روونادات، چونکە ڕێگەت بە خۆت نەداوە ئاستی ئولفەتی بەرانبەرەکەت، کە زەمینەی زەروری ئەشقە، بگاتە ئاستێك کە مەترسیت بۆ دروست بکات. ئەم قسەیە لە هەموو روویەکەوە دروستە ، بەڵام ئەم خاڵەشت بیر نەچێت کە پەیوەندی تۆ دەگەڵ (مرتیە)دا گەییوەتە ئاستێك کە ئەو هەقیەتی وا تەسەوربکات کە تۆ حەزت لێکردووە یان یەکێکی لەو جۆرە ژنانەی کە سەبارەت بە زۆر پیاو بەو جۆرە ئەشقی خۆت دەردەبڕیت؟ بۆیە، دابڕان‌و نووسینی نامەیەکی ساردو سڕی پڕ لە هەنجەت‌و بیانوو، بە تەواوەتی پەیوەندی نێوان دوو کەس ناسڕێتەوەو لە دوا ئەنجامدا ناتوانێ بیری پەشێوو پەریشانی چراپوفسکی هێوربکاتەوە. ڕاستت دەوێ ئەوەی کە بووەتە مایەی نیگەرانی چراپوفسکی تەنیا پەیوەندی تۆیە دەگەڵ (مرتیە)دا، دەنا بە خۆت دەزانی بەوپەڕی ڕاشکاوی‌و بە شادییەوە باسی ئەشقی نێوان تۆو ئیسلاڤین- ت لەگەڵدا دەکات‌و ئەگەر ڕۆژێ لە رۆژان ببێ بە مێردی خانم دەمبیجکایا ئامادەیە - ئەگەر پێویست بکات - بەبێ هیچ دوو دڵی‌و نیگەرانیەك هاوسەرەکەی بۆ ماوەی دوو ساڵ دەگەڵ ئیسلاڤیندا بنێرێتە سەفەر، بەڵام مەسەلەکە دەگەڵ (مرتیە)دا تەواو جیاوازە. خانم دمبیجکایا دڵنیایە کە مرتیە ئەوی (خۆش) دەوێت، بەڵام ئاغای چراپوفسکی کە دنیای لە خانم دەمبیجکایا زیاتر دیتوە، دەزانێ ئەم "ئەشقە نموونەییەی" ئاغای (مرتیە) چ جۆرە ئەشقێکە. ئایا جگە لە ئارەزووی ماچکردنی دەستی کیژێکی دڵڕفێن هیچی ترە؟ پیاو دەتوانێ چ لە ڕێگەی خوێندنەوەی چیرۆکی ڤارتەرەوە پەی بەنیازو مەبەستە شاراوەکانی ئەو بەرێت‌و چ بە سەرنجدانی ئەم خاڵەی کە ئەو هەرگیز، تەنانەت لە بواری موسیقاشدا، کە تاقە بواری ئەو بوو بۆ خزمەتکردنی خانم دەمبیجکایا، گوێی بە بەرژەوەندی خانم دەمبیجکایا نەداوە. بەپێچەوانەوە هزرو بیری شێواندووەو بە ڕووبینی‌و مجامەلەی گەوجانە زیانیشی پێ گەیاندووە. ئەمە جگە لەوەی ئەشقی ئەو لەو جۆرە ئەشقانەیە کە بەخێراییەکی سەیر لە قۆناغی ملکەچی‌و بەندایەتیەوە بەرەو قۆناغی گۆساخی‌و ڕووداری دەڕوات. من چاك لە خەڵکی‌و لەم شتانە تێدەگەم. من ناتوانم ڕێگە لە کەس بگرم کە ئەم جۆرە ئەشقە سەبارەت بەژنەکەم دەربڕێ، تا لە نێوان ژنەکەم‌و ئەو کەسەدا هەستێکی هاوبەش دروست نەبێ، ئەم ئەشقە هیچ مەترسیەکی نابێت، بەڵام کاتێ کە نیوەی یەکەمی ئەم ڕێگەیە بڕدرابێ ، ئەو کاتە مەترسیدارەو ئەم مەترسیە بەشێوەی جۆراو جۆر دەردەکەوێ، بۆ نموونە ئەگەر (مرتیە) نامەیەکی دڵداری بۆ ژنەکەم بنووسێت یان دەستی ئەو ماچ بکات‌و ژنەکەم لێمی بشارێتەوە -حاڵی حازر کێ دەتوانێ ڕێگەی لێ بگرێ؟- لە دوو حاڵەت بەدەر نابێ یان ژنەکەمم خۆش دەوێ‌و لە ئەنجامدا خۆم لە گێلی دەدەم‌و مێشکی خۆم وێران دەکەم، یان خۆشم ناوێ‌و ناچار بە پەلە تەڵاقی دەدەم‌و ئیدی تەنیا لەبەر خاتری حورمەتی ئەوو پاراستنی ئابڕوو بۆ ئەوەی هەموو خەونەکانی ئایندەم هەڵنەوەرێ بۆ ئەوپەڕی دنیا هەڵدێم. هەڵبەتە ئەمە رستەیەکی وشك‌و برینگ‌و بۆش‌و بەتاڵ نیە. سوێندت بۆ دەخۆم کە  بە جدیمە. ئەوەندە دڵنیام کە جێی

هـیچ جـۆرە دوو دڵیـەك نەماوەتـەوە، هـەر بۆیـەش ئەوەنـدە لـە ژن هێنـان دەترسـم، چـونکە ئـەم مەسەلانەم زۆر بەجدی وەردەگرم. خەڵکانێك هەن کە لە کاتی ژن هێناندا بـەمجۆرە بیر دەکەنـەوە: مـادامێکی شـادی تـەواوم بـە دەسـت نـەهێناوە، ئیـدی بـە هـەر شـێوەیەك بـووە درێـژە بـە ژیـانم دەدەم... بەڵام ئەمجۆرە بیرکردنەوانە هەرگیز بە مێشکی مندا نایـەت. مـن بـە پێچـەوانەی ئەمـەوە بیردەکەمـەوە، کـە بەختـەوەری تـەواوم دەسـت نەکـەوێ، هـەموو شـتێك، هـەر لـە بـەهرەو توانـای نووسـەرییەوە بیگـرە تـا دەگاتـە دڵـم یەکسـەر لـە دەسـت دەدەمو دەسـت دەدەمـە بادەنۆشـی و مەیگوساری، دەبم بە قوماربازو گەرووی خۆم هەڵدەبڕمو خۆ ئەگەر لـە فەرزێکا جورئـەتی ئـەم کـارەم نـەبێ دەسـت دەدەمـە دزی. بـۆ تـۆ بـە پێچـەوانەوە، زەوجـین جـۆرە گاڵتـەو شـۆخییەکە، هەستێکی خۆش، ناسكو بەرزە. من لەم بارەیەوە خۆشیم لە سیفەتێن ناسكو بەرز نایەت، بـەڵکو "راسـتگۆیانە" و "بـاش"م لاپەسـندە. بەوپـەڕی هێمنـی هەوڵبـدە خـۆت لـە جێـی مـن دابنـەو بیر بکـەوەو راوێـژو شـیرەت بـە زنیکـاش بکـەو بزانـە کـاتێ کـە پـێ دادەگـرم لەسـەر ئـەوەی دەبـێ پەیوەندی نێوان تۆو (مرتیە) تەنیا پەیوەندی نێوان مامۆستاو قوتابی بێت هەقمە یـان نـا؟ رەنگـە ڕاگرتنی پەیوەندییـەکی لـەو جۆرە دژوار بێ بـەڵام چار چیە؟ لەلایـەکی تـرەوە نووسینی نامـەێن درۆیین بۆ ئەو "چۆن کاتێ کە لـە ڕێـوڕەسمی کمونیونـدا بەشدار بوویـت قسـەت لەگـەڵیا نـەکرد؟" دەکاتە خۆ بچووك کردنو گەورەکردنی ئەو. چراپوفسکی بۆ ئەوەی نـەبا رۆژێ لـە رۆژان ژنەکـەی لە هەنبەر سۆزو گودازی ئاشقانەی مرتیەدا خۆی پێنەگیرێو جڵەوی سۆزی لە دەست بەربێ، بـە حوسنو ڕەزای خۆی بەفەرسەخان لە مرتیە دوور دەکەوێتەوە. چراپوفسکی یاسایەکی لـە ژیانـدا بۆ خۆی داناوە کە زۆر پابەندیـەتی. ئـەویش ئەوەیـە پیـاو لـە سەرانسـەری دنیـادا نـەك تاقـە یـەك دژمنی نەبێ، بەڵکو تاقە کەسێك نەبێ کە دیـداری ئەویشـی لا نـاخۆش بـێ. ئێسـتا هەرچـەندە تـۆ پەیوەندیت دەگەڵیا هەیە، لێبڕاوی گیرۆدەی ئەم وەزعو حاڵە نەنگینو ئـابڕو بەرەیـەی بکـەیت. تـۆ هەوڵ بدە لە جیاتی من حوکم لەسەر وەزعو حاڵەکان بدە. تـۆ خـاوەن دڵێکـی پـاکی، منـت خـۆش گەرەکەو لە ئەنجامدا پەی بە نهێنی هزرو بیرو هەستو سۆزی من دەبەیت، هەرجۆرە حەسودیو غیرەیەك مایەی شەرمەزاریە، چۆن دەکرێ حەسودی دەرهەق بە (مرتیە) لەم حاڵە ببوێردرێ.

ئایـا تەسـەور دەکـەی ئامۆژگـاریو وەعزەکـەی مـن لێـرەدا کۆتـایی بێـت؟ نـەخێر! باشـتر وایـە هەرچیم لە دڵدایە هەڵیڕێژمە دەرێ. بە درێژایی سێ رۆژ بریارت نـەدا دەربـارەی تاقـە یـەك بابـەتی دڵپەسندی من شتێك بنووسیتو بڵێیت، لـە کاتێکا چاك دەزانیـت دەربـارەی کۆمـەڵێك مەسـەلە چـەند بەتاسـەوەم ڕای تـۆ بـزانم؟ نامەکەشـت بـە جـۆرێ نووسـیوە وەك بڵێـی زۆر بـەم بێدەنگیـەی خـۆت بنازیـت. ئـەم رێبـازەی تـۆ گرتوتـە بـەر مـەرجی سـەرەتایی زاهیرتریـن خۆشەویسـتیو دۆستایەتیەو دەگەڵ ئەو (ئەشقە ناسكو بەرزە)دا ئاسمانو ریسمانە. زۆریـان فەرقـە. بـەبێ هـیچ سوعبەتو شۆخیەك دووپاتی دەکەمەوە هەر ڕۆژێ بۆم دەربکەوێ ژنەکـەم هەڵەیـەکی کـردووە، بـا زۆر بچـووکیش بـێ،و لـە منـی شـاردووەتەوە، سـەری خـۆم هەڵـدەگرمو دەڕۆم بـۆ ئەوپـەڕی دنیـا و ئیدی کەس نا ناسم. چ بکەم؟ من ئاوها دروست بووم. نە هیچ حەقیقـەتێك دەشارمەوەو نـە شـتی بچووك گەورە دەکەم. تۆ بـاش بیربکـەرەوە ئایـا دەتـوانی دێـوێکی ئاوهـات خـۆش بـوێ، بـاش لـەم

مەسەلەیە کە هەم بۆ تۆو هەم بۆ من ئەوەندە گرینگە وردببەوە. باوەڕبکە کە من هەرگیز هیچم لە تۆ نەشاردووەتەوە، بەڵکو لەو کاتەوە کە لە تۆ جیابوومەتەوە، بچووکترین بیرم بە مێشکدا هاتبێ، ڕێك‌و ڕاست پێمگوتوویت. هەرشتێك پەیوەندی بە تۆوە بووبێ گوتوومەو دەیڵێم. بۆیە پەیوەندیم دەگەڵ تۆدا مایەی دڵخۆشیمە. لە بڕینی ڕێگەی چاکدا پشتیوانیم دەکەی. ئەوەی تۆ دەربارەی کەشیشان لێت پرسی بووم، بابەتێکی بیر خستمەوە کە لە مێژبوو دەمویست بە گوێتیا بدەم. پەیوەندی ئایندەمان هەرچیەك بێ، هەرگیز مەسەلەی ئاین‌و ئەو شتانەی پەیوەندیان بە ئاینەوە هەیە ناخەینە روو. تۆ دەزانی من پیاوێکی ئیماندارم، بەڵام زۆر لەگینە باوەڕێن ئاینی من دەربارەی زۆر مەسەلەو دۆزان دەگەڵ بیروباوەری تۆدا ناکۆك بێت‌و نەگونجێت، لەبەر ئەوە نابێ باسی ئاین، بە تایبەتی لە نێوان دوو کەسدا کە یەکتریان خۆش دەوێ، بێتەکرن. من لەزەت لەوە دەبینم تەمەشای تۆ بکەم. ئاین، بە تایبەتی بۆ ژنان نیعمەتێکی گەورەیە. باوەڕو ئیمان بە ئاین لە دڵی تۆدا ڕیشەی خۆی هەیە. ئەمە بپارێزە، خۆشت بوێ ، بەڵام هەرگیز باسی مەکە. بەبێ هیچ توندڕەوی‌و سەختگیرییەك بنەماکانی رەچاوبکە، بیپارێزە. لە جاران زیاتر کاربکە. خۆت دەگەڵ کاردا ڕابێنە. چونکە کار یەکەمین مەرجی شادییە. خودا حافیز ڤالریا فلادیمیروڤنای ئازیز! دەستە ناسکەکانت دەگوشم. بەر لەوەی دوا دوو نامەتم پێبگات وام تەسەور دەکرد لە بری ئەوەی لە ڕێگەی نامەکانمانەوە یەکتر بخوێنینەوەو یەکدی تاقی بکەینەوە، زیاتر ئەشق‌و ئەڤینمان نێڵ دەدەین، بەڵام وا وێنا دەکەم ئەم نامەیە جیاواز بێ لە نامەکانی پێشوو. تا چەند ڕۆژێکی تر کارەکەم(٥) تەواو دەکەم‌و کەمێك بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانم دا ڕادەگەم. خوا حافیز! مەسیح یارو یاوەرت بێ خانمی دلۆڤان!.

***پەراوێز:***

***١- کمونیون (Commanion): جۆرە جەژن‌و بۆنەیەکی ئاینی مەسیحیانە کە نان‌و شەرابی تیادا پیرۆز دەکەن، خواردنی قوربان.***

***٢-تریو (Trio): پارچە مۆسیقایەکی سێ بەشی بەناوبانگی بتهۆڤنە.***

***٣-دمبیجکایا (Dembickaja): ناوی ئەسڵی ئارسنوڤایە.***

***٤-پاس پاس (Passe pasa): تولستوی بە و ناوە (مرتیە)ی ناو دەبرد.***

***٥-کارەکەم: مەبەست چیرۆکی (بەرەبەیانی موڵکدارێك)ە کە لە ١١/٢٩دا لە نووسینی بووەوە.***

## بۆ و. و. ئارسنوڤا و ژ. ڤرگانی

## پترزبۆرگ، ١٨٥٦/١٢/١

ئێستا دوای گوێگرتن لە ئۆپێرای ئوگونوتی بۆ ماڵ گەڕاومەتەوە. ئۆپێرایەکی هیچ بوو. لە پشت مێزەکەم دانیشتووم‌و قەڵەم‌و کاغەزێکم بە دەستەوە گرتووە، بە خۆم گوت: وا چاکە نامەیەکی تر بۆ کیژەخانی نازەنین بنووسم، بۆیە نها دەست بە نووسین دەکەم. دوێنێ نامە دەستییەکەتم، کە تیایدا باسی تورگینیف– ت کردبوو، پێگەیی. ئەوەی نووسیوتە جوانە، بەڵام نەدەبوو چیرۆکی (گفتوگۆ لە شا ڕێ)دا ڕات بکێشێت. یەکەم لەبەر ئەوەی چیرۆکێکی تا ڕادەیەك لاوازە،و دووەم چونکە بابەتەکەی ڕەخنەیە لە دنیای موڵکداری‌و ستایشی بێکاری‌و تەمەڵی‌و پابەند نەبوونە بە پرەنسیپ‌و بنەماکانی ئەخلاق‌و داوێنپاکی . ئەمانە کۆمەڵە مەسەلەیەکن کە تۆ هێشتا ناتوانی وەکو پێویست پەیان پێ ببەی. بێ زەحمەت هەمیشە بێ پێچ‌و پەناو بێ دوو دڵی ڕای خۆتم دەربارەی ئەو بەرهەمانە کە دەیانخوێنیتەوە، بۆ بنووسە، بەڵام هەوڵ مەدە لە خۆتەوەو بەبێ خوێندنەوە، ڕاوبۆچوونێکی سەرڤە سەرڤەی کلێشەیی دەربېڕێت. هەرکاتێ بەرهەمێك ڕای نەکێشایت‌و بەدڵت نەبوو، هیچ ڕاوبۆچوونێکی لەسەر مەدە. بیروبۆچوونی تۆم هەمیشە لە ڕادەبەدەر بەلاوە گرینگ‌و مەبەستە. هەرکاتێ هەموو بابەتەکانت خوێندەوە بە نامە ئاگادارم بکەوە تا کتێبانی دیکەت بۆ بنێرم. بەرهەمی جوان‌و دڵپەسندو دڵگیر ئەوەندە زۆرە کە بە هەموو تەمەنت ناتوانی هەموویان بخوێنیتەوە، وەکو بۆم نووسیت لەم ماوەیەدا زۆرم هەوڵدا تا چیرۆکەمم تەواوکرد، ئێستا کارێکی دیکەم(١) بە دەستەوە گرتووە. جگە لەمە، کۆمەڵێك کتێبی یەجگار زۆرم داناوە کە گەرەکمە بیانخوێنمەوە، کۆمەڵێك نۆتەم بە دەستەوەیە دەمەوێ لێیان بدەم، زۆر بیرۆکەی تازەم لە مێشك و خەیاڵدایە کە گەرەکمە تۆماریان بکەم، بەڕادەیەك سەرم قاڵە کە بە درێژایی ڕۆژەکە لە ماڵ ناچمە دەرێ‌و کە درەنگە شەوانێك دەچمە ناو جێگا داخی ئەوە دەخۆم کە بۆچی ڕۆژەکە ئەوەندە زوو تەواو بوو و نەمتوانی وەکو پێویست لە زەت لەم هەموو نیعمەتەی لەبەر دەستم دابوو، ببینم. هەرگیز ناڵێم "ڕۆژێکی ناخۆشم بردە سەر!" بەڵکو بە خۆم دەڵێم: "ئەفسووس کۆترێکی دڵڕفێنی دیکەم لە دەست دەرچوو و هەڵفڕی." تەنانەت بۆ دیدەنی دۆستان‌و چوونە ئۆپێراش – کە ئەسڵەن حەزی لێناکەم – مەگەر ناچارم بکەن ئەوجا بڕۆم. زۆرجار لە ماڵەوە بە خۆم دەڵێم: "چەند خۆش بوو ئێستا قژ زەردێکی نازەنینت لەگەڵ بوایە!" لێ هەندێجار لە خۆم دەپرسم: باشە ئەگەر ئەم نازەنینە، لەگەڵ زەوق‌و سەلیقەی تۆدا نەگونجاو هەموو ژیان‌و جوانی ژیانی لەبەرچاو خستیت چی دەکەی؟ بەڵام هەر زوو ئەم خەیاڵانە لە مێشکی خۆم وەدەردەنەم‌و لە خۆم تووڕە دەبم‌و دەڵێم: ئەی ورچە زلی گەوج‌و کەودەن! تۆ ئەگەر ئەم نازەنینەت تەنیا بۆ شادمانی خۆت دەوێ، ئەوا بێگومان هەڵەیت‌و بە دەستی خۆت، خۆت بەرەو بەدبەختی‌و نەگبەتی دەبەی. هەرکاتێ بە پێچەوانەوە، ئەگەر حەزت لێ بوو ئەم قژ زەردە نازەنینەت بە جۆرێ لە کانگەی دڵەوە خۆش بوێ کە هەمیشە

شادو بەختەوەر لەم دنیایەدا بژی، هەنگێ زۆر شادمانتر دەبیت، چونکە کارێکی تازەو دڵگیر هاتووەتە سەر کارەکانی ترت. وێڕای ئەمەش گازیەکی دیکە لەگوێمدا دەنگدەداتەوە:

١-باشە ئەگەر ئەم کارە تازەیەت هیچ بەرێکی نەبوو چ دەکەی؟ بۆیە دەبێ زیاتر لەم مەسەلەیە وردببیتەوەو دڵنیا بیت کە ئاخۆ لە عۆیەی ئەم کارە تازەیە دێی؟ هەرچەندە من بەخۆما ڕادەپەڕموموو لە خۆم دڵنیام، کەچی وێڕای ئەمەش ئەم بیرە تووڕەهاتانە بەڕۆکی زەینم بەرنادەن. ڤالریا فلادیمیرۆڤنای ئازیز! هەق بە تۆیە، لێکدانەوەو لۆژیکگەرایی ئێمەمانان لە ئاستی ویستو ئیرادەی یەزداندا ناکاتە هیچ؟ بەختەوەری یان نەگبەتی ئێمە بەدەستی ئەوە. دوای ئەوەی ئەو دوو نامەیەی تۆم، کە بەر لە جەژنی کمونیون نووسی بووتن، پێگەیی، مەگەر هەر خوا بزانێ لەبەرچی لە هەوەڵەوە هەستم بە دژمنایەتیەکی زۆر کرد بەرانبەر بە تۆ، پاشان گوێم نەدایە، هەڵبەتە ئەم حاڵەتە لە دوو ڕۆژ پتری نەخایاند. ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ لەو کاتەدا لە ڕادەبەدەر مژوڵو گیرۆدەی کار بووم یان لەبەر ئەوە بووبێ کە هەر پیاوێکی گەنج ئازادی خۆی لە هەر شتێکی دیکەی ئەم جیهانە خۆشتر بوێ، لە کاتێکا کە پەیوەندییەکانی ئێمە خەریك بوو دەبوو بەبار بەسەر شانمەوە. کەچی ئێستا لە خۆڕا و سەر لە نوێ هەست بە میهرو سۆزێکی نەرمو هێمنو بێ غەلو غەش، بەرانبەر بە تۆ دەکەم، و زۆرم حەزلێیە بیر لە تۆ بکەمەوە. نامەت بۆ بنووسم، لەلای تۆ بم. لە کۆتایی مانگی دوانزەدا بە ئەکیدی دێم بۆ لات. ئێستاش زۆرم دڵ پێوەیە بەلەز بێم بۆ لات، لێ مخابن(بە داخەوە) بە پێداچوونەوەی چیرۆکی (لاوی)یەوە خەریکم، هەروەها بۆ مەسەلەی ئیستیقالەش، کە ماوەیەکە قەبوڵ کراوە، دەبێ بەردەوام سەری ئەم دایەوەو ئەو دایەرە بدەم. زۆر لە دیداری سەر لە نوێی تۆ دەترسم. ئەمە دەرفەتێکی دیکەیە بۆ تازەکردنەوەی سۆزو پەیمانی خۆمان سەبارەت بە پەیڕەوکردنی راستگۆیی تەواو دەگەڵ یەکتردا، من لە یەك شت دەترسم، ئەویش ئەوەیە کە لە قۆناغی یەکەمی نامەکاریماندا، بە قسەی ڕۆمانسیانەو پڕ سۆزی جۆراوجۆر یەکتر بێنینە جۆشو خرۆشو لە قۆناغی دووەمدا خۆمان بۆ یەکتری رەسم بکەین. هەڵبەتە هیچ شتێك لە یەکتری ناشارینەوەو هیچیش لە خۆمانەوە هەڵنابەستین، بەڵکو زیاتر لایەنە جوانو خوازراو و پەسندەکانی خۆمان شیدەکەینەوەو ورد دەکەینەوە، بەڵام لایەنە ناجۆر و ناپەسندەکانمان، بە تایبەتی ئەو لایەنە سواوو پواوانەی کە لە کاتی یەکتر دیتندا دەبینرێن، پشت گوێ دەخەین.

من پێموایە، ئێوە هەمووتان کاتێ کە بیر لە من دەکەنەوە، بە شێوەیەکی نا ئیرادی تەنیا سیفەتە باشەکانم دێننە بەرچاوی خۆتان، کەچی لە کاتی دیداری حوزوریدا لە پڕ لە رووی بەدەنییەوە رووبەڕووی بزەیەکی(٢) دەستکرد، کەپویەکی میناکی سەلکە پیاز،و لە ڕووی دەروونیەوە رووبەڕووی تەبیعەتو میزاجێکی ئاڵۆزو ناپایەدارو خەمبار دەبنەوە، کە پێشتر هەر بیریشتان لێی نەکردووەتەوەو ئێستا وەکو ئەوە وان کە شتێکی خراپتان کەشف کردبێ‌و تووشی سەرسووڕمانو حەپەسانێکی ئەوتۆ دەبن کە شەرم دەکەن چ بە منو چ بە خۆتانی بڵێن. و لە ئەنجامدا بە شێوەیەکی نا ئیرادی ناچاری ڕووبینیو ڕواڵەت بازی دەبنو ئیدی لێرەوە خراپی دەست پێدەکات. جا ڕەنگە هەمان حاڵەت بۆ منیش بێتە پێشێ.

بۆیە ئێمە دەبێ بەڵێن بدەین کە سێ ڕۆژ دوای دیدارە تازەکەمان بەوپەڕی ڕاشکاوی‌و ڕاستگۆییەوە، یەکتری لە کاریگەری ئەم دیدارە ئاگادار بکەینەوە. تۆ ڕاستم پێ بڵێ ئایا ئەگەر ئێستا بە ڕێکەوت حەز لە کەسێکی دی بکەی یان دڵت لە من بتۆرێ دەتوانی بە ڕاشکاوی مەسەلەکە بە من بڵێیت‌و هەموو ڕاستیەکان ئاشکرا بکەی؟ هێشتا وێنەکەتم پێ نەگەییوە. نامەیەك بۆ دایەرەی پۆستەی مۆسکۆ بنووسە کە بەستەی ژمارە فلان بۆ سان پترزبۆرگ یان بۆ ئەدرەسەکەی خۆت بنێرێ. نازانم ئەو نەخشەیەت کە بە تەما بووی لە کروڤیسکییەوە بۆ مۆسکۆ بگوازیتەوە چی بەسەر هات؟ ژیانت چۆن دەقەتێ؟ ئایا دەچیتە کۆڕێن دانس‌و سەمایان؟ ئەگەر بچی خراپ نیە. ئەدی دەگەڵ مەشقی مۆزیکدا چۆنی؟ ئایا هیچ پێشکەوتووی؟ لەگەڵ هاتنمدا بە پێشکەوتنی تازە غافڵگیرم دەکەی یان نا؟ خودا حافیز ڤالریا ڤلادیمیروڤنای نازەنین! مەسیح یارو یاوەرت بێ! بە هەموو هێزمەوە دەستە جوانەکانت دەگوشم.

*دڵسۆزت*

*کۆنت تولستوی*

## خاتوو ڤرگانی

هەزارجار سوپاست دەکەم بۆ ئەو دوو وشە کورتەی کە لە نامەکەی "و."دا بوت نووسیبووم، ئەو هەواڵانەی کە سەبارەت بەم کیژە گەنجە بە منی دەدەی مایەی ڕەزامەندی نیە: تەمەڵە، بێتاقەتە، خەمگینە، بەردەوام دەچێتە گەڕان، هەموو ئەم هەواڵانە مایەی نیگەرانییە. چاوەڕوانم لە زاری تۆوە ئەوە ببیستم کە ئەو لە خۆی ڕازییەو بە درێژایی ڕۆژ سەرقاڵی کارەو ئەخلاق‌و ڕەفتاری کە زۆر باش بوو، یەجگار باشتر بووەو هەمیشە لە خەمی خۆ چاك کردندایەو ئاغایەکی بە نێوی چراپوڤسکی خۆش دەوێ‌و هەندێجار ڕێك هاوهزرو هاوبیری ئەوە؟ ئەمانە هەواڵی خۆشن‌و نقومی شادیم دەکەن. خودا حافیز زنیکای ئازیزو شیرین، بە هیوای دیداری نزیك. چونکە بە تەمام تا چەند هەفتەیەکی دیکە بتبینم‌و توند لە ئامێزت بگوشم‌و تکات لێبکەم ئەو چایەی کە وێمدەدەی زۆر غەلیز نەبێت!

*ل. ت.*

***پەراوێز:***

***١-تۆلستوی لەو سەردەمەدا خەریکی نووسینی کۆمیدیایەك بوو لە ژێر سەر ناڤی (ماڵباتێکی نەجیمزادە) کە تەواوی نەکرد.***

***٢-تولستوی لێرەدا ئاماژە بە ددانەکانی خۆی دەکات کە بە زۆری کرمۆڵ کەلۆس بوون.***

## بۆ ت. ئا. ئێرگولسکایا

## پترزبۆرگ ، ١٨٥٦/١٢/٥

ببورە کە وەڵامی نامەکەت سێ ڕۆژ دواکەوت. لەم ماوەیەدا زۆر مژوڵ و سەرقاڵی کار بووم. لە زەرفی یەك مانگدا چیرۆکێکی زۆر تازەم بۆ گۆڤاری (کتێبخانەی خوێندنەوە) نووسیوەو چیرۆکێکی کۆنیشم((١)) سەر لە نوێ بۆ گۆڤاری مێژووی نیشتمان داڕشتووەتەوەو هەردووکیانت بۆ دەنێرم. ئەم مانگەم زۆر بە باشی بەسەر بردووە، ڕێك وەکو کاتی بەر لە نەخۆشیەکەم کە لە بەرەبەیانەوە تا ئێواری مژوڵی نووسینی چیرۆکی (لاوی) بووم. جگە لەمانە پیانۆیەك و کۆمەڵێك نۆتەی زۆرم لایەو جارجارێك دروزنین و بوتکین و ئاتکوف دێنە دیدەنیم و هەندێجار لە شەوێکا نزیکەی شەش سەعاتان بە باس و گەنگەشەی مەسەلەێن ناچیزو توڕەهاتەوە بەسەر دەبەین و هەندێجاریش دەکەوینە باسی بابەتێن هێندە جدی کە ئاگامان لە تێپەڕبوونی وەخت نامێنێ. تا ئێستا نەچوومەتە دیدەنی هیچ یەکێك لە ئاشناکانم و بە نیازم ئەوەندەی لە تواناداا بێ کەمتر تیکەڵاوی خەڵکی ببم، چونکە زۆرم تەنیایی پێ خۆشە. حاڵم زۆر باشە، بەڵام پێموایە هی وەرزشی ڕۆژانەیە نەك هی چارەسەرییەکانی ساپولینسکی((٢)). بەڵام بێ خەوییەکەم هەر بەردەوامە. لە شەوو ڕۆژێکا ناتوانم لە شەش حەوت سەعات پتر بخەوم. دەربارەی ڤالریا هەمدیس بەهەمان شێوازو تۆنی جاران بۆت نووسیوم و منیش بە هەمان شێوازو تۆنی جاران وەڵامت دەدەمەوە. کە سەفەرم کرد بۆ ماوەی یەك هەفتە وام وێنا دەکرد کە گوایە ئاشق بووم. ئەم جۆرە وێنایە لە خەیاڵی خاوی مندا دوور نیە. بەڵام ئێستا، بە تایبەتی لەوساوە کە بەجدی دەستم بە کارکردووە زۆر حەزدەکەم بە خۆم بڵێم ئاشق بووم یان ئەوم خۆشدەوێ، بەڵام وا نیە، بەڵکو تەنیا هەستێ کە بەرانبەر بەو هەمە جۆرە ئەمەکداری و پێ زانینێکە دەرهەق بە ڤیانی ئەو و ئەم بیرەی کە لە نێو هەموو ئەو کیژانەی کە تا ئێستا ناسیوومن و دەیانناسم، بە بۆچوونی من ئەو بە گوێرەی بیروباوەڕی من دەربارەی ژیانی خێزانداری، لە هەموو ئەوانی تر لە بارترە بۆ شووکردن بە من. جا زۆرم پێ خۆشە کە بۆچوونی ڕاستەوخۆی تۆ لەمبارەیەوە بزانم. نازانم ئاخۆ هەڵەم یان نا؟ هەروەها حەزدەکەم سوود لە ئامۆژگاریەکانی تۆ وەربگرم،چونکە هەردووکمان دەناسیت، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی منت خۆشدەوێ و کەسێك کە یەکێکی خۆش بوێ لە بارەی ئەوەوە دووچاری هەڵە نابێ. ڕاستە من زۆر گەوجانە خۆم خستووەتە محەکی تاقیکردنەوەوە. لەوەتای ئەم سەفەرەم کردووە زیاتر ڕووم کردووەتە ژیانێکی گۆشەگیرانە تا ڕوو بکەمە عەیش و نۆش و ڕابواردن و زۆر کەم پەیوەندیم دەگەڵ ژناندا گرتووە. وێڕای ئەمەش زۆرجار خۆم سەرزەنشت دەکرد کە بۆچی بەمجۆرە خۆم بە ئەوەوە بەستووەتەوەو لەم ڕووەوە هەستم بە پەشیمانی دەکرد. لەگەڵ ئەمەشدا هەمیشە دەمتوانی قەناعەت بە خۆم بکەم کە ئەو تەبعێکی نەگۆڕو پایەداری هەیە و زۆر پابەندی منە، تەنانەت وام بیرکردووەتە کە ئەگەر لە ئایندەشدا وەکو ئێستا منی خۆش نەوێ، من هەر پێی ڕازی دەبم و ئامادەم بیخوازم، چونکە دڵنیام لەم حاڵەدا ئەشقی من بۆ ئەو بە تێپەڕبوونی زەمان زیاد دەکات و هەنگێ دەشێت لەبەر ڕۆشنایی ئەم هەستەدا ژنێکی شایستەی لێ دروست

بکرێ. خودا حافیز پورێ گیان! دەستەکانت ماچ دەکەم. هەر بەم پۆستەیەدا نامەیەکیش بۆ سیرزا دەنێرم.

*ل. تولستوی.*

***پەراوێز:***

***١-چێرۆکێکی کۆن: مەبەست لە هەردوو چیرۆکی: (پلە لێ سەندنەوە، و بەرەبەیانی موڵکدارێك)ە.***
***٢-ساپولینسکی: یەکێکە لە پزیشکەکانی پترزبورگ.***

## بۆ س. ن. تولستوی
## پترزبورگ، ١٨٥٦/١٢/٥

***سیرزای ئازیزم***

هەڵبەتە لە ڕێگەی ئەو نامەیەمەوە بۆ پورێ، کە پێموایە هەنوکە دەگەڵ تۆدا دەژی ، هەندێ شتت لەمەڕ خۆم و پەیوەندیم دەگەڵ میوان((١))دا، زانیوە. بەڕاستی توڕەبوونە ناڕەواکەت زۆری پەستو خەمبار کردووم. موناقەشەو بەڵگەکانت دەربارەی هەلومەرجی پراتیکی بابەتەکە لۆژیکیو دروستە، بەڵام پێویستە بزانی ئاخۆ سیفەتێن خودیو دەرونی بۆ دابینکردنی ئەم هەلومەرجانە لە ئارادا نیە؟ تۆ سووری لەسەر ئەوەی کە ئەم سیفەتانە لە ئارادانین، بەڵام ئەم ڕاوبۆچوونەی تۆ زادەی کەربو کینی شەخسیو کۆمەڵێك باری سەرنجی سەرڤە سەرڤەیە(سەتحی) دەرهەق بە میوان، ئەویش لە کاتێکی نالەباردا. بە هەرحاڵ من ئامادەم کۆتایی بەم مەسەلەیە بێنمو دەگەڵ میواندا زەماوەند بکەم، بەڵام ئەمە بە هیچ جۆرێ بەر لە هەیڤی حوزەیران ناچێبێ. تاقە شتێك کە لەوەیە لەم بڕیارەم ژێوان بکاتەوە ئەمەیە کە ئەو ئاشقی کەسێکی دیکە ببێت، یان من لەم ماوەیەدا حەز لە کیژێکی دیکە بکەم، چونکە ئەو هەستو سۆزەی کە سەبارەت بەو هەمە هەرچەندە ناپایەدارو ناکامڵە، هێشتا وەکو ڕۆژانی هاوینو پایزی ئەمساڵ پاکە. هەستی بنەڕەتی من ئەوەیە کە ژیانێکی خێزانداری پێکەوە بنەم، زۆرم حەز لە ژیانی خێزانداریە، و ئەم کیژە لە هەر هەموو ئەو کیژانەی دی کە من ناسیوومن لە بارترە بۆ ئەو جۆرە ژیانە خێزانداریيەی من گەرەکمە. تەسەوری تۆ دەربارەی ئەمەی کە گوایە کەڵکەڵە و حەزی من بۆ ژیانی خانەوادەیی خەونێکەو زوو لێی وەڕەزدەبم، تەسەورێکی بۆشو بەتاڵە. من هەر بە تەبیعەت ئەهلی

خانەوادەم‌و تەنانەت لە سەردەمی لاویشدا هەمان حەز و کەڵکەڵەم هەبووەو ماوەیەکی زۆرە کە لەم رووەوە هیچ گۆڕانێك بەسەر زەوقمدا نە هاتووە. چەندم باوەڕ بە ژیان هەیە ئەوەندەش لەم مەسەلەیە دڵنیام، تەنیا ئەوە هەیە کە پێویستە بزانم ئایا ئەو، ئەوەیە کە من تەسەوڕم کردووە یان نا،و تۆ ئێستا ناتوانی لەم لایەنەوە هیچ جۆرە داوەرییەك بکەیت، نەك لەبەر ئەوەی تا ئێستا ئەوت نەدیتووە، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە بە تەبیعەت حەز لە رەگەزی ژن ناکەیت‌و دژایەتیەکی تایبەتیت دەگەڵ ئەم کیژەدا هەیە. بە دیدوبۆچوونی تۆ چونکە چەند چین‌و لۆچێکی لەسەر مل‌و گەردنە ، پێدەچی لە ناخ‌و نیهادیشا ناجسن‌و بەدفەڕ بێ، بۆیە هەرگیز ژنێکی باشی لێ دەرناچێت،و بەمجۆرە ڕاوبۆچوونێکی نا واقیعی لەمەڕ ناجسنی‌و بەدفەڕی ئەو دەدەیت، لە کاتێکا ئەم بۆچوونە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ناجسنی‌و بێ ئینسافی تۆیە دەرهەق بەو. با لەوەی پتر لەسەر ئەم باسە نەڕۆین،و بێینە سەر باسێك کە حەزی تۆیە، بێینە سەر باسی داڤیدۆڤ((٢))، تا ئێستا تاقە پولێکی لەسەر بلاوکردنەوەی چیرۆکە سوپاییەکان نەداومەتێ. کابرایەکی زۆر کلاوچی‌و حیلەبازە، دەبێ ئەمە بۆ من ببێ بە پەندو عیبرەت، دەرس لەمە وەربگرم. دەڵێت گوایە ئەوەندەی لێ نەفرۆشراوە کە خەرجی چاپەکەی دەربێنێتەوە، کەچی خەرجی قۆناغی منداڵیەتی‌و قۆناغی خەملین دەرهاتووەتەوە. تا ئێستا نزیکەی سێ سەد رۆبلم وەرگرتووەو تا مانگێکی دیکە سێسەد رۆبلی دیکەش وەردەگرم‌و ئیدی مانگانە ئەوەندە وەردەگرم تا سێ هەزار رۆبڵەکە بە تەواوەتی وەردەگرم. ئیستیقالەکەم، قەبوڵ کراوەو تا چەند رۆژێکی دی ئیدی جلکی مەدەنی لەبەر دەکەم، ئەمەش نزیکەی سێ سەدو پەنجا رۆبلێکی تێدەچێت. لەم بەینەدا چوار لاپەڕەو نیوم شت بۆ گۆڤاری کتێبخانەی خوێندنەوە،و مێژووی نیشتمان نووسیوە کە پارەی جلەکانم بۆ دابین دەکات. چەند رۆژێك لەمەوبەر زانیم کە ئیمپراتۆر بە دەنگی بەرز کتێبی (منداڵیەتی)یەکەی منی بۆ شابانۆ خوێندوەتەوەو گریاوە. ئەمە جگە لەوەی مایەی شانازی منە، خۆشحاڵیشم کە ئەو بوختانەی کە خەڵکانی بەدفەڕو بەدخوا بۆیان هەڵبەستووم بە درۆ دەخاتەوە. چونکە راپۆرتێکیان بۆ خاوەن شکۆو شکۆدارەکان بەرز کردووەتەوە کە گوایە من دوای دانانی سروودی سباستویل، بەسەر فەوجەکاندا گەڕاوم‌و سەربازانم فێری ئەم سرووده کردووە. لە سەردەمی ئیمپراتۆری پێشوودا ئەم جۆرە فایلە زندانی بەدواوە بوو، ئێستاش پێم وایە کە ناوی من لە تۆماری ئیدارەی سێیەم((٣))دا تۆمار کراوەو مۆڵەتی سەفەری هەندەرانم نادەن. ئەرێ دەچی بۆ قەفقاز؟ کەی؟ تکایە وەڵامم بدەوە. من بە دوو هەفتەی دی ئەوجا لە کاری چیرۆکی (لاوی) دەبمەوە.

***پەراوێز:***

***١-میوان: مەبەستی تولستوی لە وشەی میوان، و. و. ئارسنوڤای دڵداریەتی.***

***٢-داڤیدۆڤ: (davydov): ناوی ئەو وەشانکارەیە کە تولستوی کۆمەڵە چیرۆکە سوپاییەکانی خۆی دابویە بۆ چاپکردن.***

*۳-ئیدارەی سێیەم: مەبەست لە دایەرەی پۆلیسی سیاسیە.*

**بۆ و. و. ئارسنوڤا**

**پترزبورگ، ۱۸۵٦/۱۲/۷**

**دوو نامەی تۆم، ئەوەی یەکی مانگی دوانزەو ئەوەی ۲۹ی ئۆکتۆبەرم پیّ گەییوەو چەندین جارم خوێندنەوە. لەو نامانەدا ئامۆژگاریم دەکەی کە بۆ ئاندولوزی بڕۆمو پێت وایە کە دەبیّ تۆم بە هەموو خاڵە لاوازەکانتەوە خۆش بویّ و تۆ بە تەبیعەت نازو عیشوەفرۆشیتو حەزت لەوەیە سەرنجی خەڵکی بەلای خۆتدا رابکێشیت و من دەتوانم بەدەم ڕێی ژیانەوە تووشی کیژێکی چواردە ساڵان یان ژنێکی سیو پێنج ساڵان ببمو... ئەگەر من ژنم هەبوایەو تۆ مێرد، یان باوکت بە هیچ جۆریّ قایل نەبوایە تۆم بداتیّ، ئەوساش - بەبیّ سوعبەت، و خودا شایەدە - جڵەوم بۆ هەستو سۆزان بەردەدا، نە بیرم لە ڕابردوو دەکردەوەو نە لە ئایندە، نەك بە دڵیّ بەڵکو بە سەد دڵ بە جۆریّ ئاشقت دەبوومو لێت نەدبوومەوە کە بە خۆت ماندوو ببویتایەو بتگوتایە: هێدی ترا هێدی ترا لەبەر ئەمە هەوڵبدە وەکو پێویست بچیتە بنجو بناوانی ئەم سەربورەمانەوە. بە هەرحاڵ ئامانجی سەرەکی ئێمە نەشئەوەرگرتن لە ئەشقو ڤیان نیە. ئەگەر ئامانجمان ئەوەبیّ پێویستە جڵەوی هەست و ئارەزووەکانمان بەتەواوەتی بەربدەین و بیر لە هیچ شتێکی دیکە نەکەینەوە. بەڵام ئامانجی ئێمە جگە لە ڤیان و خۆشەویستی، پێکەوە ژیان و ئەنجامدانی هەموو ئەرکەکانی ژن و مێردایەتی و هاوسەرییە. بۆیە پێوستە زۆر بەجدی لە بیرو هەستی خۆمان ورد ببینەوەو شیبکەینەوە، چ پێش زەوجین و چ پاش زەوجین، پەناوەبەر هزرو بیران بەرین. من پیاوێکی خۆپەرستم، بەدەمی خۆم ئەمە دەڵێم، بەڵام ئەمە شەش مانگی ڕەبەقە کە بۆ گۆرینی ئازیزترین عادەتێن خۆم، لەشەڕ و قەرقەشەدام، کەچی تۆ جگە لە خۆشویستێن و تێربوون لەم جوانترین نیعمەتەی جیهان، هیچ مەبەست و خەمێکی ترت نیە و لە ڕای ئەوەدا نەك هەر ئامادەنیت خۆت چاك بکەیت، بەڵکو ئامادەنیت لە پێناوی ئەوەدا دەستبەرداری کەمترین لەزەتیش ببی. ئایا دەشێت تۆ وا تەسەوربکەی کە ئەگەر من لە جیاتی تۆبم هەرگیز ناتوانم ئەو ڕەوتو ڕێبازەی تۆ بگرمەبەر؟ یانی وەکو گەڵایەکی لەرزۆکی بەردەم با بمو لە جوانترین هەستی جیهان، ئەوپەڕی لەزەت ببینم،و کاتیّ کە مەسەلەی ئایندە بێتە پێشیّ بڵێم: "ئەمە یان پەیوەندی بە خودی تۆوەیە"؟ لیّ وێڕای هەموو ئەمانەش تۆ هەمیشە لای من ئازیزی،و بە تایبەتی راستگۆییو میهرەبانیەکەتم، ئەگەرچی وەکو پێویست بە دڵم نیە، لە هەموو شتێکی**

ئەم دنیایە خۆشتر دەویٚ، با بێینەوە سەر ئاینده. بۆ ئەوەی ژیانت بە خۆشی بەریتە سەر خۆت بە کاروباری ماڵەوە، بە مۆزیكو خوێندنەوەوە مژول بکە. دەشتوانی بۆ خۆت مەشغەڵەتی خۆشتر بدۆزیتەوە، چونکە لەوەیە گەلێك لەو مەشغەڵەتو سەرگەرمیانەی کە من بۆتی پێشنیازدەکەم، بە دڵی تۆ نەبیٚ، دەگەڵ زەوقی تۆدا تێکنەکەنەوە. ئەمە شتێکە پەیوەندی بە خۆتەوە هەیە. تۆ ئەگەر بتەویٚو حەزبکەی دەتوانی ئەگەر زۆربەی کاتی خۆت لە گەلەریانی نیگارکێشی- شدا بەسەر بەریت ژنێکی نموونەییو ئایدیاڵ بیت بۆ چراپوڤسکی. ئەرکی چراپوڤسکی کە تۆی خۆشدەویٚو چەند کراسێکی زیاتر لە تۆ دڕیوە، ئەوەیە کە ڕێگەی بەختەوەری بەتۆ نیشان بداتو نەیەڵێت تووشی هەمان هەڵەو خەتایان ببی کە خۆی تورشیان بووەو کردوونی. ئەمانە تەنیا ئامۆژگاریو ڕێنوێنییە، چونکە تۆ چ بخوێنیتەوەو چ وەختی خۆت بە سەردانی دوکانو موغازان بەسەر بەری، ئەنجامەکەی چ باشو چ خراپ، بۆ خودی خۆتە، رووی خۆت دەگرێتەوە، خۆت لێی بەرپرسیاری. بەڵام سەبارەت بە کۆمەڵگە دەبیٚ هەمیشە ئەوەت لەبەرچاو بیٚ، لە بیرو خەیاڵ بیٚ کە شتێکی ترە، مەسەلەیەکی ترە، بابەتێکی ترە. لە مەیاندا دەبیٚ چراپوڤسکی باجی ئاقیبەتی خراپی ئەو شتە بداتو مخابن ئەو ئاقیبەتانە سنووردارو کەم نین. دەبیٚ هەڵسوکەوت دەگەڵ کەسانێکدا بکات کە مایەی ڕێزو حورمەتی ئەو نینو لێیان بێزارەو حەز بە هاوڕێیەتیان ناکاتو پێیان بیٚ تاقەتە. دەبیٚ وەختی خۆی بە فیڕۆبدات، ڕەوتو ڕەوشی ژیانی بە تەواوەتی بگۆڕیٚو قوربانی بە باشترین بەشی ژیانی، واتا بە کارەکەی بدات. ئەمە لە فەرزێکا ئەگەر قەبوڵمان بێت چراپوڤسکی پیاوێکی خۆپەرستی خۆویستەو هەرگیز چاوەڕوانی ئەو جۆرە فیداکاریە لە خاتو دمبیجکایا نەبووە و نابێت. لە زۆر مەسەلەدا هەق بە تۆیە، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە تۆ حەز ناکەی بە شێوەی(پیرەژنان) جل لەبەربکەیت،و من دان بەوەدا دەنەم کە چاوەڕوانی کەماڵو ئایدالیزمێکی مەحاڵم لە تۆ،و ئەو ئەرکانەی کە بۆ تۆی دیاری دەکەم یەك لە یەکی قورسترەو بەم داوا جۆراو جۆرانە تۆم خستووەتە ترسەوە. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا وا چاکترە بەو ڕێگەیەدا بڕۆیت کە پێم نیشان داویتو هەوڵ بدەی هەرگیز لا نەدەیت. جا کۆمەڵگە هەر چییەك بیٚ، تەنانەت ئەگەر کۆمەڵگەی تولا- ش بێت، دەگەڵ ئەو ڕێیەی کە من نیشانم داوە دوو شتی جیاوازن کە هەرگیز پێکڤە ناگونجێنو یەك ناگرنەوە. ئەم کۆمەڵگەیە ڕێگەیەکە بە تەواوەتی لەو ڕێگە جوانە لایداوە. من لەمبارەیەوە بەوپەڕی جورئەتو بنجبڕییەوە بەرگری لە بۆچوونی خۆم دەکەم، ئەگەر لەسەر ئەم باوەڕەم بە زندوویەتیش بسووتێنرێم. حەزدەکەم هەمیشە بەجدی بیر لەم بابەتە بکەیتەوەو بەوپەڕی ڕاستگۆیی بۆچوونی خۆتم بۆ بنووسە خاتوونە ئازیزو نازەنینەکەم! گریمان هەنووکە ئەم فیداکارییە وەکو فیداکارییەك قەبوڵ بکەی، لیٚ دڵنیام هەرکە لەزەتێکی باڵاترت دەست کەوت، ئیدی بیر لەوە هەر ناکەیتەوەو گاڵتەشت پێی دێت. تۆ هەقی خۆتە بە حوکمی تەمەنو ساڵو ئاستی خەملینو پوختەیی خۆت، ژیان وەکو سەرگەرمیەکی پڕ چالاکیو چەلەنگیو خۆش ببینیو تەمەشا بکەی، لیٚ منیش هەقی خۆمە بە قۆناغێکی پڕ ڕەنجو چەرمەسەری بزانم کە تەنیا جارجارێك هەندیٚ

دەمی نەشئە بەخشی تێدەکەوێ. ئەگەر ژنێکی مێشك بەتاڵ نەبیت تۆش دەگەیە ئەم قۆناغە، بەڵام ئاخۆ زوو ئەم هۆشیارییە پەیدا دەکەی؟ رەنگە وەختێ تۆ بگەیتە ئەم قۆناغە کە من ئیدی ژیان بە بارێکی قورس بزانم- یانی تەقریبەن بە هەمان شێوەی زنیکا - چۆن دوو کەسی هەڵگری باوەڕێن بەم ڕادەیە ناکۆکو هەڤدژ دەتوانن یەکتریان خۆش بوێ؟ تەنیا بە مەرجێ دەمانتوانی لەم حاڵەتەدا یەکدیمان خۆش بوێ ئەگەر من ژنم هەبوایە، دەنا لە جیهانی خێزانداری دا ژیان بەم وەزعەوە زۆر زەحمەتەو بە ئاسانی نابرێتە سەر. جا شتەکە لە دوو حاڵ بەدەر نیە یان تۆ دەبێ هەوڵبدەی خۆت بگەیەنیتە من، یان من دەبێ بۆ پاشەوە بگەڕێمەوە تا بتوانین پێکڤە هاو هەنگاو هەڵبکەین. لێ من ناتوانم بۆ پاشەوە بزڤرمەوە (بگەرێمەوە) چونکە دەزانم کە ژیانی باشتر، روناکترو بەختەوەرترم لە پێشە. تۆ ئەسپەکەت بەر مامێزان بدە، تاوی بدە،و منیش بە گوێرەی توانا یارمەتیت دەدەم. ئەم کارە بۆ تۆ یەجگار قورسو زەحمەت دەبێ، بەڵام لە تۆڵەی ئەوەدا نازانی بە چ بەختەوەری، ئارامیو ڤیانو ئەڤینێکەوە - ئەگەر ئەمە بۆ تۆو بە لای تۆوە پێویست بێ - رێگەکە دەبڕینو دەگەینە مەنزڵ. بە دەم رێگاشەوە ڤیانو ئاسودەییو بەختەوەری یاوەرمان دەبنو بە پیرمانەوە دێن.

بۆچی هیچت لە بارەی (دیکنزو تاکری)یەوە نەنووسیوە؟ تۆ بڵێی هیچیانت بەدڵ نەبووبێ؟ ئەدی ئەو کتێبە تورەهاتەی کە خوێندوتەوە چیە؟ "چەند زانیارییەك دەربارەی ئۆپرایان"((١)) بۆچی دەگەڵ ساسنکادا دۆستایەتیت گرتووە؟ بەڕاستی کەسایەتیەکی سەیرت هەیە کیژە خان! هەڵبەتە من هیچ جۆرە دژمنایەتیو ناحەزییەکم دەگەڵ ئەودا  نیە،و واش تەسەور نەکەی کەسێك لە عەلەیی ئەو دواوەو لە پاشملەی گوتووە، لێ چاك بزانە ئەم دۆستایەتیو پەیوەندییە لە قازانجی تۆ نیە. بەبۆنەی ئەم پەیوەندییەوە بیرو باوەڕێکت لە مێشکا ڕیشاژۆ دەبێ کە تەنیا بە درێژاو بە تێپەڕبوونی رۆژگار دەبێ بە تەواوەتی لە زەینت دەربچێت، ئیدی تەرککردنی ئەم بیرانە بۆ تۆ دژوارو قورس دەبێت. بە پۆستەی پێشوودا کتێبێکم بۆ ناردیت. ئەم شاکارە((٢)) بخوێنەوە. یەکێك لە ڕێگەکانی فێربوونی ژیان خوێندنەوەی ئەم جۆرە بەرهەمانەیە. لەو کتێبەدا بیروبۆچوونی جۆراوجۆر سەبارەت بە ژیانو ڤیانو ئەڤین دەربڕدراوە. دەکرێ بە هیچ بیرێکی ناو ئەم بەرهەمە قاییل نەبی، بەڵام هیچ نەبێ وات لێدەکات دەربارەی ئەم مەسەلانە ئاقڵانەترو روونتر ڕابمێنیو بیربکەیتەوە. دیسان کەوتمە وەعزخوانی. بەڵام چ بکەم؟ تەسەور ناکەم بەبێ ئەوە پەیوەندیم دەگەڵ خۆشەویستەکەمدا بپارێزم. تۆش هەندێجار هەندێ شتم فێردەکەیتو کە هەستدەکەم تۆ لەسەر هەقیو هەق بە تۆیە یەجگار خۆشحاڵ دەبم. ڤیان جگە لەمە شتێکی دی نیە، ڤیان تەنیا ماچکردنی دەستی "ئازیزەکەی دڵ" نیە - ئێستا کە ئەم وشەیە بەکاردێنم هەست بە ناڕەحەتی دەکەم - بەڵکو ئاشکراکردنی ڕازو نهێنیەکانی دڵە بۆ یەکترو هەڵرشتنی بیری خۆتە لەبەر رۆشنایی ئاگاداریت لە بیری بەرانبەرەکەتو پێکڤە بیر کردنەوەو پێکڤە

هەستکردنە، واتە هاوبیریو هاوهەستیە. خودا حافیز ئازیزەکەم! دەستەکانت دەگوشمو زنیکاو پینداگسکی لە هەمێز دەگرم.

***پەراوێز***

***١-ئەو دەقە بە فەرەنسی نووسراوە.***

***٢-مەبەست لە (چیرۆکێکی ئاسایی)، ئیڤان ئالکساندرۆڤیچ گونگاروفە (١٨١٢-١٨٧٠).***

## بۆ و. و. ئارسنوڤا
## پترزبورگ، ١٨٥٦/١٢/١٢

دوو رۆژە نامەکەم وەرگرتوویت، بە درێژایی ئەم ماوەیە دوو دڵ بووم لەوەی کە وەڵامت بدەمەوە یان نا؟ چۆن وەڵامێك بدەمەوە؟ دەردی گران چارەسەری بنجبڕی دەوێ. هەر مێخ دەتوانێ مێخ لابەرێ، جێی سندان قوزەڵقورتە. جارێکی دی هەوڵدەدەم ئەوەندەی لە توانامدایە راستگۆیانە قسەت دەگەڵ بکەم، دوای ڕامانو تێفکرینێکی ورد بۆم بە دیارکەوت نامەکەم زۆر ناشیرینو زاڵمانە بووەو هەقی خۆت بووە کە بە خوێندنەوەی ناڕەحەتو قەڵس ببی،و هەر ئەوەشت لە دەست هاتووە. بەڵام وێڕای هەموو ئەمەش لە قسەکانی خۆم ژێوان نابمەوە. چونکە ئەو نامەیە زادەی سەرکردنی حەسودیو غیرە نەبووە، بەڵکو تەنیا دەربری باوەرێك بوو کە من بەشێوەیەکی نا هەموار دەرمبڕی بوو، بەڵام هیچ گۆڕانێك لەم باوەڕەمدا رووی نەداوە. نامەکەی تۆ ئەم بیرانەی لە زەینو مێشکدا چێکرد: یا تۆ هەرگیز منت خۆش نەویستووە،و ئەمەش لە هەموو روویەکەوە هەم بە قازانجی تۆیەو هەم بە قازانجی منە، چونکە ئەوە نیشان دەدات کە ئێمە زۆر لە یەکدی دوورین، یان دەتەوێ بە قسەی زنیکا بکەیتو خۆت سارد بنوێنیو گوایە بەمە ئاگری ئەڤینو ڤیانی من خۆشتر بکەی. بە هەرحاڵ دەستی زنیکا لەم نامەیەدا یەجگار دیارە. "لێ ئەم نێرەنگو فێڵو دەهۆیانە بەسەر مندا تێ ناپەڕن. من مەسەلەکان لەوە بە جدیتر وەردەگرم کە ئەم گەوجە گەوجە ساکارانەیە کارم تێ بکات" ماوەیەکی زۆرە کە رازو نهێنی دڵی تۆ بە ئاشکرا دەبینم((١))" ئەم نەخشەو پلانانە ناتوانن جارێکی دی ئەم نهێنیانەم لێ بشارنەوە. بەڵکو تەنیا لێڵیان دەکەن. کە پێت دەڵێم خۆزیا لە هەوەڵەوە مەیلت نەدەدامێ، ڕاست دەکەمو ئەمە قسەی کانگای دڵمە. هەرچەندە پێشتریش ئەم بیرەم لەلا بوو، بەڵام دوا نامەت ئەم بیرەی زیاتر لەلا چەسپاندم. تۆ لەوە پەستو قەڵسیت کە من جگە لە "ئامۆژگاریو پێشگۆیی" هیچی ترم لە دەست نایەت، باشە ئەوە نابینی

**که نەخشەو پلانەکانم دەربارەی ئایندەو بیروبۆچوونم دەربارەی چۆنیەتی ژیانو چەمکی چاکەو چاکەکاری دەگەڵ تۆدا باس کردوووە؟ ئەمانە بۆ منو بەلای منەوە هزرێن گرانبەهانو بە دەم گریانو روندکەوە دەیانخەمە سەر کاغەز. باوەڕ بە قسەکەم بکە هەرچەندە بەلای تۆوە جگە لە "پێشگۆییو وەعز" هیچی تر نیە. ئاخر ئێمە چ شتێکی هاوبەشمان هەیە؟ ئینسان بە گوێرەی ئاستی پوختەییو گەشەکردنو کەسایەتی خۆی ئاشقێنی دەکات. دەزگیرانەکەی ئالنیکا کە دەیویست ئەشقی خۆی بنوێنێ باسی (ئەشقی بالاّ)ی دەکرد، بەلاّم من، ئەگەر بشمکوژن ناتوانم باسی ئەو تورەهاتانە بکەم. هەروەها باوەڕم پێبکە، بە درێژایی قۆناغەکانی پەیوەندیم دەگەڵ تۆدا، بەو پەڕی تواناوە راستگۆیانە رەفتارم دەگەڵ کردویتو نهوژی (ئیستاش) دەرهەق بە تۆ هەست بە جۆرە خۆشەویستییەك دەکەم. هەمیشە بە شێوەیەکی دڵسۆزانەو لە کانگای دڵەوە وام وێناکردووە لە هەر هەموو ئەو کیژانەی کە ناسیوومن باشتریتو هەرکاتێ خۆت مەیلت لێ بێ من دەتوانم دەگەڵ تۆدا بەختەوەرو شادمان ببمو هەروەها شادمانی تۆش، بەو چەمكو مانایەی کە من لە شادمانیو بەختەوەری گەییشتووم، دابین بکەم. بەلاّم لە یەك لایەنەوە خۆم بە خەتابار دەزانمو داوای بوردنت لێدەکەم: ئەویش ئەوەیە بەبێ ئەوەی قەناعەت بە خۆم بکەم کە ئایا تۆ حەزت لێیە پەی بە نهێنیو بیرو هەستەکانم بەریت یان نا، هەندێ باسو خواسم هێناوەتە گۆڕێ کە رەنگە زەروری نەبووبن، و بووبنە مایەی ناڕەحەتی تو. لەمبارەیەوە زۆر هەست بە کەمتەرخەمی خۆم دەکەم. بەلاّم تۆ هەڵبدە بمبەخشیت تا دۆستایەتیەکەمان بپارێزین. ڤیانو زەوجین جگە لە دەردو ئازار هیچ بەرێکی تری بۆ ئێمە نیە، بەلاّم دۆستایەتی، پێموایە بۆ هەردووکمان سوودمەندە، و هەر چەندە من وەکو تۆ ناتوانم سنووری دۆستایەتی بپارێزم، بەلاّم وا وێنا دەکەم کە دەرەقەتی پاراستنی ئەم دۆستایەتیە بێم. هەروەها تەسەوردەکەم من بۆ ژیانی خانەوادەیی دروست نەبووم، هەرچەندە ئەو ژیانەم لە دنیادا لە هەموو شتێکی دی پێ خۆشترە. تۆ شارەزای خوو مگێزی دەم دەمی، گوماناویو ناپەسندی منیت. تەنیا خودا دەزانێ ئایا رێگەیەك بۆ چاك بوونی ئەو مگێزە هەیە یان نا؟ لەوەیە ئەشقێکی ئاگرین کە هێشتا نەهاتووەتە پێشێ، یان ئەگەر هاتبێتیش تا ئێستا ئیمانم پێی نەبووە، بتوانێ من چاك بکات. لە نێو هەموو ئەو ژنانەدا کە ناسیوومن هەمیشە تۆم خۆش ویستووەو خۆشم دەوێی. بەلاّم ئەم خۆشەویستییە زۆر لەوە کەمترە کە بتوانێ من بگۆڕێت.**

**خودا حافیز ڤالریا فلادیمیروڤنای ئازیز! مەسیح یارو یاوەرت بێ. لە یاسنایا ئاگادارم بکەوە ئایا بە هەموو ئەمانەوە دەتوانم لە هەیڤی یەك دا بێمە دیدەنیت یان نا؟**

***دڵسۆزت***

***کۆنت. ل. تولستوی.***

**پەراوێز:**

***١-ئەو ڕستەیەی ناو جووتکەوانەکە لە ئەسڵی نامەکەدا بە فەرەنسی نووسراوە.***

## بۆ و. و. ئارسنۆڤا
## پترزبورگ، ١٨٥٧/١/١

**ڤالریا فلادیمیروڤنای ئازیز**

زۆر سوپاس بۆ دوا نامەت چونکە ئارامی کردمو تاڕادەیەك باری قورسی سەر دڵی سووك کردم. بەردەوام سەرزەنشتی خۆم دەکرد کە بۆچی ئەو نامەیەم نووسیو تۆم پێ تووڕەو ناڕەحەت کرد؟ دانی پێدا دەنێم کە ڕەفتارم بەرانبەر بە تۆ زاڵمانە، نا هەموارو ناپەسند بووە. کە یەکمان بینی بە دوورو درێژی بۆتی باسدەکەم کە بۆچی تا ئەم ڕادەیە لە خۆم بێزارم.

ئەمڕۆ ساڵی نوێ دەست پێدەکات، و لە ناخی دڵەوە خۆشحاڵم کە ساڵی تازەم بە نووسینی نامەیەك بۆ تۆ دەست پێدەکات. لە خودای بەرزو باڵا داوایە کە ساڵی تازەت لە ساڵی رابردووت پڕ خۆشی ترو کامەرانتر بێو بە ئاواتەکانت بگەیت، چونکە تۆ شایستەی بەختەوەریت. من بە ئاهەنگێن جەژنو ئامادەکردنی بابەت بۆ گۆڤاری سەردەم((١))و ململانێ دەگەڵ سانسۆر((٢))و رۆتینیاتی وەرگرتنی پاسپۆرت - ەوە لێرە گیرۆدە بووم. بە هەرحاڵ ئومێدەوارم تا دوو هەفتەی دی بتبینم، لێ دووریش نیە، بە دیداری تۆشاد نەبم. دەربارەی چۆنیەتی ژیانی خۆم لەم قۆناغی خامۆشیەمدا نازانم چی بنووسم؟ بێتاقەتو تەمەڵی، زۆربەی کات خەمو پەژارە بەرۆکی گرتووم، بەخۆیشم هۆیەکەی نازانم. گۆشەگیریو تەنیایی سەرو دڵم دەگرێتو ناتوانم لەگەڵ خەڵکیدا تێکەڵ ببم. من خۆم لە خۆما پەستو بێزارو بەد مجێزو توندە تەبیعەتم، کەچی داوای گەورەشم لە خەڵکی تر هەیە: داوای زیاتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرێت. بە درێژایی ئەم ماوەیە هیچ کارێکی باشم ئەنجام نەداوەو ئەمەش زۆری پەستو قەڵس کردووم. زۆر گوێ لە مۆزیك دەگرم، دوێنێ گوێم لە (تریوی)یەکەی بهتوڤن گرتو لەم ڕێگەیەوە هاتنی ساڵی نوێم پیرۆز کردو بیرم لە تۆو لەو کاریگەرییە کردەوە کە لەگێن بوو ئەم پارچە مۆزیکە لە تۆی بکات. سبەینێ هەرکە دوکانو بازاڕ بکرێتەوە، چەند نۆتێکی موزیکی جوانت بۆ دەنێرم. هەزار سڵاوو درود لە زنیکا، و هەروەها لە ئولگا فلادیمیروڤنا و

پیندیگاسکی! خودا حافیز! لە ناخی دڵەوە دەستە جوانەکەت دەگوشمو هەوڵدەدەم لە دەرفەتێکی لە بارتردا نامەت بۆ بنووسم. ئەمڕۆ لە ڕادەبەدەر هەست بە خەمباری دەکەم.

*دڵسۆزت*

*تولستوی.*

***پەراوێز:***

***١-یەکەمین بەشی چیرۆکی (لاوی) لە ژمارەی مانگی یەکی ١٨٥٧ی گۆڤاری سەردەمدا چاپو بلاو بووەوە.***

***٢-دایەرەی سانسۆر، بڵاوبوونەوەی چیرۆکی (دەرەجە لێ سەندنەوە)ی قەدەغە کرد، هەروەها ئیدارەی سانسۆری ئاینی- ش ڕێگەی چاپکرنی فەسڵی پێنجەمو شەشەمی چیرۆکی (لاوی) نەدا.***

## بۆ و. و. ئارسنوڤا
## مۆسکۆ، ١٨٥٧/١/١٤

**ڤالریا فلادیمیروڤنای ئازیز**

هیچ گومانێك لەوە نیە کە من بەرانبەر بەخۆمو بەتایبەتی بەرانبەر بە تۆ زۆر خەتاباروکەمتەرخەمم، بەڵام چی بکەم؟ ئەوەی من لە وەڵامی نامە کورتەکەی تۆدا، کە ئاگادارت کردبوومەوە چیتر نامەت بۆ نەنووسم، نووسی بووم((١)) هەقیقەتی تەواوەو ناتوانم هیچ شتێکی دیکەی بخەمە سەر. هیچ جۆرە گۆرانێك لە مندا، سەبارەت بە تۆ ڕووی نەداوەو هەست دەکەم هێشتا وەکو جاران، یانی بە شێوەی دۆستێك بەردەوام خۆشم دەوێی. هیچ شتێکم لەم دنیایەدا پتر لە دۆستایەتی تۆ لەلا شیرینو پیرۆز نیە، چونکە هیچ ژنێك میناکی تۆو بەم ئەندازەیە لە دڵی مندا جێی خۆی نەکردووەتەوە. بەڵام ئەگەر نە توانم هەمان ئەو هەستەی کە لە تەبعی دلۆڤانو پڕ سۆزو لە ئاسمانی گەورەییو سەروەری تۆوە بەسەر مندا دادەبارێت، بەرانبەر بە تۆ دەربڕم چی بکەم؟ من بە شێوەیەکی ئاڵۆز هەستم بەم حەقیقەتە کردبوو، بەڵام ئێستا دابڕانی دوو مانگەی ئێمە ڕەوتو ڕەوشی ژیان بە نەفەسێکی تازەو بە چالاکیو ئەرکو کۆمەڵێك ئیلیتزاماتەوە کە بە هیچ جۆرێ دەگەڵ ژیانی خانەوادەییو خێزانداریدا سازگار نیە، لە جاران زیاتر باوەڕو بۆچوونی لەمبارەیەوە چەسپاندووم. من ڕێبازێکی ناپەسەندم سەبارەت بە تۆ گرتە بەر، بەم

مانایەی کە بێ ئیتخیار خۆم بە سۆزو گودازان سپاردو ئێستا ئەگەر جارێکی دی بۆ لای تۆ بگەڕێمەوەو جارێکی دیکە خۆم بە شەپۆلی هەستو سۆزان بسپێرم، ڕێگەیەکی ناپەسندتر هەڵدەبژێرم. هیڤیدارم باوەڕم پێبکەیت کە تا نهو تاقە یەك وشەی ناراستگۆیانەم بۆ تۆ نەنووسیوەو ئەگەر وام بکردایە هەڵبەتە تۆش کەمێك مەحەبەتت بەرانبەر بەمن دەبوو. تا چەند ڕۆژێکی دی بەرەو پاریس دەڕۆم، خوا دەزانێ کەی بۆ روسیا دەزڤڕمەوە(دەگەڕێمەوە). پێویست بە گوتن ناکات هەرکاتێ نامەیەکی چەند وشەییم بۆ بنووسیت خوشحاڵو ئاسوودە دەبم. ئەدرەسەکەم بریتییە لە: پاریس، شەقامی ریوڤای ژمارە ٢٠٦، خودا حافیز ڤالریا ڤلادیمیروڤنای ئازیز. هەزارو یەك سوپاس بۆ دۆستایەتی تۆ، داوای بوردنت لێدەکەم کە ئەم دۆستایەتیە سەریەشەیەکی زۆری بۆ دروست کردوویت. توخوا بەڵکو داوا لە خانم ڤورگانی بکەی چەند وشەیەکم، تەنانەت ئەگەر جوێنیش بووە، بۆ بنووسێت. دەزانم پێت وایە کە من ڕووبینی دەکەم بەلاّم سوێندت بۆ دەخۆم کە تۆ بەم کارە پیاوێکی دڵپاکو بێ غەلو غەش شادمان دەکەیت،و حاڵبوکی من لە ئاستی پڕ سۆزیو دڵسۆزی تۆدا ناکەمە نینۆکی پەنجەیەکی تۆو، تۆ نقومی نەگبەتی دەکەم.

خودا حافیز ڤالریا ڤلادیمیروڤنای ئازیز. مەسیح یارو یاوەرت بێ. تۆش، وەکو من، ڕێگەیەکی جوانو شکۆدارت لەبەردەمدایە. لە خودای گەورە دەپاڕێمەوە ئەم ڕێگایەت بەرەو بەختەوەری ببات،چونکە نەك جارێ، هەزار جار شایەنی بەختەوەریت.

*دڵسۆزت*

*کونت . ل . تولستوی*

*پەراوێز:*

*١-بڕوانە دەقی نامەی بەرواری ١٨٥٦/١٢/١٢*

## بۆ و. و. ئارسنوڤا

## پاریس ، ١٨٥٧/٢/٢٠

**ڤالریا فلادیمیروڤنای ئازیز!**

ئەمڕۆ نامەکەتم پێگەیی، زۆری پێ شاد بووم. چونکە بۆی سەلماندم کە تۆ من بە بابایەکی ڕێگری تاوانباری خەتاکار نازانیت، وەکو پیاوێکم تەمەشا دەکەیت کە پەیوەندی زۆر نزیکی دەگەڵتا هەبووەو دۆستایەتیو حورمەتی خۆت دەربارەی ئەو پاراستووە. نازانم چ وەلاّمێکی ئەو

پرسیارە بدەمەوە کە لێت کردووم؟ پرسیوتە ئاخر لەبەر چی؟ من قەولی شەرەفت دەدەمێ، سوێندت بۆ دەخۆم – جا منێك کە هەرگیز درۆم دەگەڵ نەکردویت سوێند خواردنی دەوێ؟– کە هیچ هۆیەك بۆ گۆڕینی هەڵوێستی من سەبارەت بە تۆ لە ئارادا نیە. ڕاستت دەوێ هیچ جۆرە گۆڕانێك رووی نەداوە. من بەردەوام بەتۆم گوتووە نازانم چ جۆرە هەستێکم بەرانبەر بە تۆ هەیەو هەمیشە وام هەست کردووە کە پەیوەندی من دەگەڵ تۆدا کەمو کوڕییەکی تێدایە. ماوەیەك بەر لەوەی گوندی بەجێ بێڵم، ژینگەی تەنیایی، دیداری بەردەوامم دەگەڵ تۆدا، بە تایبەتی سیماو ئەدگاری دڵگیرو لەوانەش گرینگتر تەبیعەتو خوودی تۆ کردیانە کارێك وا هەست بکەم، وا وێنا بکەم دڵدارو ئەڤینداری تۆم، بەڵام هەمیشە هەستم بە کەمو کورتییەك، بە کێماسییەك دەکردو ئەم ڕاستیەم لە تۆ نەشاردووەتەوەو هەر لەبەر ئەمەش بوو ڕێگەی پترزبۆرگم گرتە بەر. لە پترزبۆرگدا گۆشەی تەنیاییم هەڵبژارد. نەبینینی تۆ سەلماندی هەرگیز ئەڤینداری تۆ نەبوومو نابم،و لە کاتێکدا هەر هەڵەیەك لەم رووەوە دەبووە مایەی نەگبەتیەکی گەورە چ بۆ منو چ بۆ تۆ. ئەمە کورتەی سەربهوردەکە بوو. هەڵبەتە گومان لەوەدا نیە کە ئەم ڕاشکاویو کراوەییەی من زۆر خراپ بووە، دەمتوانی هەر خۆم تاقی بکەمەوەو تۆ تووشی ئەم حاڵەتانە نەکەم، لێ هەڵەم کردو نهوژی باجی بێ ئەزموونی خۆم دەدەم. لە ئاگری پەشیمانیدا هەڵدەقرچێمو ئازار دەکێشمو داوای بوردن لە تۆ دەکەم، بەڵام نابێ تاوانی نادروستیو بێ نەزاکەتیم بدەیتە پاڵ. ئیدی چ بکەم؟ هەڵەیەکەو کردوومانە. بەڵام وێڕای ئەمەش هەقە هەوڵبدەین دۆستایەتیەکەمان بمێنێو بپارێزین. من بەش بە حاڵی خۆم حەزدەکەم لەم بارەیەوە سەرکەوتوو ببمو هەرشتێك پەیوەندی بە تۆوە هەیەو هەمیشە مایەی پەسندو ڕەزامەندی من بووە، لەلای خۆمو لە بیری خۆما. بپارێزم.
ڤرگانیکا لە نامەکەی خۆیدا سەلماندوویەتی کە بە ڕاستی ژنێکی نازەنینەو هەمیشە بە هەمان ڕێزو حورمەتەوە لە یادی مندا دەمێنێ، ڕاستە کە رەفتاری دوور لە لۆژیك بووە، بەڵام دوای هەستو سۆزی پڕ جۆشو تینو تاوی سۆزەکانی خۆی کەوتووە. دوو هەفتەیە لە پاریسم، ناتوانم بڵێم کە سەفەرێکی خۆشە یان سەرگەرمکەرە، بەڵام سەفەرێکی یەجگار بە سوودە. بە تەمام بەم زووانە بچمە سەفەری ئیتاڵیا.
ئەی تۆ لە سوڤاکوڤی جواندا چۆن بەسەر دەبەی؟ ئایا هێشتا هەر بە مۆزیكو خوێندنەوەوە مژولی، یان تەمەڵیو بێتاقەتی گرتووتی؟ لە خودام داوایە چالاكو چەلەنگت بکا.
نابێ هەرگیز پەستو بێزار ببی. فەرەنسیەکان بە شێوەیەکی پەرجوئەنگێز بەرهەمەکانی بتهۆڤن لێدەدەنەوە. مەگەر هەر خوا بزانێ کە گوێگرتن لەم مۆزیکە کە بە دەستی باشترین ژەنیارانی جیهان دەژنەرێ چ نەشئەیەکم پێ دەبەخشێ.
خودا حافیز دۆستی ئازیزم. بە گەرمی و بە توندی دەستت دەگوشمو هەمیشە موریدو موخلیسی راستگۆو راستەقینەی تۆ دەبم.

***کونت . ل. تولستوی***

## بۆ. ا. س. تورگینیف
## جنیڤ، ١٨٥٧/٣/٢٨

**ئیڤان سرگویوفیچی ئازیز**

دەمەویٚ بەلای کەمەوە نامەیەکی کورتت بۆ بنووسم، چونکە بە درێژایی ماوەی سەفەرەکەم هەر بیرم لای تۆ بوو. دوێنیٚ شەو نزیکەی سەعات هەشت، کاتیٚ کە لە قیتاری نەعلەتی رزگار بووم‌و شوێنێکم لە بەشە سەر بەتاڵەکەی گالیسکەیەك دەستکەوت‌و شەوێکی هەیڤەشەوی دڵگیرم بینی‌و جارێکی دیکە هەراو زەنای شەقامانم بەر گویٚ کەوت‌و بۆنی شارم بەسەرا هات لە چاوتروکانێکا هەرچی خەمم هەبوو رەوییەوە، یان بە گوتەیەکی دی گوڕو تینێکی مەنگ‌و خۆشم تێگەڕا، چەند باشم کرد کە ئەم سدومەم(١) بەجێهێت. پیاوی چاك بە تۆش سەفەری شوێنیٚ بکە. بەلاٚم نەکەی بە قیتار سەفەر بکەی. قیتار بۆ سەفەر وەکو ئەوەیە بۆ ئاشقێنی بچیتە قاحبەخانە. بەم مانایەی کە شوێنێکی ڕەحەتە بەلاٚم لە رووی میکانیکییەوە دوورە لە زەوقی ئینسانی‌و لە ڕووی یەکهاویشەوە یەجگار تاقەتبەرە. باش بوو خۆم لەم قیتارە رزگار کرد. لەسەر سنوور یەکێك ناوی نووسیم – من رۆژی ٢٨ی مانگ بە گوێرەی کاتی خۆمان سەفەرم کرد– بە درێژایی ئەو شەوە خۆشە بەهارییەی کە تریفەی هەیڤ ناسکییەکی تایبەتی پیٚ بەخشی بوو، بە تاقی تەنیا لەسەر کورسی گالیسکەکە رۆنیشتبووم‌و بەخاکی جوانی سویسرادا سوڕامەوە، بەلاٚم کە گەییمە جنیف تولستوی ییەکانم(٢) لەوێندەر نەبینی‌و ئیدی ناچار هەموو شەوەکەم بە تەنیٚ بەسەر برد، و زۆرم لەزەت لە هەیڤە شەوو دیمەنی دەریاچە بینی، و هەنگیٚ خوا بەختەکی کتێبێکم کردەوەو سەیرم کرد یەکێکە لەو ئینجیلانەی کە ئەنجوومەنی بلاٚوکردنەوەی ئینجیل لە هەموو ژوورێکی ئوتێلاندا دای دەنات،و ئێستا لە ڕادەبەدەر شادو خۆشحاڵم، ئەوەندە شادم کە لە کەیفان روندك لە چاوانم دێنە خواریٚ‌و لە هەرەتی شادیدا پەی بەوە دەبەم کە لەم جۆرە هەڵوێستانەدا بەردەوام تۆم لە بیری‌و لە خوای گەورەم داوایە کە هەمان کەیف‌و شادمانی‌و تەنانەت پتریش بە نسیبی تۆ بکات. یەك مانگ‌و نیوم لە سدوم بەسەر برد. زەلکاو خەریك بوو بەرە بەرە روحی دەلەوتاندم، حیکایەتی پەیوەندیم دەگەڵ دوو ژن داو دیتنی دیمەنی ئیعدام بە گیوتن (ملپەڕێن)و تەمەڵی‌و بێکاری، بەرە بەرە هزرو بیریان پەرت‌و پەریشان دەکردم. تۆ پیاوێکی پابەند نیت بە داب‌و نەریت‌و پڕەنسیپێن ئیتیکییەوە، کەچی ژیانت زۆر لە ژیانی من ئیتیکی ترە، لەگەڵ هەموو ئەمەشا دڵنیام لە ماوەی ئەو شەش مانگەدا کە لە پاریس بوویت، زۆر بیرەوەری ناخۆش لە هزرو زەینتدا کەڵەکە بووە. بە جددی دەڵێم بە گالیسکە سەفەر بکە یان شەوێك لە گوند بەسەر بەرەو بەبیٚ هیچ ترس‌و دوو دڵییەك، بە کەیفی دڵی خۆت بگری‌و هەرچی فرمێسکت پێیە هەڵیڕێژە ، هەنگیٚ دەبینی چەند باری لەشت سووك بووەو چۆن هەست بە شادی‌و چالاکی دەکەی. بێزەحمەت تاقیب بکە بزانە پەیوەندی ئارلوف(٣) دەگەڵ شازادەخانم لوڤونادا لە چیدایە؟ وا تەسەوردەکەم کە نیازەکەی من خەریکە دێتە دی. تۆ هەقی خۆتە وا تەسەور بکەی کە ئارلوف مێردێکی باش دەبیٚ بۆ شازادەخانم، بەلاٚم گریمان ئەگەر زەماوەندی

ئەوان سەر نەگریٚ، ریٚك و ڕاست پیٚم بلٚیٚ ئایا لەگینە کیژیٚکی ئاوها بە من ڕازی ببیٚ؟ مەبەستم ئەمەیە ئایا ئەم بیرو خەیاڵەی کە دوور نییە من بخوازم زەماوەندی دەگەڵ بکەم، بیریٚکی نابەجیٚ و گاڵتەئامیٚز نیە؟ هیٚندە لە نەشیاوی و مەحاڵی ئەمجۆرە زەماوەندو زەوجینە سەیرو سەمەرەیە دڵنیام کە گاڵتەم پیٚ دیٚ لەمبارەیەوە شتیٚکی بۆ بنووسم. دەزانی ئەگەر بمتوانیبایە بە ئیمکانی پیٚشهاتیٚکی واهی باوەڕ بیٚنم، بۆم دەسەلماندی کە منیش دەتوانم ئاشقیٚنی و خۆشەویستی بکەم. من دەزانم ئیٚستا بزەیەکی تەوس ئامیٚز، خەمناك و زادەو هەڵقولاٚوی نیگەرانی، بەلا لیٚوتەوە بەرجەستە بووە. هەڵبەتە مەبەستم لە خۆشەویستی و ئاشقیٚنیە، بە شیٚوازی خۆم، تەسەوردەکەم دەرەقەتی دیٚم. خودا حافیز دۆستی ئازیزم! هیوادارم ئەوەی بۆم نووسیوویت، بەنیشانەیەکی دیکەی ئەو بۆچوونەی لە قەڵەم نەدەیت کە لە زەینی خۆتا سەبارەت بە کەسایەتی من دروستت کردووە. شکۆو جوانی مرۆڤ لەوەدایە کە هەندیٚجار بە خۆیشی نازانیٚ چ دەبیٚ. قاتری(هیٚستر) پیرو فەرتۆس هەندیٚجار هەوسار دەپچڕیٚ و هەڵدەتزینیٚ، روحی منیش حاڵی حازر شتیٚکی چاوەڕوان نەکراوی سەیری لەو بابەتەیە، بەلاٚم زۆر راستگۆیە.

***پەراویٚز:***

***١-سدوم (Sodome): شاریٚکی کۆنی فەلەستینی کۆن بووە، لە نزیکی دەریای مردوو بووە، کە بە پیٚی تەورات بە هۆی فسق و فجوری خەڵکە گەندەڵەکەیەوە ویٚران بووەو دەگەڵ شاری "گمور"دا لە ئەنجامی ئاگر بارانی ئاسمانییەوە ویٚران بووەو نەماوە. تولستوی پاریسی بە هۆی فسق و فجورییەوە بە سدوم شوبهاندووە.***

***٢-تولیستوی ییەکان: مەبەست ئەلکساندراو ئیلیزاڤیتایە کە خزم و کەسی لیڤ تولستوی بوون.***

***٣-تولستوی لەو ماوەیەدا کە لە پاریس دەبیٚ زۆر کەس دەناسیٚت، کە شازادەخانم لوڤوناو شازادە ئارلوف لە جوملەی ئەوانەن. تولستوی بۆ ماوەیەکی کەم حەزی لە شازادەخانم لوڤونا کردو پەیوەندی ئاشقیٚنی دەگەڵیا بەست و زەماوەندی نیٚوان ئارلوف و لوڤوناش سەری نەگرت.***

**بۆ و. و. ئارسنوڤا**

**مۆسکۆ ، ١٨٥٧/١٢/٦**

**ڤالریا فلادیمیروڤنای دلۆڤان**، سوپاست دەکەم کە منت بیرکەوتووەتەوە. نامەکەت ، چونکە چاوەڕوانی شتی وا نەبووم، زۆری خۆشحاڵ کردم. مخابن کە بیٚ زەوق و حەواسیت، و وەکو پیٚویست لەزەت لە ژیان نابینی. باشە لە چیت کەمە؟ بە ئاواتەوە بوویت لە پترزبۆرگدا ژیانیٚکی

سەربەخۆت هەبێتو ئێستا ئەوەی مرۆڤ ئارەزووی دەکاتو هەقی ئارەزووکردنی هەیە، لە تۆدا هەیە، گەنجایەتی، جوانی، سەربەخۆییو دۆستێکی میناکی ڤرگانیکا،و هەروەها ئەویندارێکی دوو ئاتەشەی میناکی تالیزین((١)) کە شێتو شەیدای تۆ بووەو خودا خودایەتی تەوقی کۆیلایەتی لە گەردەن بکات.. بە هەرحاڵ، ویستو بەرنامە لە ژیاندا یەجگار پێویستە. جا ئەگەر بە و هەموو ئیمتیازو هەلومەرجە لە بارەوە، لە هەر شوێنی بوویتو لە ژیان ڕازی نەبووی، هەوڵبدە بەرنامەیەکی باشتر بۆ خۆت داڕێژە. بڕۆ بۆ هەندەران، شوو بکە، پەنا وەبەر دێرێك ببە، خۆت لە گونددیدا حەشار بدە، بەڵام نەکەی بۆ تاقە ساتێك دوو دڵو بەگومانو بێ بڕیارو بەرنامە بیت. بێ ئیرادەیی ترسناکترین سیفەتە لە ژیاندا. ببورە کە وەکو جاران دیسان وەسەر مینبەر کەوتومو دەستم بە وەعزخوانی کردوە. زۆر خۆشحاڵم کە وەختێکی زۆر بۆ مۆزیك تەرخان دەکەی. هونەر، لە هەر ڕوویەکەوە تەمەشای بکەی، مایەی لەزەتێکی پاكو پڕ شکۆیە. موزیك هونەری تۆیە، پێویستە لەم هونەرەدا سەرکەوتن وەدەست بێنی. من بە درێژایی ئەم ماوەیە هەر لە مۆسکۆ بووم. تاوێك بە نووسینەوە مژول دەبم،و دەمێك بە هاتووچۆی "پیاوانی فامیدە"وەو بە شێوەیەکی گشتی ژیانێك بەسەر دەبەم کە نە باشەو نە خەراپ،و بە هەرحاڵ تا ڕادەیەك باشە. سەبارەت بە دڵو دەروونم ناتوانم بڵێم بۆشو بەتاڵە، بە پێچەوانەوە لە سایەی لوتفی خواییەوە هەمیشە تەژی هەستو سۆزێن شێتانە دەبێت، یانی بۆ خۆی ئازادێکی هەوسار پچڕیوە، هەمان ئەو ئازادییەی کە تۆ حەزی لێدەکەی.
پێرێ برایەکانم هاتن بۆ ئێرەو نەو هەموو پێکڤە دەژین. ماسنکا لەو دواییانەدا تووشی دان یەشە بووە. بەنیاز نیم بۆ پترزبۆرگ بێم، بەڵام لەوەیە بە بۆنەی ساڵی نوێوە بێم،و هەنگێ بە دوورو درێژی باسی ئەم شتانەی کە دەمەوێ بۆتی بنووسم، دەکەین. کەواتە بە هیوای دیداری نزیك، لە ناخی دڵەوە دەستەکانت دەگوشم، هەروەها دەستی ڤرگانیکا-ش دەگوشم.

***کۆنت. ل. تولستوی***

سڵاوم بە نیکولینکا بگەیەنە. دووبارە سڵاو((٢))

***پەراوێز:***

***١-تالیزین (Talyzin): لە ساڵی ١٨٥٨دا، و. و. ئارسنوڤای خواست.***

***٢-ئەمە دوانامەی تولستوی بوو بۆ ئارسنوڤای جوانو دڵدار.***

## بۆ و. پ. بتکین

## مۆسکۆ، ١٨٥٨/١/٤

**ڤاسیلی پتروڤیچ-ی ئازیز!**

زۆر سوپاس بۆ نامە دوورو درێژو گەرمو گوڕەکەت. بۆچی ئەو نامانەی پێشووتم، ئەوانەی کە بۆت گەڕاونەتەوە، جارێکی دی بۆ نانێریتەوە، چونکە نامەکانی تۆ بۆ من یەجگار بە سوودن. کاتێ بیر لەوە دەکەمەوە کە قەڵەمی من تا ئەم ئەندازەیە بە لای تۆوە گرینگە، هەست دەکەم لە کەیفان باڵم گرتووە. لە نێو ئێمەی کۆمەڵگەی روسیدا مەسەلەو پرسی ئازادی کۆیلان جۆشو خرۆشێکی زۆری ناوەتەوەو لە ئەنجامی ئەوەدا ژیانی سیاسی بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هەموو شتێکی داپۆشیوە، واتە ژیانی سیاسی بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ بووە. ئەنجوومەنە سیاسیەکان، هەرچەندە وەکو پێویست خۆیان بۆ ئەم ژیانە تازەیە ئامادە نەکردووە، بەڵام هەست دەکەن کە پێویستە دەست پێشکەرییەك بکرێ.

لێ ئەوەی ئەنجام دەدەرێ، ئەوەی دەکرێو ئەوەی کەوتووەتە سەرزاران، زۆر قێزەوەرو ترسناکە. تا ئێستا تەنیا یەك خاڵ بەوپەڕی روونی سەرنج ڕادەکێشێت: چینی ئەشراف لەوە حاڵی بووە کە حاڵی حازر هیچ جۆرە مافو ئیمتیازێکی بەسەر خەڵکانی ترەوە نیە، جگە لە مافی موڵکایەتی کۆیلەکان بە گوێرەی پرەنسیپەکانی سیستەمی خان خانەکێی روسیا، بۆیە ئەم مافو ئیمتیازەی زۆر بەلاوە گرینگەو دەستبەرداری نابێت. و لە سەدا نەوەدی نە یارانی ئازادی کۆیلان، لە خەڵکانی هەمە جۆری ئەم چینەن. ژمارەیەکیان بریتین لەو تاکرەوو تورانەی کە خۆشیان نازانن پشت بە کوێوە بدەن، چونکە چ دەوڵەتو چ میللەت ترۆی کردوون. تاخمێکی دیکەیان لەم نێرەنگبازانەن کە لە ئەسلا دژی ئازادی کۆیلەکانن‌و بە ڕواڵەت خۆیان بەلایەنگری ئازادی کۆیلان نیشان دەدەن. پاش ئەوانە دەستەیەك لە بەرنامەڕێژانو نەخشەکێشانی خۆپەرست دێنە ئاراوە کە لە هەموو دەستەو تاخمەکانی دی بێ ماناترو پیسترن. ئەمانە بە هیچ شێوەیەك نایانەوێ دان بەو ڕاستیەدا بنەن کە لە چینەکانی تر زیاترن،و پێیان وایە مافو ئەرکیان لە خەڵکی تر نە زیاترەو نە کەمترە. ئەوانە یان بە نیازنین هیچ هەنگاوێکی پۆزەتیف لەو بوارەدا بنەن یان سوورن لەسەر ئەوەی هەموو خەڵکی روسیا بخەنە خزمەتی بەرژەوەندی خۆیانەوەو هانیان بدەن کە پەیرەوی نەخشە پوچەڵو ستەمکاریەکانی ئەوان بکەن، پاش ئەوان دەستەیەکی خۆسەرو ڕەخنەگرو ئیراگر دێن کە زۆربە پێکدەهێنن. ئەوانە وای بۆ دەچن کە: باسی ئەم بابەتە پەیوەندی بە ئێمەوە نیە، و ئێمە هەرگیز تێکەڵاوی ئەم کێشماکێشە نابین. ئەگەر خەڵکان حەزیان لێیە هەموو مەسئولیەتێك لە ئەستۆ بگرن، بابیگرنو ئازادو سەرپشکن، دەنا بە غەیری ئەم حاڵەتە با وازبێنن ڕەوشەکە وەکو جاران وەمێنێ. دوای ئەوانە ئەشرافانی ئینگلیزی ئاساو باشووردۆستانو سلاڤپەرستان دێن. بەڵام هیچ هەواڵێك لەو تاقمە خەڵکانەوە نیە کە لە رووی دڵپاکیو نیازچاکییەوە خەڵکی لە خۆ کۆبکەنەوەو خزمەتێکیان دەرهەق بکەن. ئاساییە لە نێو خەڵکیدا کەس نیە گوێ لە قسەی هەق بگرێت. کێ گوێ لە قسەی هەق دەگرێت. ئایا پێت وانیە ئەم هەراو هەنگامەو مشتو مڕو گەنگەشانە کۆسپ بن لە بەردەم ئەوەی کە من

بتوانم ئێستا پتر لە هەرکاتێکی دی ئیراد لە تۆ بگرم؟ یانی ئەم هەموو گفتوگۆو گەنگەشەو قەرقەشەو وتارخوانیانە وایان لێکردوم لە گیانی خۆم بێزار بووم. جا بۆ سەلماندنی ئەم حەقیقەتە، پاشکۆی ئەم نامەیەت، پشکۆیەکە کە حەزدەکەم ڕاو دیدی تۆی لەمەڕ بزانم، بۆ دەنێرم. من ئەم جورئەتەم بەخۆم داوە کە بە پەخشانێکی تایبەتی و جوانی دابنەم((١))

"لە خەوما ئەوەی کە لە روحما کەڵەکە بوو بوو، و پێشتر ئاگام لێی نەبوو، هەڵمڕشت. بیرەکانم روناك و بێباك، و ئاهەنگ و تۆنی دەنگم دڵگیر بوو. بە قسەکانی خۆم گەشکەم دەکرد، بە بیستنی دەنگی خۆم شادو بە کەیف دەبووم، لە شوێنێکی بەرزا، کە لە نەوەساندا بوو، بە تاقی تەنیا وەستابووم. برایەکانم، کە لە سەرەتادا هیچیانم نەدەناسی، دەوریان دابووم. زۆر بەزەحمەت سیماکانم لە نزیکەوە دەناسییەوە، بەڵام لە دوورەوە یەك دنیا سەری بێ شوماری نزیکی یەکترم دەبینی کە میناکی دەریا شەپۆلی دەدا. گاڤێ(کاتێ) کە قسەم دەکرد، هێزێکی بەتین و تاو، پڕ جۆش و خرۆش وەکو با هۆزێکی توند کە لە خەرمانی گەڵای هیشك دەدا، ئاپۆڕای خەڵکەکەی تەکان دەدا، و کاتێ کە دەوەستام حەشاماتەکە دەکەوتە ئیسراحەت و میناکی کەسێکی تەنیا بەزەحمەت هەناسەی دەدا. هەستم بە نیگای ملێونان کەس دەکرد کە چاویان بڕی بووە من، و هێزی ئەم نیگایانە دلێری و جۆش و خرۆشێکی فراوانیان پێدەبەخشیم. ئەوانیش منیان تەکان دەدا، رێك وەکو چۆن من هەموو ئەوانم هێنابووە هەلەکە سەما. ئەو جۆش و خرۆشەی کە منی گرتبوو هێزو تواناو، تین و تاوێکی بێ سنووری بە ئاپۆڕا هاڕوژاوەکە بەخشی بوو. دەنگێکی دوورە دەست و نادیارو پێوار لە ناخما بە ئەسپایی دەیگوت: "ترسناکە!" بەڵام هاڕوژانی ئاپۆڕاکە بەسەر دەنگەکەدا زاڵ دەبوو، و جار لە جار پتر گەرمی دەکردم. لێشاوی هزری شێتانە وا دەهاتە بەرچاو کە کۆتایی نایەت. خۆم بەم لێشاوە سپاردبوو. لەم کاتەدا ئەو بەرزاییە سپییەی کە لە سەری ڕاوەستا بووم بەردەوام درێژەی بە نەوەسانی خۆی دەداو زیاتر دەچوو بە ئاسمانا.

بەڵام وێڕای ئەوەی کە هێزی جەماوەری خەڵکەکە تەواو بە جۆشی هێنا بووم و بەرەو پێشی هاندەدام، تۆزێ لەوەپێش هەستم دەکرد کە لە دواشەوە شتێکی بەهێز بەرەو خۆی بکێشم دەکات. لە پڕ لە پشتەوە هەستم بە بەختەوەری کەسێکی تر کردو ناچار بووم بۆ پاشەوە بگەڕێمەوە. ژنێك بوو، بێ جووڵەو دوور لە هەر فیکرو خەیاڵێك. وەستام و کەوتمە تەمەشا کردنی ئەو. شەرمم لە جم و جۆڵی خۆم دەکرد. قەرەباڵغی ئاپۆڕاکە کەمترین ڕێگەی رەتبوونی بۆ ژنەی تاین نە هێڵابووەوە، لێ بە شێوەیەکی پەرجو ئاسا، بە ئەسپایی، بەوپەڕی هێمنی بە نێو ئاپۆڕاکەدا ڕەت بوو، بەبێ ئەوەی بەر کەس بکەوێ. لە یادم نیە ئایا ئەو ژنە گەنج و خشیك بوو، هەروەها جلەکانی و ڕەنگی قژیشیشم وەبیر نایەتەوە، هەروەها نازانم ئایا یەکەمین خەونی ئاڵۆزی ڤیان و ئەشق بوو یان بیرەوەرییەکی ئەشقی دایکانە بوو. تەنیا ئەوەندە دەزانم هەموو سیفەتەکانی تیابوو، و لە سەراپایەوە بە شێوەیەکی ئارام و میهرەبان روناکی هێزێکی لەبن نەهاتوو بەرەو من پرشنگی دەدا. کە ئاوڕێکی تەنیشتی دایەوە لایەکی ڕووی بە دیارکەوت و بۆ تاقە ساتێك نیگای، کە نوری ڤیان و مەحەبەتی لێدەباری، بڕییە من. هیچی لە قسەکانی من هەڵنەدەکڕاند، بەڵام ئەمەی لەبەر گران نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە هاوسۆزی و دلۆڤانی لە

هەنبەرم دەردەبڕی. ئیدی نە لە من و نە لە ئاپۆراکەو نە لە هەراو هەنگامەکەی ئێمە بێزار نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە شادو خۆشحاڵ دەهاتە بەرچاو. پێوستی بە هیچ کەسێك نەبوو، و هەر لەبەر ئەمەش بوو کە هەستم دەکرد ناتوانم بەبیٚ ئەو بژیم. دەگەڵ پەیدابوون و دەرکەوتنی ئەودا، بیرەکان‌و خەڵکەکەو هەراو هەنگامەکە لە کەفلەکونێکا نەمان. لیٚ ژنەکەش دەگەڵ مندا نەمایەوە. تەنیا یادگارێکی گەرم و گوڕو لە یاد نەچووی لە زەینمدا بەجێهێشت. لە خەوەکەمدا زۆڕە زۆڕ گریام و ئەم ڕوندکانە (فرمێسك) یەجگار لە رونـدکی خۆشی و شادییەکەی تۆزێك لەمەوبەر شیرینتر بوون. لە خەو هەستام و فرمێسکەکانم نەسڕین، چونکە فرمێسکەکان تەنانەت بە چاوی کراوەشەوە، تەڕی بەختەوەری و شادمانی بوون."

دەگەڵ تورگینیفدا وەیخوێنن و پێکەوە بڕیارێکی دەربارە بدەن: ئایاشتێکی بیٚ کەڵکە یان نا؟ ئیدی قسە کردن لەمبارەیەوە بەسە. پێویستە دەربارەی بابەتێکی جدی قسەت دەگەڵدا بکەم. لەم قۆناغەی ئێستادا کە لافاوی دەردە سیاسەت خەریکە هەموو شتێك دەگەڵ خۆیدا ڕادەماڵیٚو هونەر دەلەوتێنیٚو دەیەویٚ بە تەواوەتی لە نێوی بەرێت، دەمەویٚ ڕاوبۆچوونی تۆ لەمەڕ کەسانێك کە باوەڕیان بە خۆیبوون‌و نەمری هونەر هەیەو لێبڕاون دەست لە نێو دەست بە خودی هونەرو بە پشتیوانی رەخنەو پەیڤان، پرەنسیپی خۆیبوونی هونەر بسەلمێنن‌و بۆ رزگارکردنی سامان‌و کەلەپورێکی نەمرو سەربەخۆو جیاکردنەوەی لە ڕەوتێکی سیاسی ڕێکەوتەکی‌و یەك لایەنەو پەتا ئاسا، چاکی هیمەتی لێبکەن بەلادا، چیە؟

ئەم کەسانە ناتوانن میناکی ئێمە، یانی تورگینف و تۆو فت‌و من‌و هاوبیرانی ترمان باوەڕیان بە ئێمە هەبیٚو پشت بە ئێمە ببەستن. هەڵبەتە ئەوزارو تفاقی گەییشتن بەم مەبەستە گۆڤارێك ، یان زنجیرە وتارێکە، ئەم گۆڤارە دەبیٚ هەموو ئەو بەرهەمە هونەریانە کە بڵاوبوونەتەوە یان ئەوانەی پاشان بڵاو دەبنەوە بە چاپ بگەیەنێت‌و دەستی ڕەتکردنەوە بە ڕووی هیچ بەرهەمێکی هونەرییەوە چ روسی‌و چ فەڕەنگی، نەنێت. ئەم گۆڤارە دەبیٚ تەنیا یەك ئامانجی هەبێت: لەزەتی هونەری‌و پێکەنین‌و گریان. ئەم گۆڤارە لە خەمی سەلماندنی هیچ شتێك یان تێگەیشتنی هیچ بابەتێکدا نابێت. تاقە پێوەری بۆ هەڵسەنگاندن زەوقی ساغڵەم دەبێت،و هەروەها ناکەوێتە تاقیبی ڕازو ریشەو سەرچاوەی فلان بابەت یان فیسار بیروباوەڕ، یانی بەم پێودانگە هیچ کارێکی بە پێداویستییە گشتییەکانەوە نیەو نابێت. ئەم گۆڤارە لە هەمان کاتدا خوازیاری سەرکەوتنێکی چەندایەتی نابیٚو زەوقی گشتی ڕەچاو ناکات، بەڵکو بەوپەڕی جورئەتەوە خۆی میناکی مامۆستایەکی بە زەوق‌و خۆش سەلیقەو بەهرەمەند بەسەر خەڵکیدا دەسەپێنیٚ. خۆ ئەگەر بخوازم ئاکام‌و ئەنجامەکانی ئەمجۆرە بڕیارو هەنگاوەت بۆ بژمێرم ئەوا ئەم نامەیە درێژە دەکێشێت‌و هەر تەواو نابێت، ئەمە جگە لەوەی درێژەدان بە قسە لەمبارەیەوە، بۆ کەسێکی وەکو تۆ نابەجێیە، چونکە دڵنیام تۆش لەم رووەوە هەمان بیروبۆچوونی منت هەیە،و ئەوەی من دەمەویٚ بۆتی شەرح بکەم، تۆ لە من باشتری تێدەگەی. ئەگەر ئەمە سەربگریٚ کەس وەکو تۆ بۆ سەرنووسەرییەکەی لە بارو شایستە نیە. بۆ خۆت بینایەك دروست دەکەی کە دەستی هیچ

کەسێکی تیا نابێت. خەرجی و بودجەی بڵاوکردنەوەکەی خۆمان، تورگینف و فت و تۆو من و ... دابینی دەکەین.

هیوادارم بیر لەمە بکەیتەوەو بە جددی وەڵامم بدەیتەوە. درێژەم بە چیرۆکی قەفقاز(٢)، کە تۆ زۆرت بە دڵ بوو، نەدا. وەکو خۆم دەمویست ئاوها دەرنەچوو و دوای حەوت جار پێداچوونەوە، بۆم دەرکەوت کە باشترین قۆناغ بۆ دەست پێکردنی من ئەو قۆناغەیە کە لە هەیڤی یەکەوە دەست پێدەکات و لە بەهاردا کۆتایی دێت. ئێستا کارەکەم دەچێتە پێشێ ، بەڵام نازانم ئەنجامەکەی چۆن و چی دەبێت؟ لە ڕەوش و وەزع و حاڵی ژیانم لە مۆسکۆ، ناڕازی نیم. خەڵکانی نەفس بەرزو دلۆڤانی زۆرە. ئەگەر نەخۆشی خوشکەکەم نەبوایە، دەمتوانی لە خانوویەکی باشدا بژیم. بە درێژایی ماوەی زستانەکە هەر بێتاقەت و نەخۆش بووە. هەروەها مۆزیککارانی باش هەیە، خەریکن بەسەرپەرشتی (مرتیە) ئەنجوومەنێکی مۆسیقی دادەمەزرێنن.
نەچووم بۆ پترزبۆرگ و زۆریش مەیلم لە چوون نیە. گریگوڤیچ لێرە بوو. چیرۆکێکی تا ڕادەیەك باشی نووسیوەو لە چەند ڕۆژی ئایندەدا بەرەو ڕۆما سەفەر دەکات.
"فت"ی ئازیز نەخۆش کەوت بوو، هێشتاش بە تەواوەتی چاك نەبووەتەوە. کە نەخۆش دەکەوێ زۆر بیانووگرو بەد ڕەفتار دەبێ! ماریا پیتروڤنای خوشکی چ ژنێکی نازەنینە.
کاڤلین، بەبۆنەی سەربەخۆیی دێهاتیانەوە زیافەتێکی سازدابوو کە، کاتکوف، و ستانکوڤیچ،و پوگودین، و کاڤلین،و پاولف و بابست و کولیوڤ وتاریان دا، بەڵام تەنیا وتارەکانی پاولف و بابیست تا ڕادەیەك باش بوون، ئەم زیافەتە کۆڕو مەجلیسی نەجیمزادانی توڕەو قەڵس کردووە. سلاڤپەروەرەکان نەیانویست بەشداری تیا بکەن، جا با ئەوەشت پێ بڵێم کە ئەم جۆرە زیافەت و دەعواتانەش وەکو ئاهەنگ و زیافەتی بەخشینی نیشانەو میداڵ و پایە، زیاتر بۆ خۆنواندن و خۆ هەڵکێشانە. مرۆڤ هەر مرۆڤە، یانی بوونەوەرێکی لاوازە، تەنیا شەهید نەبێ. تەنیا شەهیدان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە پێناوی چاکەوچاکیدا هەنگاویان ناوە، یانی بێ هیچ ڕتووش و ڕتووشکارییەك، چاکەی خۆیان کردووە. بە پێچەوانەوە، هەموو ئەم پیاوە سیاسیانە کۆیلەی خۆیان و ڕەوتی ڕووداوەکانن،و هەمیشە لە خەمی ناوونیشان و شۆرەت و ناوبانگدان و ئەنجامەکەی بە قازانجی دەوڵەتەو قازانجی دەوڵەت بە زەرەری هەموو مرۆڤایەتی دەشکێتەوە. هەر کەسێك کە بۆ خزمەتی دەوڵەت (حکومەت) چاکی لێ هەڵدەماڵێ، مەبەستی وەرگرتنی نیشان و میداڵەو هەرکە نیشانەکەی وەرگرت، ئاگری نیشتمانپەروەری دادەمرکێتەوە. کێماسی و عەیبی کارێن دەوڵەتی ئەمەیە.
هەرکەسێك ئەم حەقیقەتە بە باشی تێبگات، ناتوانێ شان وەبەر ئەم جۆرە چالاکی و چەلەنگیە بدات. بڕینەوەی دارو درەختێن بێشەیەك. بیناکردنی خانوویەك و ئەنجامدانی کارێن بە سوودی دیکە، جیایە لەم خۆنوێنیێ و خۆ هەڵکێشان و بەرژەوەند پەرستییە.

بە هەرحاڵ خودا حافیز و لە ناخی دڵەوە تۆو تورگینف توند لە هەمێز دەگرم. ئەدرەسەکەم بەمجۆرەیە: شەقامی پیاتنیکایا، خانەی ڤارگین.

دوێنێ ئەو وتارەی کە کوکرۆڤ ئامادەی کردبوو، و نەی توانی بوو بیخوێنێتەوە بڵاوبووەوە. ئەبلونسکی نووسخەیەکی لێ ناردووە بۆ رۆما،و دەتوانی لەوێ بیخوێنیتەوە. کە ئەم وتارەم خوێندەوە، بە هەموو خوێنساردیو ئارامیەکی بێ سنوورمەوە خۆم پێنەگیرا. نەگبەتی لەوەدایە کە عەوامی خەڵکی ئەم وتارەیان بە دڵ بووە. بەڕاستی ترسناکە! خەریکە وردە وردە دێمە سەر ئەو قەناعەتەی کە نەك هەر خەڵکێکی زەوق سزین بەڵکو بێ ئەقڵو بێ مێشکیشینو هەموو پیاوانی پێشەنگو ناوداری ئێمە، جگە لە کۆمەڵێك گەوجو ناپاك چیتر نین.ئەوەش بزانە ، ئەم وتارە تەنیا شرۆڤەیەکی فەرمانەکانی ئیمپراتۆرەو(٣)و تەعمیمێکە کە لە سانسۆر دەرچووە. لە هەموو مۆسکۆدا تەنیا یەك کەس دەناسم کە بە خوێندنەوەی ئەم وتارە قەڵسو پەست بووبێ، ئەویش نیکولایی برامە.

*پەراوێز:*

*١-ئەمە بەشێکە لە چوار بەشی (خەو).*

*٢-چیرۆکی قەقفاز: مەبەست لە چیرۆکی قوزاقەکانە. تولستوی لە نێوان ساڵانی ١٨٥٢- ١٨٦٢دا بەشی یەکەمی ئەم چیرۆکەی تەواو کرد. بەشی دووەمی نەنووسی.*

*٣-مەبەست فەرمانانەی بەرواری ١١/٢٠ و ١٨٥٧/١٢/٧ی ئەلکساندەری دووەمە لەمەڕ ئازادی کۆیلەکان.*

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

## یاسنایا پولیانا، ١٨٥٨/٤/١٤

**دایە گەورەی ئازیزم.**

ئیدی ئەوە بەهار هاتووە! بەڕاستی ئەگەر مرۆڤ باش بێ وشیری پاك بێت، لەزەت لەم دنیایە دەبینێ. تەنانەت خەڵکی وەکو منیش، خۆشحاڵنو لە تەبیعەتو لە فەزاو لە هەموو شتێکدا، ئاوێتەیەکی دڵگیرو لەبەردڵان دەبینن.

هەندێجار مرۆڤ بە هەڵەدا دەچێو وا دەزانێ کە سروشتو تەبیعەت بە تەنیا فاکتەرو سەرچاوەی ئایندەیەکی خۆش نیە، بەڵکو خودی مرۆڤیش دەستی تیادا هەیەو بەم خەیاڵە نقومی خۆشی دەبێت. من حاڵی حازر لە حاڵەتێکی وەهادامو ناتوانم بەو روحە خۆپەرستەی جارانمەوە نامە بۆ تۆ بنووسم. کاتێ تەواو بیر لە خۆم دەکەمەوە دڵنیا دەبم کە جگە لە پەتاتەیەکی کۆنی یەخ بەستەی سوتاوو رزیو کە بەو حاڵەشەوە لە ساسدا کولێنرا بێ، هیچی تر نیم. بەم حاڵەشەوە بەهار کارێکی وای تێکردوم کە هەندێجار وا تەسەوردەکەم ڕوەکێکم تازە

لەگـەڵ هـەموو روەکـەکانی دیـدا دەپشـکوێت تـا بـەرە بـەرە بەوپـەڕی سـادەیی و ئـارامی و زندوویەتیەوە لەم جیهانەدا کە خودا ئەفراندویەتی گەشە بکاتو پەروەردە ببێت. لەم رۆژانەدا هزرو هەستە دەروونیەکانم بە جۆرێ گەشە دەکاتو ڕەوتی خۆی وەردەگرێتو لە پیسیان پاك دەبێتەوە، کە هیچ کەس بەبێ هەبوونی هەستێکی لەو جۆرە، ناتوانێ پەی بە قووڵیو شکۆی بەرێت. هەموو کۆنیەکان، بیرەوەریە تاڵەکان، هەلومەرجە نالەبارەکان، تەمەڵیەکان، خۆپەرستیەکان، گەندەڵکاریەکان، پەیوەندییە بێ سەروبەرو ساختەکان، ئازارەکانو تەنانەت، پەشیمانیەکان بنەوبارگە دەپێچنەوەو شوێنی خۆیان بۆ دیمەنی دڵگیری ئەو گوڵە دڵڕفێنە چۆڵ دەکەن کە شکۆفەکانی خۆی دێنێتە بەر تا پێ بە پێی بەهار گەشە بکەنو پەروەردە بن. کە بیرم دەکەوێتەوە زۆر جاران گیرۆدەی ئەم خەیاڵە پوچە بووم خەم دام دەگرێت، کەچی ئەم خەونو خەیاڵە هەمیشە دڵم تەژی شادی دەکاتو هەندێجار بە جدی باوەڕ بە پشکوتنی گوڵی تازە دێنمو چاوەڕوانی دەکەم. نزیکەی هەفتەیەکە کە لە گوندیمو حاڵم زۆر باشە. حیسابو کیتابی خۆم لە مۆسکۆدا پاك کردووەتەوە. دەرامەتو خەرجیم بەرانبەرە، پاك لە پاك.
بەو وەزعو حاڵو بارو دۆخەوە کە چوومە گوندەوە دووچاری هەستێکی سەیرو غەریب بووم. ئەم هەستە بریتییە لە هەستێکی پڕ جۆشی ئازادی،و ئیمکانی دابەزین لە گالیسکە یان بەپێیان رۆییشتن بۆ هەشتەرخانو یان بادانەوەی سەری ئەسپو تاودان بەرەو پاریسو یان لادان لە یەکەم وێستگەو مانەوەی یەکجارەکی لەوێندەر. ئەمە هەستێکی نەشئەبەخشە کە ژنان ناتوانن وەکو پێویست پەی پێ بەرن. بەڵام پاشان تا لە گوند نزیك تر دەبوومەوە، گۆشەگیریو تەنیایی ئایندەم ، خەمناکتر دەهاتە بەرچاو،و بەم شێوەیە کاتێ کە بەناو گوند کەوتم، وام هاتە بەرچاو کە بێوە پیاوێکمو تا ماوەیەك لەمە پێش دەگەڵ ماڵباتێکی گەورەدا لێرە ژیاومو نهو هەر هەموویانم لە دەستداوە. لە ڕاستیا ئەم ماڵباتە لە دنیای خەیاڵدا بۆ منو لەلای من بوونی هەبووە. چ ماڵباتێکی جوانە! دڵم زیاتر بە کوڕە گەورەکەم دەسووتێ! ژنەکەشم هەرچەندە ژنێکی سەیر بوو، لە چاکیو جوانیو نەفس پێتیدا(نەفسبەرزی) کەم وێنە بوو. جا ئێستا دایە گەورە گیان، بە خۆت حوکم بدە کاتێ بیرەوەریو خەونان، ژیانێکی خەیاڵی ئایدیالی دوور لە حەقیقەت پێك دەهێنن، مرۆڤ دەتوانێ چی لەگەڵ خۆیدا بکات؟ هیچ شتێك بە دەست خودی ئینسانەکە نیە. پیاو بەم خەونو خەیاڵە ئایدیالیە هەست بە خۆشی دەکاتو سوپاسی خودا دەکات، بەڵام لە ناخی دڵدا هەمیشە هەست بە ناڕەزاییو خەم دەکات. رەنگە بڵێی چاو لەم خەیاڵو ئایدیالە بپۆشە. بەڵام ناتوانم چاو بپۆشم چونکە ئەم خەیاڵو ئایدیالە دەستکرد نیە، داهێنراو نیە بەڵکو ئازیزترین سەرمایەی منە لەم جیهانەداو بەبێ ئەو ناژیم. ئایا شیعرەکەی پوشکین(١)، (حەزرەتی مریەم)ت لە بیرە؟ وێنەکەی حەزرەتی مریەم، ئەوەی کە تۆ پێشکەشت کردم، ئێستاش بە دیوارەکەوە هەڵواسراوەو لەزەتم پێدەبەخشێت، کەچی دوا بەیتەکانی شیعرەکەی پوشکین دەمرەنجێنێ، عاجزم دەکات(٢). هەندێجار وام دێ بە بیرو خەیاڵدا کە هەموو شتێك بەخاك بسپێرمو فاتیحای بخوێنم. بەڵام ئەوسا هیچ شتێکی دی لە روحما بۆ ئەدای نوێژ نامێنێ. خودا حافیز دایە گەورە گیان! لەم تورەهات بێژیانەی من دڵگران مەبە، بەڵکو بە چەند وشەیەکی

لۆژیکی ئاوێته به چاکیو پەندی مەسیحی بەرسڤم بدەوە. ماوەیەك بوو دەمویست داوات لێبکەم بە زمانی فەرەنسی نامەم بۆ بنووسیت، چونکە هزرێن ژنانە بەلای منەوە، و بۆ من بە زمانی فەرەنسی مەفهومترە.

***پەراوێز:***

***١-ئاماژەیە بۆ شیعرێکی بەناوبانگی پوشکین لە ژێر سەرناڤی "حەزرەتی مریەم" کە لە ساڵی ١٨٣٠دا دانراوە.***

***٢-ئاماژەیە بۆ دوا بەیتەکانی شیعری ناڤبری کە بەمجۆرەیە:***

***ئارەزووەکانم هاتنە دی***

***خالقی جیهان تۆی بۆ ناردم***

***ئەی حەزرەتی مریەمی من***

***ئەی پاکترین نموونە! ئەی نایابترین جوانی جوانیان!***

## بۆ ت. ئا. ئیرگوسکایا

## مۆسکۆ، ١٨٥٨/١٢/٢٥

پێش هەموو شتێك بە بۆنەی هاتنی جەژنی لە دایکبوونی مەسیحەوە، پڕ بەدڵ پیرۆزباییت لێدەکەم،و ئەوجا نەبادا زیادیان بە هەواڵی ئەو رووداوەوە نابێ کە بەسەرم هات، وا بە پەلە بۆتی دەگێڕمەوە.
دەگەڵ نیکولاییدا چووبووینە ڕاوە ورچان. ڕۆژی بیستو یەکی مانگ من ورچێکم ڕاوکردو ڕۆژی بیستو دووی مانگ چووینەوە بۆ هەمان ڕاوگەو پێشهاتێکی نا ئاساییم لێ قەوما. ورچێك لە ناکاودا هێرشی بۆ هێنام، لە دووری شەش شەقاوییەوە تفەنگێکم پێوەنا. نەم پێکا. لە دووری دوو شەقاوییەوە، فیشەکی دووەمم پێوەنا، پێکامو بە خەستی برینـدارم کرد، بەڵام خۆی پێدادامو بە عاردیدا دام، تا خەڵکەکە فریام کەوتن، دوو قەپی بە تەوێڵو بناگوێمدا کرد. شوکر بۆ خوا هەر هەموو ئەم بویەرە لە دە دوازدە سانیە پتری نەخایاندو ورچەکە هەڵهاتو منیش لە جێی خۆم هەستامەوەو جگە لە زامێکی چکۆلە کە دەموچاوی نەشێواندبوومو زۆریش ئازاری نەبوو، ئیدی هیچ ئاسیوێکم( زیان) پێنەگەیی بوو. هیچ زیانێك بە ئێسکی کاسە سەرو گوێم نەگەیی بوو. نەو لە مۆسکۆمو حاڵیشم باشە. حەقیقەتەکە چۆن بووە ئەوەم بۆ نووسیوویتو هیچم لێنە شاردوویتەوە تا نیگەران نەبیت.

ئیدی بویەرەکە بەخێر گەڕاو سوپاس بۆ خوا کە بە شێوەیەکی پەرجو ئاسا رزگاری کردم.
خودا حافیز پوریێ گیان! دەستەکانت ماچ دەکەم، سلاوم بۆ ماریجاو برایانو منداڵەکان هەیە.
سیرجی، هێشتا ئەو پارەیەی، کە بردبوویەوە، نەیدۆڕاندووە، هیوادارم چیتر قومار نەکات، چونکە پارەی نیە! بێزەحمەت ئەو پوستکارتەی کە بە نامە یان بە دەستی بۆم ناردبوو، ئەگەر لای تۆیە بیدرە. سلاو لە ناتاشا بکە.

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

### مۆسکۆ، ١٨٥٩/٤/١٥

دایە گەورەی ئازیزم! مەسیح زندوو بووەتەوە، کە نامەت بۆ نانووسم، هەرچەند حەزدەکەم نامەت بۆ بنووسم، لەبەر ئەوە نییە کە کۆتایی هەفتە نزیك بووەتەوە. بەڵکو لەبەر ئەو درۆیەیە کە دەگەڵ تۆم کردووە. ویژدانم ناڕەحەتەو پێویستە دان بە ڕاستیەکاندا بنەم. رۆژی سێ شەممە کاتێ کە نامەم بۆ تۆ دەنووسی، ئاگام لە خۆ نەبوو، چونکە هەواکەی زۆر خۆشو دڵگیر بوو و حەزم لێبوو رۆژوو بگرمو تەقریبەن وەکو دۆستە پیرەکەی تۆ روحم مشتو ماڵ بدەم، بەلام بۆم دەرکەوت بە تەنیایی وەکو پێویست دەرەقەتی رۆژوو گرتن نایەم. جا هەنووکە داوای کۆمەك لە تۆ دەکەم. دەتوانم بە درێژایی ماوەی تەمەنم گۆشت نەخۆم، لە ماڵی خۆما لە بەرەبەیانەوە تا ئێوارێ بکەومە نوێژکردنو پاڕانەوە، ئینجیل بخوێنمەوەو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە یەکبینە بیر لە مەسەلە گرینگە ئاینیو رۆحانییەکان بکەمەوە، بەلام چوونە کلێسا، ماوەیەکی زۆر بە پێوە وەستان، گوێگرتن لەو دوعاو نزایانەی کە تێیان ناگەم، تەمەشاکردنی کەشیشو ئەو کەسە جۆراو جۆرانە، کارێکە بە هیچ جۆرێ لە توانای مندا نیە. بۆیە دوو ساڵی یەك لە دوای یەکە من رۆژووم نەگرتووە. رۆژی هەینی بۆ گوند چوومو جەژنی سەرەتاو دەستپێکی بەهارم لەوێندەر بەسەر برد. دەسوبۆسم دەگەڵ دێهاتیەکاندا کرد – ڕدێنیان بۆنی خۆشی بەهاری لێدێ– ئاوی تولا–م خواردەوە، جلکی جەژنی منداڵەکانم پیس کرد – پەرستارەکە زۆری گلەیی لێکردم – دەگەڵ ئەواندا گوڵی یاسو گوڵی زەردم چنیو پاشان بۆ مۆسکۆ گەڕامەوە. بۆچی؟ خۆیشم نازانم. دەتگوت شتێکم گوم کردووە بەلام نەمدەزانی چیە؟ بەلام پێموایە وەزعو حاڵ لە روحی تۆداو لە دەوروبەری تۆدا بە دڵی خۆت بووە. بێگومان رۆژووت گرتووەو بەو بۆنەیەوە پیرۆزباییت لێدەکەم. بریا کەمێك لەو جەلالو شکۆیە بە منیش دەبڕا. بە جدی خۆزیات پێدەخوازم.

خـۆزی بـردن بـە چـاکی یەکێکـە لـە سـیفەتە بەگـەن و باشـەکان.سـڵاوم بـە هـەموو خزمـان و دۆستانتان بگەیەنە. پاسا، کیژێکی بە ئاوەزە! زۆر فامیدەیە. گرینگ نیە کە جلەکانی دڕیوە، چونکە جل دەدورێتـەوەو دەچنرێتەوە لـێ ئەگـەر درۆکـردن بوایـە هـەم بـۆ ئێـوە، هـەمووتان، نـاخۆش دەبـوو،و هـەم خۆیشـی شـەرمەزار دەکـرد. ئیـدی نهـو تـەربێت و پـەروەردەی لـە ملـی ئێوەدایـەو پـۆریش، لـەوەی کـە جلـەکانی دڕیـوە، بێگومـان بەخشـیویەتی. بـۆت نووسـیوم کـە بـوریس ئالکسـوڤیچ(١)و خـانوو مالکوڤـا(٢) سـەبارەت بـە مـن لوتفیـان هەیـە، زۆر مـەمنون و خۆشـحاڵم، منـیش رێـزو حورمـەتم بـۆ هـەردووکیان هەیـە، لـە جیـاتی مـن دەسـتی بـوریس ئالکسـوفیچ ئەوەنـدە تونـد بگوشـە تـا ئـازاری دەگـاتیو دەسـتی خـاتوو مالکوڤـاش تـەنیا ئەوەندە بگوشە تا هەست بە ئازار دەکات. زۆرجار وا رێکدەکەوێ کە (ڤاڤیلو"٣")ی ساویلکە حەزدەکات بە هەموو هێزی خۆی دەستی کەسێك وەها بگوشێت کە بەشێکی بشکێنێ: بە ئەڵقەو قامکانی نەرم و ناسك. من ماوەیەکی زۆر ترسی ئەوەم هەبوو نەبادا سەبارەت بە تۆش ئەم حەزو هەوەس و کەڵکەڵەیـەم بکەوێتـە دڵ و سـەر، لـێ نهـو دەگـەڵ ئـەم بیرەدا ڕاهـاتووم کـە ڤـاڤیلوی زبـرو نـاقۆڵا دەتـوانێ دەگـەڵ تـۆدا و لـە حـوزوری تـۆدا بکەوێتـە ئـەم زۆرانبازیـە هۆڤیانەیە بـەبێ ئـەوەی ئاسیوێك بە تۆ بگەیـەنێ. تـۆ بـە هێـزو سـاغ و سـەلامەتی. تـۆ دەڵێـی ئەگەر من لەزەتی بەسەر بردنی شەوانم لە ژوورەکەی لیزادا بچەشتبایە، وەکو خـودی تـۆ کـە دەگەڵ ژنێکی دێهاتی دا بەسەر دەبەی، هەرگیز تۆم بـەجێ نەدەهێشـت، جـامنیش لـە هەنبـەر ئەوەدا دەڵێم ئەگەر تۆ لـەم لەزەتـەی مـن چەشـتوومە ئاگـادار بوایـەی، بـەبێ ئـەوەی چاوەڕێـی قیتار بکەی بەلەزو بە پای پیادە بەرەو مۆسکۆ یان ترۆیکا ملی رێگـەت دەگـرت. کایڤا(٤) بـۆ ئێمەی کرێکاران زۆر بە زیانە. تەنیا هەندێجار کە وەستامان زۆر لـێ رازییـە دەتـوانین رێگـەی ئـەم جـۆرە سـەرگەرمی و خۆشـحاڵیانە بـەخۆ بـدەین. مەبەسـتی تـۆ تـەنیا تازەکردنـەوەی بیرەوەرییەکە، بەڵام بۆ من ئـەو دە رۆژەی کـە دەگـەڵ تـۆدا ڕامبـوارد وەکـو رۆژانـی مانـەوەم لـە کلارنس، میناکی یەکێك لە بەنرخترین یادگارەکانی ژیان، هەمیشە لـە هـزرو بیرمـا نـەخشـاوە. دامرکاندنەوەی ئەم تینویەتیە بۆیە ئارامبەخش و خۆش بوو کە هـیچ بویـەرێك رووی نـەدەدا، چـاوەڕوانی هـیچ بویـەرێك نـەبووین، عـەزرەتی هـیچ شـتێك نـەبووین و لـە هـەموو روویەکـەوە ئاسـوودەو کـەیف سـاز بـووین. بـۆ تـۆ ئـەم وەزعـە یـەجگار سـەیر دێتـە بەرچـاو، رێـك وەکـو ماسییەکی رووبار کە گوێی لـێ بـێ پیاوێکـی تـەپوتۆزاوی و خـۆڵاوی، لـە جەرگـەی گـەرمای هاویـندا، هـیلاك و شـەکەت، کـە لـە پـڕ خـۆی بـە ئـاوی فێنکـی روبارێکـا دەکـات، خـۆی زۆر بـە بەختەوەر دەزانێ، غافڵە لەوەی کە ماسیان بۆ مانـەوەی هەمیشـەیی لـەم ئـاوەدا چ زەحمـەت و مشەقەتێك دەکێشن. ئەو پیاوە ماندوو شەکەت و تاوەگازە تەنیا چەند دەقیقەیەك لە ئاوەکەدا دەمێنێتەوە تا فێنك ببێتـەوەو هەرکـە هەسـتی بـە سـاردی کـرد لـە ئاوەکـە وەدەردەکـەوێ، لـێ ماسی ئەم توانایەی نیە.

رۆژی سـێ شـەممە چیت دەکـرد؟ خـەونم پێـوە دیـتی، بـەپێی لێکدانـەوەی مـن بـۆ خـەونان، پێدەچێ وەزعت باش نەبێت، هیوادارم شتێکی ناچیز بێ، ئەو نامەیەم پێگەیی کە بۆ گوندت

**ناردبوو، داوات لێناکەم ئەوەی کە ئاماژەت بۆ کردووە، ئەنجام بدەیت(٥). ئەمە شتێکی هاکەزاییە، زەروری نیە، بەڵام حەزیش دەکەم بیزانم. بۆیە هەرچەندە تۆ لە نزیکەوەو باش دەناسم، چاوەڕوانم. (بە خۆت دەزانی چۆن؟ بە گوێرەی گریمانەی ڤیانی خۆم). زۆرم حەز لێیە بزانم ئەم ژنە، یانی باشترین ژنی جیهان تووشی وردە هەڵەو خەتاو لادانان بووە، یانی باشترین هەڵەێن جیهان. تۆ بە هەر شێوەیەك دان بەم وردە هەڵەو لادانانەدا بنەیت، بۆ منو لەلای من بە باشترین وردە هەڵەو لادان دێنە ژماردن. بەڵام دەبێ دڵنیات بکەم من ئەمەم بۆ لێکۆڵینەوە نیە بەڵکو تەنیا بۆ سەرگەرمیو خۆشیمە. پێموایە ئەگەر قسەکردن لەسەر ئەم بابەتە هەڵگرین بۆ ئاییندە، باشترە.**

**ئیزاکۆف(٦)-م لە ماڵی سوسکۆف(٧)دا بینی، بەڵام چونکە هێشتا نامەکەی تۆم پێنەگەیی بوو، نەمناسی. بەڵام گوێم لێبوو کە باسی ئەو دەکەن. هەروەها ڕەفتاری لە زانستگەدا پەسند نیە.**

**بێزەحمەت لە بوریس ئالکسیوڤیچ بپرسە پتروف- ی نووسەر چی لێهاتووە؟ چی بەسەر هاتووە؟ تورگینیف-م نەدیتووە، بۆیە نەمتوانیوە داواکەی تۆی ، دەربارەی ئەمەی کە بەر لە ئیتعرافکردنەکەی تۆ، گەردنتان ئازا بکات، پێبگەیەنم، داواکەی تۆ هێندە بە سەنگینیو لێزانانە خراوەتە روو کە هەقە ئەو سوپاسی(٨) تۆ بکات، و من خۆیشم گەردنت ئازا دەکەم. نەخشە تۆڵە ئەستێنییەکەی تۆ سەری نەگرت. کاتێ کە بەرنامەی کۆنسێرتەکەو شەرحی بۆچەونەکانی تۆم لە بارەیەوە پێگەیی بە هار هاتبوو و ئیدی هیچ پێویستییەك بە مۆزیك نەبوو. دەشتو مەزرایان چ خۆشن! بۆچی گەڕامەوە؟ خۆیشم بە تەواوەتی نازانم، بە هەر حاڵ بەنیاز وئومێدی تاقیبی ئەوەی لێرە گومم کردووە دەڕۆم! خودا حافیز! بە هەموو هێزی دڵەوە دەستەکانت دەگوشم بێئەوەی ترسی ئەوەم هەبێ ئازارت بدەم.**

***پەراوێز:***

***١-بوریس ئالکسوڤیچ، مەبەست B.A. peronnhy گاردی تایبەتی و شەخسی گراندوك ئالکزاندرز، تزار ئالکزاندرزی سێیەمی ئایندەیە.***

***٢-مالکوڤا: شازادە خانم ئوروسوڤای هاوسەری مالکوڤی گەورە سەرمایەدارە.***

***٣-ڤاڤیلو (Vavilo)، ناوی سەردەمی منداڵیی تولستوی یە.***

***٤-کایڤا: مەبەستی تولستوی (تەنپەروەری و تەمەڵییە).***

***٥-ئا. ئا تولستویا لە نامەیەکی بەرواری نیوەی مانگی ١٨٥٩/٣دا، ئامادەیی خۆی دەربڕی بوو کە ئیعتراف بۆ تولستوی بکات.***

***٦-ئیزاکوف: هاوسەنگەری تولستوی بوو، لە شەڕی سباستوپل دا.***

*٧-سوسکوف: شاعیرو هاوسەری توچڤایە. خوشکەکەی توچڤا، شاعیری بەناوبانگی روسیا، دیوەخان و ئەنجوومەنێکی ئەدەبی دامەزراند بوو کە تولستوی لە ساڵانی ١٨٥٦- ١٨٥٨دا هاتووچۆی ئەوێندەری دەکرد.*
*٨-مەبەست، ئەو تۆمەتەیە کە ئا. ئا. تولستویا دابوویە پاڵ تورگینیف. تولستویا گوتبووی کە سەبەبکاریی رۆییشتنی کوتوپڕی تولستوی لە پترزبۆرگ، جگە لە تورگینیف کەسی دی نەبووە.*

## بۆ ئا. ئا. تولستویا
## یاسنایا پولیانا، ١٨٥٩/٦/١٢

دایە گەورەی ئازیزم! زۆر سوپاس بۆ نامەکەت، بەڕاستی خۆشحاڵ و شاد بووم. بۆیە لە ماوەی ئەم دوو هەفتەیەدا نامەم بۆ نەنووسیت، چونکە زۆر خۆشحاڵ بووم. بەڵێ ، خۆپەرستی ناڕەسەن کەوتووە بەسەر خۆشی خۆیدا. لەوەی باشتر چت دەوێ؟ تەنیا کێشەم ئەوەیە کە هەنووکە زۆر لە منەوە دووریت، و دووری تۆ ناڕەحەتم دەکات. تۆ بە خۆت دەزانی کە نامەکانت چ کارێکم تێ دەکەن، بە تایبەتی هەندێ لەو نامانەی وەکو نامەکانی ئەم دواییانەت کە تیایاندا ئامۆژگاریی و ڕێنوێنیم دەکەی. کە ئەم نامانە دەخوێنمەوە، خۆمم وەکو منداڵێکی نەخۆش دێتە بەرچاو کە توانای قسەکردنی نیە. حاڵم خراپە، سینگم دێشێت و تۆ دەملاوێنی، خۆشت دەوێم، هەوڵ دەدەی دەست بدەیتە باڵم، هەتوان(مەڵحەم) لەزامم دەنەی، دەست بەسەرما دێنی. من قەرزارو منەتباری مەحەبەت و دلۆڤانیەکانی تۆم. دەخوازم بگریم و دەستەکانت لە بری ئەو هەموو خۆشەویستی و نەوازشت و دلۆڤانیانەت ماچ بکەم. وێڕای ئەمەش دەردی من لەوێندەر نیە، لە کوێیە؟ خۆیشم نازانم.

هێشتا لە گوندیدا دەژیم. بە هۆی گرفتاری زۆرو ئەو کارانەوە کە کاری دڵخوازی من نین، بەڵام بە تەواوی مژۆلیان کردووم، بۆ ترویکا نەڕۆیشتووم. تۆ ئەم مەسەلەیەت، کە گوایە من خەریکم بە دەستی خۆم ڕەگی ژیانی خۆم دەردەکێشم و ماڵی خۆم وێران دەکەم، لە ڕادەبەدەر بەجدی گرتووە. من ناتوانم خۆم نابوت بکەم چونکە تەنیام و دەتوانم- بە غرورێکی تایبەتیەوە دەیڵێم - نانی خۆم پەیدا بکەم. خۆم سەرگەرم دەکەم یان بە گوتەیەکی دی هەوڵدەدەم بە کارێن وەکو کشتیاریەوە کە حەزی لێدەکەم، بەڵام دەرقەتی نایەم ،خۆم مژول بکەم و بیرەکانم فەرامۆش بکەم. من ئەهلی کارو کاسبی نیم تا بتوانم بە دەرامەتی موڵك و زەوی و زاران کاربکەم. ئەگەر لە روسیا بوایەی کتێبێکی ئیلیوت-م بە ناونیشانی (چەند دیمەنێك لە ژیانی کەشیشان) بۆ دەناردیت. بەڵام چونکە لێرە نیت تەنیا ئەوەندەم لە دەست دێ تکات لێبکەم کە بە خۆت پەیدای بکەو

بیخوێنەوە، بە تایبەتی (پەشیمانی جانێت) بە وردی بخوێنەوە. خۆشی لەو کەسانەی کە وەکو ئینگلیزان بە شیری دایکەوە بە پرەنسیپو بنەماکانی مەزەبی مەسیحی لە پاکترینو بە شکۆترین شێوەیدا، واتە پروتستانیزمی ئینجیلییەوە گۆش دەکرێن. ئەم کتێبە هەرچەندە ئەخلاقیو ئاینییە، کەچی دەگەڵ ئەوەشدا پێم خۆش بوو و کارێکی قووڵی لێکردم. هەڵبەتە قوڵ نا، درۆم کرد. چونکە ئیدی هیچ شتێك ناتوانێ کاری قووڵم لێبکات، چونکە دڵم وشك بووە. ئەگەر هەر کاتێ وەختو تاقەتت هەبوو دەربارەی خۆت نامەم بۆ بنووسە. لە کوێی؟ ژیانی خۆت چۆن رێك خستووە؟ هەستێن تازەو بەهێزت چیە؟ تۆ هەمیشە هەستیار بوویتو سوودت لەم بەهرە بەهێزە وەرگرتووەو وەردەگریت. هەڵبەتە نەك لەبەر ئەوەی ئیمانت هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی خودا خوویەکی سروشتیو ئاسایی پێ بەخشیویت کە من وێنەیم هەرگیز نەدیتووە. خودا حافیز، ئەی رزگارکەرو رۆشنکەرەوەی ئازیزی رێگەی من! بێزەحمەت جارێکی دی سەرم نەوازشت بکە، دەستی بەسەرا بێنە، هەرچەندە نایەشێت ، هەتوانی تێ هەڵسوو، چونکە بۆ من زۆر بەسوودە!

*ل. تولستوی.*

**٦/١٢:** لە ئەمڕۆوە ئیدی رۆژ کورت دەبێ. رۆژانی بێ بەرو بێ روناکی تەمەنی منیش بەردەوام کورتتر دەبێت، جا دەمتوانی چ ئەنجامێکی لێ بە دەست بێنم!

## بۆ و. دروزینین
## یاسنایا پولیانا، ١٨٥٩/١٠/٩

دۆستی ئازیزم ئالکساندر ڤاسیلوڤیچ! پێموایە تۆ منت وەکو مرۆڤێك خۆشدەوێ نەك وەکو بەرێوەبەری گۆڤارێك کە نووسەرێکی بچووك- ی بە هۆی ئەوەوە کە بە کەڵکی دێو کاری لێدەکێشێتەوە خۆش بوێ((١))، من وەکو نووسەر بایەخی پولێکی قەڵبم نیە. هیچم نەنووسیوەو لە دوای بڵاوبوونەوەی (شادمانی خانەوادەییەوە) ئیدی دەستم بۆ قەڵەم نەبردووەو پێموایە ئیدی هیچ شتێك نانووسم. بەلای کەمەوە بەم ئومێدە دڵی خۆم خۆش دەکەم. بەڵام بۆچی؟ باسی ئەمە زەحمەت و دوور و درێژە. بەڵام هۆی سەرەکی ئەوە، ئەمەیە کە تەمەن کورتەو لە تەمەنێکا کە زەین گەیی بێتە هەرەتی خەملینو پوختەیی خۆی، نووسینی چیرۆکێن لەو بابەتە چیرۆکانەی کە من نووسیومن، بە ڕاستی مایەی شەرمەزارییە.

حەزدەکەم و دەتوانمو بە ئەرکی خۆمی دەزانم کە خەریکی شتێن جدی تر ببم. هەرکاتێ بابەتێك یەخەم بگرێتو بموروژێنێ و بیەوێ بە هەر نرخێ بووە لە زەینو هزرمەوە داچۆڕێو غیرەتو غرورو هێزی تەواوی نامە بەر، هەنگێ ئامادەی کاردەبم. بەڵام بۆ نووسینی چیرۆکانی شیرینو سەرگەرمکەر، ئەویش لە تەمەنی سیو یەك ساڵیدا، بەزاتی خوا دەستم تێی ناچێتو قەڵەم ناگرێت. تەنانەت کاتێ کە بیردەکەمەوە پێویستە چیرۆکێك بنووسم، پێکەنین دەمگرێ. بۆیە ناتوانم داواکەت جێبەجێ بکەم، هەرچەندە جێبەجێ نەکردنی هەر داوایەکی تۆ بۆ من یەجگار ناخۆشە. ئەگەر داوام لێبکەی گەنمەکەتان بفرۆشم، یان موڵکەکانتان بەڕێوە بەرمو هەرجۆرە خزمەتێکی ترم لە دەست بێ، بۆتی بکەم، بە دڵو بە گیان لە خزمەتت دام،و لە هەموو ئەمانەش گرینگترو زیاتر دەمەوێو دەتوانم بە شێوازی روسی ماچت بکەمو بێم بۆ پترزبۆرگو ماوەیەك لە خزمەتتدا بکەومە گفتوگۆ،و لە سایەی دایکتدا نان بخۆم. هەر هەموو ئەم کارانە بە خۆشییەوە ئەنجام دەدەم.

هەر ئێستا لە خوێندنەوەی دوا چیرۆکی پتروف بوومەوە. زۆرم لا ناخۆش بوو. هەرچەندە توانایەکی بێ چەندوچوونی نووسینی هەیە، بەڵام عەیبی هەرە گەورەی بێ ئاگاییەتی لە زەوقو سەلیقە. خۆی لایەنە بە هێزەکانی بەهرەو توانای خۆی ناناسێت. کاترینا، لە چیرۆکەکەدا تەنیا ئاماژەیەکی ڕەوتەنیو سێبەرێکی کاڵە، لە حاڵێکا دەبوا هەموو ئەوانی دی بخاتە سێبەرەوە((٢)) ئەگەر پتروف ویستبای لەوەبوو ئەو عەیبەی لە چاککردن هاتبا، بەڵام لەم تەمەنەی ئێستایدا، ترسی ئەوەم هەیە (جێگەی هیوا) نەبێت، ئومێدی هیچی لێنەکرێت،و لە جیاتی ئەو پایەی کە دەیتوانی بە دەستی بێنێ، ببێ بە "مایەی بەزەیی".

سڵاوم بە پسیسمکی، کنکاروفو هەموو ئەوانی دی بگەیەنە. حەزدەکەم دۆستە ئازیزەکانی جارانم لە بیرم نەکەن. هەمیشە ڕێزو حورمەتم بۆیان هەیە. ئایا ڕاستە کە پولونسکی ئازیزو نازدار وەزعی خراپە؟ فت- ی داماو بۆ مۆسکۆ رۆییوە. زۆر خەمبارو پەریشانە. چونکە یەکێك لە خوشکەکانی یەجگار نەخۆشە. بەڵێ فت تا زیاتری بناسیت، لەلات خۆشەویست تر دەبێت، من تا زیاتر تێکەڵی دەبم، زیاتر هۆگرو ڕمودەی دەبم. تورگینیف، بەپێچەوانەوە، تەنانەت لە دوا دیداریا، بە تەواوەتی قەناعەتی لاچێکردم کە هەرچەندە پیاوێکی هۆشمەندو بە ئاوەزە، بەڵام یەکێکە لەو پیاوانەی کە لەگەڵیا هەڵناکرێ. لەوەتای ئەم حەقیقەتە تازەیەم لەمەڕ وی بۆ ڕوون بووەتەوە، دەتوانم ئاسانتر مامەڵەی لە تەکدا بکەم. خۆم بەخەجاڵەتی پتروف دەزانم، چونکە بەرسڤی نامەکەیم نەداوەتەوە. ئەم نووسراوە هاوپێچە بدە بەو. لە کانگای دڵەوە لە هەمێزت دەگرم.

*دڵسۆزت*

*ل. تولستوی.*

***پەراوێز:***

***١-دروزینین بەرواری ١٨٥٩/٩/٢٨ نامەیەکی بەم نێوەڕۆکە بۆ تولستوی نووسی بوو: "... ئێستا وەکو سەر نووسەرێك داوا هەمیشەییەکەم دوبارە دەکەمەوە. دۆستی ئازیزم تۆزێك بجوڵێ و ئەو بەرهەمەی کە خەڵکێکی زۆر داوات لێدەکەن، بنووسە. چیرۆکە درێژەکەت گەییە کوێ؟ ئایا لەو هەیڤانەی دوایی دا شتێکی دیکەت نووسیوە؟ دڵنیام پشتم بەر نادەیت، زۆرم پێویست بە یارمەتی فەوری هەیە."***

***٢-کاترینا: یەکێکە لە قارەمانانی چیرۆکی (ریفراندۆم)ی پترۆف.***

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

## یاسنایا پولیانا، ١٨٥٩/١٠/١٢

دۆستی ئازیزم ئالکساندرین!

لەرێگەی کاترینا نیکولایوڤناوە هەواڵی پرسەکەتم(١) نەزانیوە، بەڵکو لە رێگەی بابایەکی غەوارەوە بیستم و زۆرم پێ ناخۆش بوو. چووبوومە ڕاو، و ئەدرەسی تۆم لە لا نەبوو، و نەم دەویست باوەڕ بەم خەبەرە دڵتەزێنە بکەم، و بەڕاستی وەختی نامە نووسینشم نەبوو. پێرێ کە بۆ ماڵ گەڕامەوە، جارێکی دی تۆم بیرکەوتەوەو ویستم نامەیەکت بۆ بنووسم کە لەم کاتەدا نامەیەکی کاترینا نیکولایوڤنام پێگەیی. جا نەو گوێ بگرە بزانە چۆن هەندێجار رووداوەکان تێکدەکەنەوە. لەو دواییانە، بەردەوام دەگەڵ بورسیف ناوێکدا کە مێردی خوشکی (فت)ـە دەچوومە ڕاو. تەسەوردەکەم باسی ئەوم بۆ کردویت. بورسیف، تا حەز بکەی کەسێکی بە ئەدەب، دلۆڤان و دڵگوشا و دڵپەسندەو لە عەمرانتما خەڵکی وا باشم نەدیتووە، بەڵام نازانم بۆچی لە هەمان کاتدا هەستی بەزەیی لای بەرانبەرەکەی دەوروژێنێ. بالایەکی کورت، چاوانی پاك و رۆشن، بزەیەکی شەرمن و هەڵسوکەوتێکی دوو دڵانەی هەیە، وێڕای ئەمەش پیاوێکە لەو مەسەلانەدا کە پەیوەندیان بە دادپەروەری و ئابڕومەندییەوە هەیە یەجگار بە هەڵوێست و نەگۆڕە. باوکی پیاوێکی ڕژدو خوێڕی بووە کە بە دەستی مسکێنەکانی خۆی لەسێدارە دراوەو دایکی ژنێکی دڵساف و ساویلکەیە. لە ماڵی پیترپتروڤیچ نوڤوسیلچۆڤ گەورە بووەو هەر لە منداڵییەوە چارەنووس دژایەتی کردووە. هەر لە منداڵییەوە، حەزی لە کیژە دراوسێیەك، واتا خوشکی فت کردووە، کە کیژێکی جوانی دلڕفێنی هاوتەمەنی خۆی بووە، و کە گەورە بووەو فامی کردووەتەوە خوازبێنی کردووە. بەڵام جوابی دەکەن، ئیدی بۆ فەرامۆشکردنی ڤیان و ئەشقەکەی خۆی، بە سەربازی چووە بۆ قەفقازو لەوێندەر بووەتە مایەی رێزو حورمەت و خۆشەویستی هەمووان. بەڵام سوپاو

سەربازی دەردی ئەویان دەرمان نەکردووە، هەر بەم ئومێدە ژیاوە کە شایەتا ڕۆژێ لە ڕۆژان داواکـەی قـەبوڵ بکـەن‌و بـە ویسـاڵی دلبەرەکـەی بگـات. دوای دە سـاڵ بـۆ مـاڵی خـۆی دەگەڕێتـەوە. تومـەز لـەم ماوەیـەدا بـاوکی کیـژێ کـە بەرهەڵسـتی ئـەو کـاری خێرێیـە بـوو، مردووە. بەڵام ئەمجارەش کیـژێ دەست بە روویـەوە دەنێت، چونکە حـەزی لـە پیاوێکی تـر کردبـوو. هـەر ئـەو ڕۆژە لێـدەبڕێ دەمانچـەیەك بـە تـۆقی سـەری خۆیـەوە بنـێ. لێ فیشـەکەکە کـوێرەك دەردەچـێت، و ئیـدی دەسـتی دەگـرن‌و لـە خۆکـوژیی ژێـوان دەکەنـەوەو قەناعـەتی پێدەکەن کە درێژە بە ژیان بدات‌و دنیا لە قالو بەلاوە بە هۆمێد خوراوە. ئیدی بۆ سـەربازی دەگەڕێتـەوە، ئـەمجارەیان بـۆ بـەرەی شـەڕ دەڕوات. ئیـدی لـە هـەر شـوێنێ بـووە پیاوانـەو مەردانە، بێ قرەو برە، بێ کێشەو قەرقەشە ژیاوە، لـە کاتێکا لـە نێـو سوپاییاندا، بەتایبـەتی لە کاتی جەنگدا، بەرەڵلایی‌و بـێ موبالاتی‌و ئاژاوەچیەتی زاڵـە. ئیـدی لـە هـەموو شـوێنێکدا ئازایـەتی‌و تـەوازوعی نوانـدووە. هەڵبەتـە پیـاوێکی ئیمانـداری مەزەبیـە. دوای سـێ سـاڵان، جارێکی دی بەختی خۆی تاقی کردووەتـەوەو دیسان داواکـەیان ڕەفزکـردووە. لـەم ماوەیـەدا کیژێ تووشی نەگبەتیەکی گەورە دەبێت، ئەقڵی خۆی لە دەست دەدات. چارەسەر دەکرێ، لێ دکتۆرەکـان ئاگـاداری دەکەنـەوە کـە ئەگـەر شـوو نـەکات، لەوەیـە شـێتێتییەکەی سـەر هەڵبداتەوە. ئیدی هیچ خویا(روون) نیە ئاخۆ عینادی‌و سەرسەختی کەسوکاری کیـژێ، یان شکسـتی خـۆی لـە دڵـداریی یەکـەمیا، یـان پێـداگرتن‌و مکـوڕی بورسـیف کاریـان لـە کیـژێ کردووە، بەڵام بە هەرحاڵ ئەمجارەیان لە ڕووی ناچارییەوە ڕازی دەبێ کە شـوو بـە بورسـیف بکات. بورسیف متمانەی بەخۆی هەبوو، و زەماوەندی دەگەڵ کردو دوای یـەك سـاڵ کوڕێکی یەجگار جوانیان بوو. لەم دوو ساڵەی دواییەدا تاقیبی وەزع‌و حاڵم کردوون‌و گەییومەتە ئەو قەناعەتـەی کـە ئەمـە تاقـە زەماوەنـدێکی سـەرکەوتووە کـە لـە عـەمراتی خۆمـدا دیتوومـە. خوشـکەکەی فـت بـەرە بـەرە قـەدری مێردەکـەی زانـی‌و دەسـتی بـە خۆشویسـتنی کـرد، بورسیف–ش بۆ یەکـەمجار لـە ژیـانی خۆیـدا، لـە تەمـەنی سـی‌و پێـنچ سـاڵیدا دووبـارە وەکـو خونچەیەك پشکوت. بزە لە سەر لێوی نـەدەبڕا. بـەو بوایـە چیرۆکی بەختـەوەری‌و شـادمانی خۆی بۆ هەموو کەسێك بگێڕێتەوەو سوپاسی خودا بکات کە باشترین ژن‌و جوانترین کوڕی ئەم دنیایەی هەیە. بەڕاستی پیاو بە دیتنی خۆشحاڵ دەبوو. هەر کەسێك بۆ ساتێك دیتبـای، یەکسـەر دەیگوت: "بەڕاسـتی پیـاوێکی بەختـەوەرە، ئەمەیـە بەختـەوەری!" ئەمـە هـەمان ئـەو بورسـیفەیە کـە دوو سـاڵ لـەوە پـێش پیـاو بـەزەیی پێیـدا دەهاتـەوە. ئـەم پیـاوە ڕاوچیـەکی کارامــەو مەعلانــە. قــەولم دەگــەڵی کردبــوو کــە پــاییز پێکڤــە بچــینە ڕاوێ. ژنەکــەی و کوڕەکەی،دەگەڵ (فت)ی ژن برایدا بـۆ مۆسـکۆ ڕۆیـین. ئەمـە یەکـەمجار بـوو کـە ژن‌و مێـرد بـۆ ماوەی یەك ساڵ لە یەکدی جیادەبوونەوە. خۆزیا لەوێ دەبوویت‌و بە چاوی خـۆت دەتبینـی کـە چ ڕێـزو حورمـەتێکی یـەکیان دەگـرت، چـەند ئاشـقانە هـەڵس‌و کـەوتیان دەکـرد، بـە چ روحیەتێکەوە، خۆیان بۆ تەحەمولی ئەو جودابیە دژوارە ئامادە دەکرد. نزیکـەی یـازدە ڕۆژان پێکڤە گـەڕاین، بـەدەم ڕاوەوە هێنـدەی دی لـە لام بـەرێزو خۆشەویسـت بـوو. ڕۆژی سـێیەمی

ئوکتۆبەر، کە لە ڕاو دەگەڕاینەوە، بەوپەڕی خۆشی و شادی خۆمان بە گوندەکەی تورگینیفدا کرد. بورسیف لە کەیفان لە پێستی خۆی نە دەهێوری، گێچی مەحەبەت و خۆشەویستی دەرهەق بەمن بەرز بوو بووەوە، چەند پێکێکیشی هەڵدابوو، و داوای لە من دەکرد ژن بێنم و دووپاتی دەکردەوە کە تەنیا بەمە دکارم بەختەوەری خۆم دابین بکەم. بە تلێکی(پاڕ) شەو بوری، لە دوو ژووری دراوسێی یەکدی خەوتین. لە کاتێکا ئارامی شەو باڵی بەسەر هەموو شوێنێك دا کێشابوو، من خەوم زڕا بوو، چونکە بیرم لەم هەموو خۆشی و شادمانیەی ژینی ئەو دەکردەوە، لە ناکادا تورگینیف بە پێدزکە، لەسەر نوکی پێیان، بە بێدەنگی، بە نامەیەکی (فت)ەوە کە تازە پێی گەیی بوو، وەژوور کەوت و گوتی فت نووسیویەتی دەبێ بە زووترین کات بورسیف وەدۆزیت و پێی ڕابگەیەنی کە ژنەکەی هەرکە گەییوەتە مۆسکۆ تووشی شێتییەکی ترسناك بووە و بە قسەی دکتۆران هیچ جۆرە ئومێدێکی چاکبوونەوەی نیە. دەگەڵ گەردی بەیانیدا بورسیف لە حاڵێکا کە وەکو بەندۆڵی سەعات بەسەر لاقە کوڵەکانیەوە لە نەوەساندا بوو، و دەموچاوی پرشنگی چالاکی دەداو دەستەکانی پێکدا دەماڵین، هاتە دەف من و گوتی کە دەبێ بەپەلە ئەسپەکان زین بکەین، چونکە دنیا خۆشە، هەوایەکی خۆشی هەیە و ڕاوێکی بێ وێنە چاوەڕوانمانە، لەوە غافڵ بوو کە دەبوایە من هەواڵێکی ترسناکی بدەمێ.

خەبەرەکەم پێ دا، ئێستاش کە ئەو ساتانەم بیردەکەوێتەوە سەراپام دەوکەێتە لەرزین. هەڵبەتە ئەو بەلەز ڕۆیی، بەڵام دەمزانی وەزع و حاڵی ژنەکەی خەتەرە. چونکە ئەویش میناکی هەموو ئەو ژنانەیە کە تووشی شێتی دەبن، واتا ئەو ژنانەی کە چەند لە ژیانی ئاساییدا پاکترو زیاتر پابەندی بنەما ئەخلاقیەکان بن، لەسەردەمی شێتایەتیاندا دڕترو گۆساخترو دڕندەتردەبن. (فت)ش نووسویەتی کە هیچ ئومێدێکی چاکبوونەوەی نیە.

بەڵێ دۆستی ئازیزم! ڕەنجی تۆش میناکی هەمان ڕەنج و ئازارە، و خودای گەورە سێبوری عەبدی خۆی دەدات کە دەگەڵ ئەو جۆرە ئازارو نارەحەتیانە ڕابێ و درێژە بە ژیان بدات. شەریکی خەمتم. من زیاتر دڵم بە حاڵی دایکە بەسەزمانەکەت دەسووتێ. پیاو لە تەمەنی ئێمەدا بەرگە دەگرێت و هێشتا دڵمان بە خۆمان خۆشە. هێشتا ئیمکانی هەندێ شتی دڵخۆشکەرە هەیە، و هاوتەمەنانی خۆمان چ ژن و چ پیاو بایەخمان دەدەنێ و خۆشیان دەوێین، بەڵام لە تەمەنی دایکتا ئینسان هیچی لە دەست نایەت و تەنیا دڵ بەو شتە خۆش دەکات کە لە پاش مردنی ئێمە بەجێ دەمێنێ. ئەو تۆو منداڵەکانی تری کاتێ کە زۆر گەنجتر بوون خۆش ویستووە، بەڵام دڵنیام ئێستا (پاسا)ی لە هەمووتان خۆشتر دەوێ. بە هەرحاڵ ئەمە بیروبۆچوونی منە. ئەو چ کاردانەوەیەکی لە هەنبەر ئەم بەڵاو نسیبەتەدا نواند؟ دۆستانت کێن؟ ڕستوڤچیف زۆر چووە دڵمەوە. لەمبارەیەوە زۆر خۆشحاڵم. خەسڵەتێکی نەجیبانەو ناسك و سەنگینی ئەوتۆی تیایە کە مرۆڤ ناچار دەکات ڕێزو حورمەتی بگرێت. لە پەیوەندیمدا دەگەڵ ئەو هەمیشە ئەم هەستی ڕێزو حورمەت و پارێزکارییەم لەلا بووە. دەربارەی خۆم هیچ هەواڵێکی باش و خۆشم پێ نیە کە پێتی بڵێم. هەستی غیرەو غرورو

تەمەڵی و گومان و دوو دڵی هێشتا بەسەر دڵ و دەروونمدا زاڵە. بەڵام من کۆڵ نادەم، درێژە بەخەبتینی خۆم دەدەم و بە هیوام باشتر ببم. چەندم حەزلێیە ماوەیەك لەگەڵ تۆدا بم و بکەومە گفتوگۆ! گوێ بۆ دەردە دڵەکانت بگرم و بەوپەڕی بێدەنگی تێت بڕوانم و دڵم بە خۆشەویستی تۆ تۆزێك بگەشێتەوە و بکرێتەوە. خودا حافیز! مەسیح یارو یاوەرتان بێ.

*ل. تولستوی.*

***پەراوێز:***

***١-مەرگی "پاسا"ی خوشکەزای ئا. ئا. تولستویا.***

## بۆ ئا. ئا. فت
## یاسنایا پولیانا، ١٨٥٩/١٠/٢٤

مامی چکۆلەی ئازیزم فتینکا. بەڕاستی یەجگار ئازیزیت و زۆرم خۆشدەوێی. چیرۆکنووسی کارێکی گەوجانەو نەنگینە. بەڵام دەربارەی شیعر هەرکاتێ مەیلت لێی بوو بیڵێ، بەڵام ئەوە بزانە دۆستایەتی کەسێکی دڵپاك و شایستە نیعمەتێکی گەورەیە... ڕەنگە ئەمە خودی من نەبم کە دڵم بەتۆ داوە، بەڵکو بیرۆکەی نووسینی چیرۆکێك بێ کە خەریکە لەزەین و هزرمدا دەمەیی و بۆ خۆشەویستی و دۆستایەتی تۆم هاندەدا. هەندێجار کاتێ ئەو جۆرە بیرەم بە مێشك و خەیاڵدا دێت، بە خۆم دەڵێم بە هەر کارێکەوە مژول دەبم، چ پەین کردنی زەوی بێ و چ دەرمانکردنی پەلەوەران، بە دەستی خۆم نیە ئاگری هەوەس و ئارەزووی نووسینی شتێك لە دڵما بڵێسە دەسەنێت. خۆشحاڵم کە تا نهو ڕێگەم بە خۆم نەداوە شتێکی دیکە بنووسم و لە ئایندەشدا هەرگیز ڕێ بە خۆم نادەم. سوپاسی لوتفت دەکەم کە هەوڵتداوە دکتۆرێکی بەیتاڵم بۆ بدۆزیتەوە. لە (تولا)دا یەکێکم دۆزییەوەو دەستم بە دەرمانی حەیواناتەکان کردووە، بەڵام لە کارێن کشتیاری و ماڵاتداریش وەڕەزو بێتاقەت بووم. دروزینین تکای لێکردوم لەبەر خاتری دۆستایەتیمان چیرۆکێکی لەگەڵدا بنووسم. ڕاستت دەوێ حەزم لێیە داواکەی قەبوڵ بکەم، لێ دەزانم ئەو کارە سفر دەردەچێت و زۆر بێ سەروبەر دەبێت. شتێکی بێ سەروبەری میناکی: "شای ئێران نێرگەلە دەکێشێت و من تۆم خۆش دەوێ" ئەمە نموونەو پێکچواندنێکی باشە.

بەڵام لە سوعبەت دەربچێ، حافیزەکەی((١)) تۆ گەییە کوێ؟ تۆ چۆن حوکم دەدەی حوکم بدە، هەرچیەك دەڵێی بیڵێ، بەڵام بە بۆچوونی من ئاقڵی لەوەدایە کە لەزەت لە شیعری

خـەڵکی وەربگریـت‌و شـیعری خـۆت بـە دەسـتی خـەڵکی بـەدخوو وبـەدکردەوە نەسـپێریت. شیعری خۆت پێویستە بـە هـەمان نـانی ڕۆژانـەی خۆتـەوە بخۆیـت. لێ هەنـدێجار مـرۆڤ حـەز دەکات ببێ بە پیاوێکی ناودارو گەورەو کە تا ئێستا نەبووە بـەو پیـاوە ، زۆری لەبـەر گـران دەبێـت، و هەسـت بـە ناڕەحـەتی دەکـات. خـوا خوایـەتی زووتـر لـە پشـت مێزەکەیـەوە هەستێت‌و یـان زووتـر لـە نـانخواردن ببێتـەوە تـا بەپەلـە دەست بـەکاربکات. مـن حـەزم لـە فشقیات‌و قسەی بێ سـەروبەر نیـە، بـەڵام بـەلای کەمـەوە دەگـەڵ مـامێکی بچووکی مینـاکی تۆدا کە هەمیشە نقومی تورەهات بێژییە، باسی ئەم جۆرە مەسەلەو بابەتانە خۆشە. یەکێك لە باشترین ئەو شیعرانەی حافیزم کە پاچڤەت کردووە بۆ بنێرە کە دەمم ئاوبکات، منـیش لە جیاتی ئـەوە نموونـەی دانەوێڵـەی ئەمسـاڵت بـۆ دەنێـرم. بـە تـەواوەتی لـە ڕاو تێـر بـووم. هـەوا خۆشـە بـەڵام بـە تـەنێ سـواری ناکـەم. تاژیـەکانی تـۆو ئیڤـان پیتروڤـیچ‌و هـەروەها پرۆکوڤیچ‌و ئەسپە بەڵەك هەموویان ساغ‌و سەلامەتن. سوپاست دەکەم بۆ ئـەو مۆڵەتـەی کـە پێـت داوم. دەگـەڵ کـەوتنی یەکـەم بـەفردا بـەکاری دێـنم‌و سـوودی لێـوەردەگرم‌و پاشـان پروکوڤیچ دەگەڵ تاژیەکاندا دەنێرم. لەوەتای تۆ سەفەرت کردووە، تـەنیا یـەك جـار بەتـەنێ لە مەزراکانی دەوروبەری ماڵەکەدا چوومەتە ڕاوی حەیواناتی گەورە. تا چـەند ڕۆژێکی دی نامەی تریشت بۆ دەنووسم، جارێ تەنیا دەمـەوێ سوپاسی میهرو مەرحەمـەتی تـۆ بکـەم‌و بـە دڵ‌و بـە گیـان، بـە هـەموو هێـزی خۆمـەوە لـە ئـامێزت بگـرم. دایرەتـول مەعاریفەکـەم بـۆ بنێـرە. خوشـکەکەم بـۆ فێربـوونی منداڵـەکانی پێویسـتی بـە پیانۆیـەکی بـاش هەیـە کـە نرخەکەی لە دەوروبەری دوو سەد تا دوو سەدو پـەنجا ڕۆبڵـی زیـو بیـت، زووتـر نامەیـەکی لەمبارەیـەوە بـۆ یـەکێك لـە ئاشـناکانی نووسـیوە، بۆیـە لەگینـە پێویسـتی بـە هەوڵـدانی تـۆ نـەبێت، بـەڵام هـەرکاتێ پیانۆیـەکی لـەو جـۆرەت دۆزییـەوە ئاگـادارم بکـەوە. دەسـتەکانی ماریاپترۆڤنا مـاچ دەکـەم. پـورم یـادت دەکاتـەوەو سوپاسـت دەکات‌و ئەمەشـی بـە مجامەلـە نیە. هەرکاتێ کە نامەکەی تۆی بـۆ دەخوێنمـەوە بـزە دەیگـرێ‌و سـەری دەلـەقێنێ‌و دەڵێـت: "ئەم (فت)ە چەند پیاوێکی نازدارە!" من دەزانم بۆچی ئەوەنـدە تـۆی خـۆش گـەرەکە. لەبـەر ئەوەیـە کـە دەزانـێ زۆر لەمنـەوە نزیکـی‌و خـاتری منـت گـەرەکە. دەی خـودا حـافیز! چـەند وشەیەکم بۆ بخە سەر کاغەزو بینێرە، چ قەیدی یە با مەسەلەی بەیتاڵیش لە گۆڕێ نەبێ.

***ل. تولستوی.***

***پەراوێز:***

***١-فت، لەو سەردەمەدا مژولی پاچڤەی دیوانەکەی شمس الدين محمد حافیزی (١٣٠٠-١٣٨٩) شاعیری پایە بەرزی ئێران بوو.***

## بۆ ت. ئا. ئێرگولسکایا
## هیر((١))، ١٨٦٠/٩/٢٠

**پوریٚ گیان! له بڵاڤۆکێن ڕۆژانەدا، بەدوورو درێژی چۆنیەتی ڕووداوەکە دەخوێنیتەوە. ئەوەی کە بە درێژایی ئەم دوو هەفتەیە، لە هەموو ئانو ساتێکدا چاوەڕوانی بووم ئەمڕۆ سەعات نۆی ئێواریٚ رووی((٢))دا. تەنیا دوێنیٚ ڕێی بە من دا لە خۆ گوڕیندا یارمەتی بدەم. ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژ بوو کە بڕیاری دا لە جێگەدا بکەویٚ، خۆی ڕووت کردەوەو داوای پەرستارێکی کرد. بە درێژایی ڕۆژەکە بە ئاگاو بە خەبەر بوو. چارەکێك بەر لە مردنەکەی پەرداخیٚ شیری خواردەوەو پێی گوتم حاڵی باشترە. ئەمڕۆش بە سوعبەتو شۆخییەوە، باسی پرۆسە فێرکاریو پەروەردەییەکەی منی کرد. بەڵام چەند چرکەیەك بەر لە مردن چەند جارێك لە بن لێوانەوەو بە ئەسپایی گوتی: "ئاه خودایا! خودایا!" تەسەوردەکەم لە چارەنووسی خۆی بە ئاگابوو، لیٚ هەم خۆیو هەم ئێمەی فریو دەدا. ماسنکا تەنیا بۆ ماوەی چوار سەعات بۆ ئەو شوێنەی کە هێشتاش لێی دەژی چوو بوو، لە چوار میلی (هیر) دایە. بە هیچ جۆریٚ بە تەما نەبوو ئەم کارەساتە وا زوو ڕوو بدات. ئا ئێستا چاوەکانیم نوقاندن. ماسنکا بەزووترین کات دێتەوەو مەسەلەکەت ڕاستەوخۆو بە دوورو درێژی بۆ باس دەکات. باوەڕناکەم جەنازەکەی بۆ روسیا بێنمەوە. شازادەخانم گلیچنا ڕێورەسمی ناشتنو پرسەکە بەڕێوە دەبات. هەموو شتێکی لە ئەستۆ گرتووە.**

**پوریٚ گیان، نازانم بە چ زمانیٚ سەرخۆشیت لێبکەم، دڵت بدەمەوە، تەنیا ئەوەندەم پێدە گوتریٚ ئیدی ئەمە ئیرادەی خوا بوو. جاریٚ هیچ شتێك بۆ سیرزا نانووسم. رەنگە بۆ ڕاوچوو بێت. هەرکاتیٚ کە زانیت لە کوێیە، هەواڵەکەی بدەریٚ، یان ئەم نامەیەی بۆ بنێرە.**

***پەراوێز:***

***١-هیر، شارێکی فەرەنسایە، کەوتووەتە دەڤەری تولن.***

***٢-مەبەست لە کارەساتی مردنی نیکولایی، برای تولستوی یە.***

## بۆ س. ن. تولستوی

## پیر، ١٨٦٠/٩/٢٤

پێموایـه هـەواڵی کۆچـی دوایـی نیکولیکـات زانیـوە. بـە داخـەوەم کـە لـە سـەرەمەرگا بـە دیاریەوە نەبوویت. هەرچەندە خەسارەتێکی دڵتەزێن بوو، خۆشحاڵم کە بە ئامادەبوونی من رووی داو زۆری کارتێکردم، کەچی مەرگی میتینکا(١) وا نەبوو.

وەختێ خەبەری مردنی ئەوم پێگەیی من لە پترزبۆرگ بوومو ئەوم هەر لە بیر نەبوو. مەرگی نیکـولایی کارەسـاتو رووداوێکـی زۆر جیـاوازترە . پەیوەنـدی مـن لەگـەڵ میتینکـادا لـە سنووری بیرەوەریانی منداڵیو سۆزی خزمایەتیدا بوو، بەڵام نیکولایی بۆ تۆو بۆ منیش پیاوێك بوو کە لەم دنیایەدا لە هـەموو کەسێك پترمان خـۆش دەویستو رێـزو حورمـەتمان دەگـرت. تـۆ بـە خـۆت ئاگـاداری ئـەو هەسـتە خۆپەرسـتانەیە هـەیت کـە لـەو دواییانـەدا لـە کەللـەی دابـووم،و دەمگـوت تـازووتر بمرێت بۆ خـۆی باشـترە، بـەڵام ئێسـتا کـە ئـەم نامەیـە دەنووسمو بیرم دەکەوێتـەوە کـە ئـەو بیرەم بـە مێشكو خـەیاڵدا هـاتووە لـە ترسـا مـووی بـە دەنم رەپ دەوەستێ. تا دوا رۆژی تەمەنی بەوپەڕی توانـاو بـە هـۆشو گۆشـێکی تـەواوەوە، بۆ ئەوەی نەبێ بە بارێکی قورس بەسەر منەوە، بە خـۆی خزمـەتی خـۆی کـردووە. لـە رۆژی مردنەکەیـدا هـەر خـۆی بـە تـەنیا سەروچـاوی خـۆی شـتو جلکـی لەبـەر کـردو لەسـەر قەنەفەیەك دانیشت. نۆ سەعات بەر لە مردنەکەی ملی بۆ چارەنووس داو داوای لە مـن کـرد بیگۆڕمو جلەکانی داکەنم، یەکەم پێشهات لە تەوالێتەکە رووی دا. بۆ چرکەیەك چوو بوومە خـوارێو کـە گـوێم لێبـوو دەرگـای ژوورەکـەی کرایـەوە یەکسـەر گەڕامـەوە، بـەڵام ئـەو لـە ژوورەکەی نەبوو. هەوەڵجار دوو دڵ بووم لەوەی خۆم بە تەوالێتەکەدا بکەم، چونکە خـۆی پێی خۆش نەبوو، بەڵام ئەمجارەیان خۆی گوتی: "فریام بکەوە! یارمەتیم بدە!" ئیدی ملی دابـووە خـەتو بـوو بـوو بـە پیـاوێکی دیکـە، زۆر گوێڕایـەڵو ڕام بـوو بـوو. ئـەو رۆژە هـیچ گلـەییو گازاندەیـەکی نـەبوو، ستایشـی هـەموو کەسێکی دەکـرد،و چـەندین جـار بـە مـنی گوت: "سوپاس، دۆستەکەم!" جا تۆ کە ئاگاداری چۆنیەتی پەیوەندییـەکانی ئێمـەی، پێت وایـە ئـەم رسـتەیە چـی دەگەیـەنێ؟ چ مانایـەکی هەیـە؟ پـێم گـوت بەرەبـەیان گـوێم لـە کۆکـە کـۆکی بـووە، بـەڵام بـە ئانقەسـت خـۆم لـە گێلـی داوە،و بـۆ ئـەوەی نارەحـەت نـەبێت، بـۆ ژوورەکەی نەچووبووم. بەرسڤی(وەڵام) دایـەوە: "خراپـت کـردووە، ئەگـەر هاتبـای هەسـتم بە ئاسوودەییو ئارامی دەکرد". بێگومـان زۆری ئـازار دەچەشـت، بـەڵام تـەنیا دوو رۆژ بـەر لە مردنەکەی، جارێك گوتی: "شەوانی بێ خەوی ترسناکە،. رۆژیش کۆکە خەفەم دەکات. یەك دانە مانگە ئەم مۆتەکەیە بەردەوامە". دوو شەوی دیکەی لەگەڵ ئەم مۆتەکانەدا بەسەر بـرد. چـەند ترسـناکە! هـیچ کـاتێ وای نـەدەگوت. دێوەزمـەی مـەرگ خەریکـە لێـی نزیـك دەبێتەوە. هەستی بە ئەجەل دەکرد، لێ نەیدەویست نـاوی بێنێو هیچی لـە بـارەوە بڵێت. رۆژی مردنەکـەی داوای کـرد دەسـتێك بیجامـەی بـۆ بکڕین. لـێ کـە پێمگـوت، ئەگـەر حـاڵی

باشتر نەبێت لەگەڵ ماشکادا بۆ سویسرا ناڕۆین، گوتی: "باشە تۆ تەسەوردەکەی حاڵم باش ببێت؟" ئەم ڕستەیەی بە جۆرێ درکاند کە هەرچیەکی لە مێشکا بوو، کەشفی کرد. بەڵام لەبەر دڵی من بیرەکەی خۆی بە ئاشکرا نەدەگوت، منیش لەبەر وەزعو حاڵی ئەو هیچم نەدەگوت. بەهەرحاڵ ئیدی لە بەرە بەریانەوە بۆ تاقە ساتێکیش بە جێم نەهێشت، وەك بڵێی پێشبینی ڕووداوەکەم کردبوو، بەبێ ئەوەی هەست بە هیچ ئازارێك بکات — بەلای کەمەوە بە رواڵەت — چاوی لە منو دنیا پۆشی. هەناسەی بەرە بەرە هێواش تر دەبوو، و لە پڕ هەموو شتێك کۆتایی هات. ڕۆژی دوایی چوومە ژوورەکەی. دەترسام سەری هەڵدەمەوە، تەسەورم دەکرد، شوێنەواری دەردو ئازار بە دەموچاویەوە، لە سەردەمی نەخۆشیەکەی ترسناکتر بێت، بەڵام تەسەورناکەی چ سیماو سەروچاوێکی گەشو ئارامو جوانی هەبوو! دوێنێ لێرە ناشتمان، هەوەڵجار بیرم کردەوە کە جەنازەکەی بۆ روسیا بێنمەوەو بە بروسکە تۆ ئاگادار بکەمەوە، بەڵام دوایی ڕام گۆڕی، چونکە خوێ بە زامەوە کردن بوو. دڵم بەحاڵی تۆ دەسوتێ کە دەبێ لە کاتی ڕاودا، ئەم هەواڵەت بگاتێ. بەڵام هەرچۆنێك بێ لە گەرمەی مژولیتدا، بە ئەندازەی من خەمبارت ناکات. بەڵام ئامادە بوونم لەسەرەمەرگیا شتێکی باش بوو، چونکە ئێستا لە هەموو کاتێکی دی پتر هەستدەکەم کاتێ کە مرۆڤ کەسێکی ئازیزی میناکی ئەو لە دەست دەدات، ئاسانتر خوو بە مەرگەوە دەگرێو دەگەڵ مردندا ڕادێ. نامەکەت کاتێ گەیی کە ڕێورەسمی پرسەکە لە کۆتاییدا بوو. بەڵێ، ئیدی تۆ جارێکی دی دەگەڵ ئەودا ناچیتە شکارو ڕاو. دوو ڕۆژ بەر لە مردنەکەی نووسینەکانی خۆی لەمەڕ راو بۆ من خوێندەوەو زۆرمان قسە دەربارەی تۆ کرد. دەیگوت خودا لە نێو عەبدانی خۆیدا، تۆی بۆ بەختەوەری ئەفراندووە، لێ بە دەستی خۆت، خۆت ئازار دەدەی. دوو ڕۆژ دوای مردنەکەی ئەوجا بیرم کەوتەوە وێنەیەكو پەیکەرێکی سەری بۆ بدەم بەکرد، وێنەکە باش دەرچوو، بەڵام پەیکەرەکەی سەری عالە.

تەسەور ناکەم بەر لە هاتنی تۆ بۆ ئێرە، من بۆ روسیا بگەڕێمەوە. بێزەحمەت لە بێشەو درەختانی نزیکی ئاشەکە، دار بدە بەو مسکێنانەی کە لە ئەنجامی ئاگر کەوتنەوەکەوە زیانیان پێگەییوە. ئێستا دەگەڵ ماسنکادا لە ڕۆخی دەریام، هەوڵدەدەم خۆم مژول بکەم، لێ ناتوانم. لە نامەکەی پوریدا، بەرواری مردنەکەی (نیکولایی)م تۆمار نەکردووە. بە گوێرەی ساڵنامەی خۆمان ڕۆژی ٩/٢٠، سەعات نۆی ئێوارە مردووە.

دڵنیام دوای وەرگرتنی ئەم نامەیە ئیدی ئارەزووی چونە ڕاوێت نابێ، بە تایبەتی لە ڕاوگەی چرباچۆڤکا، جارێ واز لە هەموو شتێ بێنەو بە پەلە لەگەڵ ماساو گریسا وەرە بۆ ئێرە. تەسەورم نەدەکرد کەشو هەواو تەبیعەتی ئێرە ئەوەندە خۆشو لە بار بێ.

***(ئەمە زیادەیەکی پەراوێزی نامەکەیە)***

شەو شیرەتکارێکی چاکە، پاش بیرکردنەوەو وەیادهێنانەوەی ئەو ئامۆژگارییەی نیکولایی کە دەیگوت خۆت لە ئامۆژگاری خەڵکانی دی دوور بگرە، ئەوەی لە نامەکەدا دەربارەی

هاوردنی ماساو گریسا(٢) نووسیومە، نا بەجێیە، چونکە من بە باشی سەر لەو شتانە دەرناکەم.

***پەراوێز:***

***١- میتینکا: مەبەستی تولستوی، دیمیتری ی برایەتی، کە دووەم برایەتی لە چوار برا، و لە ١٨٥٦/١/٢٤دا مرد.***

***٢- ماساو گریسا: ژنو نۆبەرەکەی (ن. ن. تولستوی)ن.***

## بۆ ئا.ئا. فت

## پیر، ١٨٦٠/١٠/١٧

تەسەوردەکەم لەوەی کە بەسەر مندا هاتووە ئاگادار بیت. بەگوێرەی ساڵنامەی خۆمان، نیکولای رۆژی ٩/٢٠ بە باوەشی منەوە گیانی سپارد. هیچ بویەرو کارەساتێك بە درێژایی تەمەنم، بەو جۆرەی نەهەژاندووم. هەق بە تۆ بوو کە دەتگوت لە دنیادا هیچ شتێك لە مردن خراپترو ناخۆشتر نیە. لیٚ ئەگەر بە دروستیو وردی بیربکەینەوەو بۆمان دەربکەویٚ کە مردن کۆتایی هەموو شتێکە، هەنگیٚ دەیسەلمێنین کە هیچ شتێك - یش لە ژیان خراپتر نیە. بیٚ ماناتر نیە. یانی چی ئەم هەموو زەحمەتە بکێشریٚ کە ن. ن تولستوی بهێنرێتە ئاراوەو دوایش بڕواتو هیچ شوێنەوارێکی نەمێنیٚ؟ بە خۆی نەیدەگوت هەست بە نزیکبوونەوەی مردن دەکات، بەلاّم من کە هەنگاو بە هەنگاو تاقیبم دەکرد، دەمزانی چەندی تەمەن ماوە؟ چەند ساتێك بەر لە مردنەکەی لە پڕێکاو بە دەم نیمچە خەوەوە راپەڕیو بە ترسو سەرسامییەوە پرسی: "ئەمە چیە، چی دەبینم؟" هەڵبەتە هیچی نەبینی بوو، بەڵکو مەبەستی داگەڕانو نشێوبوونەوە بوو بەرەو دنیای نەمانو پوچی. جا ئەگەر ئەو هیچی بە هیچ نەکردبیٚ،و هیچی کەشف نەکردبیٚو نەدۆزیبێتەوە، من دەتوانم چی بکەم؟ من چی کەشف دەکەم، چی دەدۆزمەوە؟ من شتێکی لەو کەمتر دەدۆزمەوە. نەخێر! من تا دوا هەناسە میناکی ئەو دژی مەرگ دەخەبتم. دوو رۆژ بەر لەوەی بمرێت، پێم گوت:"پێویستە تەنەکەی میزەکەی بێنمە ژوورەوە.گوتی: نا! ڕاستە بێتاقەتو بیٚ هێزم بەلاّم هێشتا نەگەییومەتە ئەو ئاستە و هەر بەرگری دەکەم".

تـا دوا هەناسـە بـەرەنگاری مـەرگ بـووەوە. خـۆی هـەموو کارەکـانی ئـەنجام دەدا. هەوڵیـدەدا بـەردەوام خـۆی مـژوڵ بکـات: نامـەی دەنووسـی. پرسـیاری کـارو بەرهەمـەکانی مـنی دەکـرد، ئامۆژگاری دەکردم، بەڵام پێموابوو، لە سۆنگەی هاندەرێکی دەروونیەوە خۆی مژوڵ نە دەکرد، بەڵکو زیاتر پابەندی بوو بە داب و ئوسوڵەوە. تـەنیا یـەك شـتی تـا کۆتـایی بـۆ مایـەوە ئـەویش تەبیعەت بوو. تەنیا یەك رۆژ بەر لە مردنەکەی، لە ژوورەکەیدا میزی کرد. لە بێ هێزیدا کەوتبووە سەر تەختە خەوی پاڵ پەنجەرەکە. کاتێ چوومە ژوورەکەی بە چاوی پڕ گریانـەوە گـوتی: "ئـاخر من چ خێرو خۆشیەکم،چ لەزەتێکم بۆ سەعاتێکیش لە خۆ دیوە!"

لـە گـڵ دروسـت بوویـت و بـۆ باوەشـی گـڵ دەگەڕێیتـەوە! تـەنیا یـەك شـت بـۆ بەشـەر دەمێنێتـەوە، ئـەویش ئـەو هیـواو ئومێـدە ئاڵۆزەیـە کـە لـە دوای مـردن شـوێنەواری لـە تەبیعەتـدا، شـتێك دوای خـۆت بـە جـێ بێڵـی. هـەر هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە ناسـیوویانەو لـە دوا دەمـی ژیانـدا دیتوویانـە دەڵێن: "بە ئاسانی و ئارامییـەکی سـەیر دنیـای بەجێهێشـت" لـە کاتێکدا مـن دەزانـم بـە چ تـرس و ئـازارێکی سـامناکەوە گیـانی سـپارد. هـەزار جـار بـە خـۆم گـوت: "بـا لێگـەڕێن مردووەکـان، مردووەکان بە خاك بسپێرن". هەڵبەتـە پێویسـتە هـەوڵ بـدرێ ورەی خـۆت بـەرز بکەیتـەوە، بـەڵام نـاکرێ شـتێك کـە بـە گـوێرەی قـانونی جاذبـە لەسـەرێ ڕا بـۆ خـوارێ بـێ، بـە جـۆرێ پێچـەوانە بکەیتەوە کە لە خوارێ ڕا بۆ سەرێ بڕوات. نوکتەیەك کە هەزاران جار دووبارە کرابێتـەوە، نابێتـە مایەی پێکەنین. کە مەیلت لە نانخواردن نەبێ، ناتوانی هیچ بخۆی. باشە ئەگەر سبەینێ ترس لـە مـردن دووبـارە دەسـت پـێ بکاتـەوە ، هـەر هـەموو درۆو خۆخەڵـەتێنی و تورەهاتـەکانی دیکـە دەربارەی سوودو بەهرەو نیعمەتەکانی ژیـان، بـۆ کەسـێك کـە لـە حـاڵی مەرگـدا بـێ، هـیچ ئاکـام و ئەنجامێکی نەبێ چۆن دەتوانێ مقاوەمەت بکات؟ بەڕاسـتی گاڵتـە جاڕو مەخسـەرەیەکی سـەیرە! سەدان و هەزاران ساڵە کە تیرەی بەشەر، بۆ یەکتری دووبارە دەکەنەوە کە هەوڵبدە سودمەند بیت، پڕ تەقوا عیبادەت بیت، تا تەمەن بڕدەکات هێمنی و خۆینساردی خۆت بپارێزە، بە ئێستاشـەوە هەموو بەردەوام دەیڵێنەوە کە فەزیڵەت و بەختەوەری لە حەقیقەت جۆییـەوە دێتـە ئـاراوە، کەچـی ئەو حەقیقەتـەی مـن بـە درێـژایی سـی و دوو ساڵەی تەمـەنی خـۆم بـە دەسـتم هێنـاوە، ئەمەیـە کـە چارەنووسی ئێمە لەم جیهانەدا ترسناکترین فریوو تاوانە، و خۆ ئەگەر پیاوێك ئەم چارەنووسە بۆ پیاوێکی دی دابنێ و دیاری بکات، ئەوا ئێمەی ئازادیخوازان ناتوانین بـە هـیچ بیانوویـەك بـەرگری لە و کارەی بکەین.

هەمیشە بە گوێمانا دەخوێنن کە "فەزیڵەت و تەقوا بریتییە لە سوپاس و ستایشی یەزدان، خـودا، بیراهمەن. پێویستە ژیان وەکو خۆی، وەکو چۆن هەیە قەبوڵ بکەن. ئێوە خۆتان بەدەستی خۆتـان ئەم رەوش و وەزعە ناجۆرو نالەبارەتان بۆ خۆ دروست کـردووە، خـودا هـیچ پەیوەندییـەکی پێـوە نییە!" ئاخر ئەمە ڕاستە؟ یانی من ژیان بەم جۆرەی کە هەیە، یانی لە قێزەوەرتـرین و بـازاڕیترین و قەڵبترین رەوش و وەزعدا قبوڵ بکەم؟ باشترین بەڵگە بۆ ئەوەی کە من لە هێنانـە ئـارای ئـەم وەزع و حاڵە بەرپرس نیم ئەوەیـە کـە هـەزاران سـاڵە هەوڵـدەدەین بـاوەڕ بـەم تەلیقناتکارییـە بکـەین، بـەڵام هەرکـە مـرۆڤ فامدەکاتـەوە و هەسـتێکی زیـاتر پەیـدا دەکـات و لـە نـەزانی و گەوجایـەتی دوور

دەکەوێتەوە، بۆی بەدیار دەکەوێت کە هەموو ئەم شتانە پوچ و بێهودەو گەوجاندنە، و ئەو حەقیقەتەی کە ئەو لە هەر شتێکی دیکەی خۆشتر دەویٚ ترسناکە، ترسناك بەم مانایەی کە کاتیٚ چاوانت دروست دەکەیتەوە، ترساو وحەپەساو لە جێی خۆت رادەپەڕیت و دەپرسیت: "برا! ئەمە چیە کە من دەی بینم!"

وێڕای ئەمەش شتێکی بەڵگە نەویستە مادامێکی ئیشتیات هەیەو خواردن دەخۆیت و تا ئەو کاتەی ئەم ئارەزووە نائاگایانەو گەوجانەیەی پەی بردن بە حەقیقەت و دەربڕینی حەقیقەت لە دەف بەشەر هەبێت، هەوڵدەدات حەقیقەت بەدەستبێنیٚ و ڕای بگەیەنیٚ و ئاشکرای بکات. لە جیهانی مەعنەویات و ئەخلاقیاتدا تەنیا ئەم شتەم بۆ ماوەتەوەو هێشتا نەمتوانیوە بەسەریدا زاڵ بم و ئەمە تەنیا کارێکە کە دەیکەم، بەڵام نەك بە چاولێکەری هونەری تۆ کە هونەرێکی درۆینەیەو هیچی تر. من چیتر ناتوانم درۆی ئەفسونگەریم خۆش بوێ. زستانەکە تەنیا لەبەر ئەمە لێرە بەسەر دەبەم، چونکە لێرەمو ژیان بۆ من لە هەموو شوێنیٚ هەر وەکو یەکە، فەرق ناکات.

تکایە نامەم بۆ بنووسە. وەکو چۆن براکەم تۆی خۆشدەویست و تا دوا دەمی ژیان تۆی لە یاد بوو، منیش رێزو حورمەتت دەگرم.

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

## هیر، ١٨٦٠/١٠/١٧

دۆستی ئازیزم ئالکساندرین! ماوەیەکە نامەم بۆ نەنووسیویت، چونکە دەگەڵ خوشکەکەمدا، هاتووم بۆ هەندەران تا جەنازەی براکەم، کە لە پاییزدا نەخۆش کەوت و نزیکەی مانگێك لەوەپێش کۆچی دوایی کرد، بێنینەوە، هیچ کاتێك وەکو ئەم رۆژانە بەم ڕادەیە پێویستم بەتۆ نەبووە. ماوەی دوو دانە مانگ بە دیاریەوە بووم و چاودێری کوژانەوەی چرای ژیانیم دەکرد. ڕاستت دەویٚ بە باوەشی منەوە گیانی سپارد. براکەم نەك یەکێك بوو لە باشترین ئەو پیاوانەی کە لە ژیانما تووشیان بوو بووم، هەر براو شەریکی باشترین بیرەوەرو یادگارانی ژیانم نەبوو، بەڵکو ڕاستت دەویٚ بە باشترین دۆست و هاوڕێم دەژمێردرا. ڕەنگە تۆ تا ڕادەیەك ئاگاداری خەمباری من بیت، بەڵام ناتوانی وەکو من پەی بە کاریگەرییەکانی ئەم کارەساتە بەریت. نەك هەر نیوەی ژیانم لە دەست ڕۆیی، بەڵکو هەموو هێزی زندەگیم دەگەڵ ئەودا بە خاك سپێردرا. جا ئێستا کە ئەو بەو هەموو ڕەنج و عەزابەوە ڕۆییوە، مانی من هیچ مانایەکی نیە. ئەوا مام، چ چارەنووسێك چاوەڕوانم دەبێت؟ چارەنووسێکی خراتر لە هی ئەو. تۆ بەختەوەریت چونکە مردووەکانت لەوێندەرن و تۆ جارێکی دی دەیانبینی – وێڕای ئەوەی زۆرجار بیرم کردووەتەوە کە ژیانەوەی پاش مەرگ باوەڕکردەنی نیە، بەڵام ئەگەر ئەمە ڕاست بیٚ شتێکی زۆر جوانە – کەچی مردووەکانی من هەر هەموویان میناکی درەختانی ئاگرگرتوو، فەوتان و دیار نەمان. نزیکەی یەك هەیڤە کە هەوڵدەدەم کاربکەم، جارێکی دی بێمەوە سەر نووسینەوەی ئەو شتانەی کە تورم داون، بەڵام خۆم بە خۆم پێدەکەنم. هیچ ئارەزوویەکی گەڕانەوەم بۆ روسیا نیە، هەر لێرە

دەمێنمەوەو ژیان هەر ژیانە. لەلایەکی دیکەوە دەبێ بیرێك لە خوشکەکەم‌و منداڵەکانی بکەمەوە. مـن ئەمانـەت بـۆ نانووسـم تـا دڵـت بـە حـاڵم بسـووتێ، تکایـە هـیچ شـتێکم دەربـارەی خـۆم بـۆ مەنووسـە، بـەڵکو دەربـارەی بـارودۆخی روسـیا و کارەکـانی خـۆت‌و دایکـت‌و خوشـکەکانت‌و شازادەخانمەکانم بۆ بنووسە.

بە خوشکەکەمم گوتووە، دۆستان لە تەنگانەدا باشتر دەناسرێن. نەك لەبەر ئەوەی وەکو دەڵێن بـە هاناتـەوە دێن‌و یارمـەتیت دەدەن، بەڵکو لەبـەر ئـەوەی لـە کـاتی پرسـەداریدا یادگـاری باشـترین کەسـان جـارێکی دی تـازە دەبێتـەوە. رۆژ نـەبووە تـۆم لـە بـیر نـەبێت، بـە تایبـەتی لـەو رۆژانـەی دواییدا ئامادەبووم لە ڕای دیتنی تۆدا هەر جۆرە فیداکاریەك بکەم.

خودا حافیز! پورم بۆی نووسیوم کە نامەکەی تۆی پێگەییوە، بەڵام هێشتا بۆی نە ناردووم. ئەمە ئەدرەسەکەمە: هیر، فەرەنسا، خانەی سنگیر.

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

## هیر، ١٨٦٠/١١/٢٥

دۆستی ئازیزم ئالکساندرین! نازانم بەرسڤی نامەکەی تۆم داوەتەوە یان نا؟ بە هەرحاڵ وا چەند دێڕێکی دیکەت بۆ دەنووسمەوە. رۆژی ١١/٢٥ جەژنی ئاینی‌و ئاهەنگگێڕانی پەیکەری حـەزرەتی مریـەم بـوو. منـیش چـووم بـۆ تەمەشـاو بەوپـەڕی نارەحـەتی‌و خـەمباری‌و تەنانـەت تورەییـەوە، ئـــاپۆڕای خەڵکەکـــەو ئـــەو پەیکـــەرەم، کـــە هـــەڵیانگرتبوو و دەیـــانگێڕا، بینـــی‌و دەربـــارەی خورافەپـەروەری‌و مەخسـەرەبازی ئـەم خەڵکـەی، کـە جـاران بـەغیلیم بـە خۆشـحاڵی‌و زیتـەڵی‌و زندوویەتیان دەبرد، هەستم بە بێزاری‌و نەفرەت کرد. لە نێو ئەم حەشاماتەوە پۆستەچیەك بەرەو لام هات‌و نامەکەی تۆی دامێ. بە دەم رێگەوە دەستم بە خوێندنـەوەی کـرد، یەکسـەر خـەمێکی توند دڵی گرتم. خۆم بە عەمارێکی داران دا کردو لەسەر کاریتەیەك دانیشتم‌و بە وردی نامەکەم خوێندەوە. پاشان بۆ ماوەی یەك دانە سەعات، بەبێ ئـەوەی بزانم بـۆ، ڕوندکم هەڵڕشت. ئیدی نازانم چ بیرو هەستێك-م لەلا پەیدا بوو، تەنیا لە یەك شت تەواو دڵنیام: نامەکەی تۆ قەناعەتی پێکردم کە یەجگار خۆشم دەوێی. پاشان کە خۆم گەیاندەوە نێو ئاپۆڕای ئیمانداڕەکان لـە دڵـی خۆمدا هەستم بـە خۆشـی‌و شادییەکی تایبـەتی کـرد، چونکە منیش دەستەمۆی خورافاتـەکانی خۆم بوو بووم.

بەشەر تەنیا لە ڕێگەی ژیانەوە دەگاتە قەناعەت. هزرو بیر، بە تایبەتی ناخۆشی و بەدبەختی شتێکی ئەتۆت فێر ناکەن، لە دەرفەتێکی دیکەدا باسی مردنی براکەمو دوا ساتەکانی ژیانیت بۆ دەکەم، تا بزانیت هیچ شتێك هێندەی مردن کار لە ڕۆح ناکات. بە هەرحاڵ ئەوەی کە لە هەموو ئەمانەوە بۆم دەرکەوتووەو تەواو لێی دڵنیام ئەوەیە کە نە ژیانمو نە مردنم لە هی ئەو باشتر نابێت، لە کاتێکا هەم ژیانو هەم مردن بۆ ئەو بارێکی قورس بوو. جگە لەمە هیچی تر نازانم.
لە نامەکەمدا کە گەییمە ئێرە بۆ چەند رۆژێك وازم لێی هێنا، ئێستا هەندێ شتی جیاوازت، لەوەی کە پێشتر قەولم دابوویتێ، بۆ باس دەکەم. من لەبەر خاتری تۆ ئینجیل دەخوێنمەوە. حاڵی حازر ئینجیلم نیە، لێ یەکێك لە ئاشنا چاکەکانی تۆ، ئولگادندکوڤا، بەڵێنی داومەتێ ئینجیلێکم بۆ بێنێ. ژنێکی یەجگار لە بەردڵانەو من خۆشەویستیەکی تایبەتیم بۆی هەیە، چونکە تۆم بیر دەخاتەوە، بە تایبەتی کە خاتری تۆی لە لایە.
دەربارەی خۆم، چی بڵێم؟ بێگومان دەزانیت کە لە پارەوە کەوتوومەتە کاری فێرکردنو پەروەردەو باوەڕم پێبکە کە حاڵی حازر ئەمە تاقە داوێکە کە بە ژیانەوەم دەبەستێت. بە داخەوە ئەمساڵ ناتوانم بە کردەوە ئەم چالاکییە ئەنجام بدەم بەڵکو بۆ ئاینندە کاردەکەم. لە پاییزدا سەرمام بوو، و سێ دانە هەیڤە بەردەوام دەکۆکمو ئامۆژگاریان کردوم لە وەرزی زستاندا باشور بەجێ بێڵم. بە هەرحاڵ ژیان لێرە، بۆ من ناخۆشە، هەست بە جۆرە بێتاقەتی و پەشیمانیەك دەکەم، حەزناکەم وەکو گەشتیارانو گەڕۆکان لە جۆرە میوانیەکی بەردەوامدا بژیم، ناخۆشە. ئێستا زیاتر لەو پەپولانەی کە هەندێجار دەفڕنو هەندێجار دەمرن، ورد دەبمەوە، بە چاوی میهرو دلۆڤانی دەڕوانمە ئەو خەڵکە نائومێدو بەدبەختو چارە ڕەشەی کە جاران بەوپەڕی خەمساردیو بێ موبالاتی بەلایاندا تێدەپەڕیم، کەچی ئێستا بە جۆرێ تەمەشایان دەکەم لە تۆ وایە خزمو کەسوکاری خۆمنو حەقێکیان لە ئەستۆمە.
ئەم هەفتەیە بۆ ماوەی چەند رۆژێك بۆ نیسو لەوەیە بۆ ئیتاڵیاش بڕۆم، بەڵام هیچ لە خۆم ڕانابینم بتوانم ماوەیەکی زۆر خۆم لەبەر تە نیایی بگرم. زۆرم پێ سەیرە خەڵکێك سۆراخ و تاقیبی لەزەت دەکەن. خودا حافیز! ئەگەر ویستت نامەم بۆ بنێری بۆ ئەدرەسەکەی (هیر)ی بنێرە. هیوادارم لە بەهارا بتبینم. بەڵام ئایا هەنگێ لە سان پترزبۆرگ دەبیت؟ سڵاوم بە هەموو کەسوکارو خزمانت بگەیەنە.

**بۆ سن. ن. تولستوی**

**پاریس، ١٨٦١/٢/١٧**

بەر لەوەی بەرەو لەندەن وەڕێ بکەوم چەند وشەیەکت لە چاخانەیەکدا بۆ دەنووسم. خۆ ئەگەر بخوازم وەزعو حاڵەکان وەکو پێویست باس بکەم کتێبێکی دوو بەرگی دەوێت.

دووەمین نامەتم پێگەییشت، بەڵام نامەی یەکەمت سەرانسەری ئیتاڵیای بەدوودا کردووم‌و لە شوێنێك دا وەستاوە. مەگەر هەر خوا بزانێ دوای خوێندنەوەی نامەکەت چەندم خۆزیا پێ خواستوویت! من جارێ ناتوانم بگەڕێمەوە. هەفتەیەك لە لەندەن‌و دوو هەفتە لە برۆکسل‌و ئاڵمان‌و یەك هەفتەش لە پترزبۆرگ دەمێنمەوە. جاکوف کە بڕیاری داوە بۆ روسیا بگەڕێتەوە، دەبینی‌و ئەوەندەی بتوانێت وەزعو حاڵی منت بۆ باس دەکات. وەزعی سیپەلاکەکانم نە باشەو نەخراپەو لەم تەمەنەی مندا پەیوەندی بە خودی خۆمەوە هەیە. یەکێك لە پزیشکەکان کە بۆم گێڕایەوە دوو برام بە نەخۆشی دەردە باریکە (سیل) مردوون، بە ئاقڵی گوتی: "ئەمە خۆی لە خۆیدا هاندەرێکە بۆ ئەوەی نەیەڵیت تووشی هەمان چارەنووسی ئەوان بیت." ئەو دەگەڵ قانونی ئیحتیمالات‌و ئەگەراندا نیە. ئەگەر تۆش وەکو خۆم ڕاوبۆچوونی ئەو بزانیت خۆشحاڵ دەبیت. دەبێ ورەی خۆت بەرزبکەیتەوە. هەندێجار وا هەستدەکەم کە من تۆ هاندەدەم‌و هەندێجار ترسی ئەوەم هەیە تۆم لێ ببی‌و بێ پشت‌و پەنا وەمێنم. بە هەرحاڵ تاقەتم نیە بۆ یاسنایا بزڤڕمەوەو سەرینە سوورەکەت لەسەر تەختەکە بدینم. تۆزێ لەمە پێش تورگینیف‌و چیچرین‌و من دەربارەی جاویدانی‌و نەمری رۆح قسەمان دەکرد. تورگینیف بۆچوونی خۆی لەمەڕ تیشك‌و روناکی تەنە ئاسمانیەکان باسکرد، بەڵام تیۆری‌و بۆچوونەکەی قەناعەتبەخش نیە. جا ئەگەر بەدەم بیرکردنەوەوە لە من، لە خۆت بپرسیت "بۆچی بە خۆڕایی خووی داوەتە گەشت و گەڕان؟ ئایا دەخوازێت دڵنیا ببێ کە ئومێدێك دەربارەی ژیانەوەی پاش مردنی نیکولایی هەیە یان نا؟" ئەوا بە هەڵەدا چوویت، چونکە من بە جۆرێ خووم بە سەفەرو گەڕانەوە گرتووە کە لێم بووە بە عادەت. ئامانجی بنەڕەتی ئەم سەفەرەی ئێستام ئەوەیە کە ئەوەندە شارەزای پرۆسەو کاروباری فێرکاری‌و پەروەردەیی بێگانان ببم کە هیچ کەسێك لە روسیادا، بە ئەندازەی من شارەزایی لە کاروباری فێرکردن‌و پەروەردەی وڵاتانی فەرەنگی نەبێت،و لە تێکڕای ئەو پێشکەوتنانەی کە لەم رێگایەوە بە دەست هاتوون، کارامەیی‌و شارەزایی منی نەبێت.

بەنامەکانی پێشارەکەمدا وا دەردەکەوێ کە لە یاسنایادا ئاژاوەو هەراو هەنگامەو دزی و فزییەکی سەیر لە ئارادایە. هەرکەسێك بۆی بلوێ تالانی دەکات. تۆ وا بنوێنە کە سەرپەرشتی کاروبارەکانم دەکەیت، بەڵکو تا دێمەوە هەرچیم هەیە نە یدزن‌و وێرانی نەکەن. پێشکارەکەم بە داخ‌و کەسەرێکی زۆرەوە بۆی نووسیوم هیچ پارەو پولێك لە قاسەکەدا نەماوە، حاڵبوکی من تاقە کۆپیکێکم لێی دەرنەهێناوە، گوایە خەرمانکوتەکە لە کار کەوتووە، دەیەوێ حەیوانەکان بفرۆشێت، لەبەر ئەوەی گوایە پارەی نیە. هەوڵبدە تا من دێمەوە، وەزعو حاڵەکە تۆزێ بێنەوە تایم، گرینگترین شت ئەوەیە کە پارەی ئویرباخ بدەیت‌و هیچ شتێك بە تایبەتی حەیوانات بەر لە پایز نەفرۆشیت. خودا حافیز، دەستی پورەکانم ماچ دەکەم.

*ل. تولستوی*

## بۆ ئا. س. تورگینف

**١٨٦١/٥/٢٧**

**هیوادارم ویژدانت هاتبێتە گۆو ئاگاداری کردبێتەوە کە تۆ دەرهەق بە من هەڵەت کردووە، بە تایبەتی لە حوزوری فتو هاوسەرەکەیدا(١). بۆیە نامەیەکم بۆ بنێرە تا بتوانم بۆ (فت)ی بنێرم. ئەگەر داواکەم بە ڕاستو پەسند نازانی ئاگادارم بکەوە. لە بوگوسلاف چاوەڕوان دەکەم.**

***ل. تولستوی***

***پەراوێز:***

***١- ڕۆژی ٥/٢٧ تولستویو تورگینف کە لە ماڵی فت میوان دەبن، لێیان دەبێ بە قەرەقشە، لەسەر ئەوەی کە تورگینف ئەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن مامۆستای کیژەکەی فێری چاکەکاری دەکرد، و تولستوی گاڵتەی پێکرد. تورگینف هەڵچوو، و بە ئیهانەوە بە سەریا نەڕاند: "ئەگەر واز نەهێنی کەپوت دەشکێنم!".***

## بۆ ئا. ئا. فت

**بوگوملوف، ١٨٦١/٥/٢٨**

**خۆم پێنەگیراو ئەو نامەیەم کە تورگینیف لە وەڵامی نامەکەی مندا نووسی بوو، کردەوە(١). هیوادارم پەیوەندی تۆ دەگەڵ ئەم پیاوەدا لە هەموو ڕوویەکەوە باش بێت، بەڵام من لێی بێزارمو بەم نامەیە هەموو جۆرە پەیوەندییەکی دەگەڵدا دەبڕم، مەگەر تە نازولم بۆ بکاتو پۆزشم بۆ بێنێتەوە. ڕاستە بەڕواڵەت زۆر هێمنو ئارامو خۆێنسارد بووم، بەڵام لە ناخا ئاگری تورەییم کڵپەی دەسەند. هەستم دەکرد دەبوایە داوا لە تورگینیف بکەم کە پۆزشێکی قورسترو جدیترم بۆ بێنێتەوە، ئەوە بوو لە نوڤسلکی یەوە نامەیەکم بۆ نووسی کە عوزرخواییەکی جدیم بۆ بێنێتەوە. ئەوەتا وەڵامێکی قەناعەتبەخشی داومەتەوە، من ئەوەندەم بۆ نووسیوە هۆی ئەمەی کە لە هەڵەکەی دەبورم ناسازگاریو نەگونجانی تەبیعەتمان نیە، بەڵکو هۆیەکەی شتێکە کە خۆی باشتر دەزانێت چیە(٢)، جگە لەمە چونکە خۆی لە وەڵامدانەوە دەدزییەوە، نامەیەکی توندترم بۆی نووسیو داوام لێکرد بێتە مەیدانو دوئێل بکەین، و هێشتا وەڵامەکەیم پێ نەگەییوە، خۆ ئەگەر پێشم بگات، بەبێ ئەوەی بیخوێنمەوە بۆی دەنێرمەوە، ئەمە بوو کۆتایی ئەم سەربورو**

رووداوه خەمناكە كە چونكە سەرەتاكەی لە ماڵی ئێوەدا رووی دا، با ئاگاتان لە كۆتاییەكەشی هەبێت.

***پەراوێز:***

***١- ئەم نامەیەی تولستوی لە پشت نامەیەكی بەرواری ٥/٢٧ی تورگینیفەوە نووسراوە.***

***٢- تورگینیف لە نامەی دووەمیدا بۆ تولستوی، نووسیبووی:***

***"..... بێ چەندو چوون بە خۆشحاڵیەوە دان بەوەدا دەنەم كە هەق بەتۆ بوو، ئەم ئیعترافەشم لەبەر ئەوەیە تا بەم رێگەیە شوێنەواری قسە زۆرگەوجانەكانم بسڕمەوە. ئەم جۆرە قسانە زۆر لە منەوە دوورن، هۆیەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو توڕە بوونو هەڵچوونەی كە بە هۆی جیاوازی بیروبۆچوونەكانمانەوە دروست بوو. ئەمە نە لایەنی پۆزشی تیایەو نە پاكانە، بەڵكو تەنیا روونكردنەوەیەكەو هیچی تر. بۆیە داواكارم رێم بدەی كە دووبارەی بكەمەوە، چونكە پێشهاتەكە بە جۆرێ رووی دا كە شوێنەوارەكەی لە سڕینەوە نایەت، بە ئەركی خۆمی دەزانم جارێكی دی دووپاتی بكەمەوە كە لەم پێشهاتەدا هەق بە تۆیەو من خەتابارم."***

***تولستوی زر بە كورتیو بەمجۆرە وەڵامی ئەو نامەیەی دایەوە: "تۆ لە من دەترسیتو من لە تۆ بێزارمو حەزناكەم لە ئێستا بە دواوە بە هیچ شێوەیەك سەروكارم لەگەڵ تۆدا هەبێ."***

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

## یاسنایا پولیانا، سەرەتاكانی ١٨٦١/٨

كەرەكەی بەلعام(١)و گیشەی وێنجە هاتوونەتە زمان. نەخێر! تۆ لە من ناڕەنجێی. هەرگیز نا تۆرێی. ئایا وەختێ كە نامەیەكی دوو دێڕی تۆم پێدەگات، و من بە دووررودرێژی، وەڵامەكەی لە دڵی خۆمدا دەنووسم ئەمە بەس نیە؟ تۆ دەبێ ئەم حەقیقەتە بزانیت، جگە لەمانە، نامەكانی من بە چ كەڵكێكی تۆ دێن؟ تۆ مالچواو پروسكیو یازمسكایات هەن. تۆ خاوەنی هەموو شتێكی. ئاخر قەترەیەك لەدەریادا چ ئەسەرێكی هەیە؟ لێ وەزعو حاڵی من جیاوازە. ئا ئێستا لە پۆلیسخانە دێمەوە، لەوێندەر ماوەیەكی زۆر كەوتمە ئامۆژگاری ئەو مسكێنانەی كە بە قەستی كوشت بەر بوو بوونە گیان یەكدی، كە نەك هەر نابێ یەكتر خڵتانی خوێن بكەن، بەڵكو نابێ شەڕیش دەگەڵ یەكتردا بكەن. بە ئاغایانشم گوت نابێ بە زۆرو بە تۆبزی كیژان مارە بكەنو بدەن بە شوو، و ئێستاش نامەكەی تۆم وەرگرت. بەڵام منیش هەقی گلەییو گازاندەو سكاڵام نیە، چونكە بە كارێكی شاعیرانەو جوانی ئەوتۆوە خەریكم كە دووركەوتنەوە لەو كارە زۆر سەختو دژوارە، ئەویش پێڕاگەییشتنی كاروباری فێرگەیە. كاتێ كە لە كاری نووسینگەو لە دەست جووتیاران كە لە هەرچوارنكالی(لا)

ماڵەکەوە تاقیب و سۆراخم دەکەن، دەبمەوە، روو دەکەمە فێرگەکە، چونکە بیناکەی نۆژەن دەکرێتەوە، پۆلەکان بە پاڵ یەکەوەو لە نێو باخەکەدا ریز دەخرێن. بۆ ئەوەی بچیتە نێو پۆلی دەرسەوە دەبێ سەر دانەوێنی چونکە چرە رووەکان پێشیان گرتووە. مامۆستا لەوێدا مژولی دەرس گوتنەوەیەو فێرخوازیش دەوریان داوەو یان گاز لە سەوزە دەدەن یان گەڵای درەختێن زەیزەفون یان ئیفرابە دان دەکرۆژن، مامۆستاکە بە گوێرەی ئامۆژگاریو رێنوێنی من کار دەکات، بەڵام دەرس وتنەوەکەی زۆر باش نیە و شاگردەکانیش هەست بەمە دەکەن. زیاتر حەزیان لە دەرسی منە. نزیکەی سێ – چوار سەعاتان خەریکی گفتوگۆ دەبین بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك گلەیی بکات و بێتاقەت ببێ. ئەم منداڵانە وەسف ناکرێن مەگەر بە خۆت بیانبینی ئەوسا بزانی چۆنن، هەرگیز منداڵانی وا زیرەك و بە هۆش و بە ئەدەبم نەدیتوە. لە زەرفی دوو دانە ساڵدا، بێ ئەوەی هیچ جۆرە زەبت و رەبتێك هەبووبێ، یەك کیژ یان کوڕ تەمبێ نەکراوە، تاقە یەك بێ ئەدەبی یان گاڵتەو سوعبەتی ناشیرین یان قسەی نابەجێ لە کەس نەبینراوە. بینای فێرگەکە کە ئێستا بە تەواوەتی نۆژەن کراوەتەوە بریتییە لە سێ ژووری گەورە، یەکێکیان پەمەییەو دووانەکەی دی شینی ئاسمانین. لە یەکێك لە ژوورەکاندا نیمچە مۆزەخانەیەکمان رێك خستووە. لەسەر ئەو رەفانەی کە بە سەرانسەری دیوارەکانەوە داکوتراون، بەردێن جۆراوجۆر، ئێسکەپەیکەر، پەپولە، رووەکان، گوڵان و ئەسباب و ئەوزاری فیزیکی دانراون. ئەم موزەخانەیە رۆژانی یەك شەممە بۆ هەموو کەسێك کراوەیە،و ئەو کوڕە ئاڵمانیە، ینا (yena) کە کوڕێکی یەجگار باشە، تاقیکردنەوە دەکات. هەفتەی یەك دەرسمان لەمەڕ رووەکناسی هەیە،و هەر هەموومان بو تاقیب و سۆراخی گوڵ و رووەك و کارگان دەچین بۆ بێشە. هەفتەی چوار دەرسی ئاوازو مۆزیك و شەش دەرسی نیگارکێشیمان هەیە – کە ئەویش لەلایەن هەمان یارۆی ئاڵمانییەوە دەوترێتەوە – ئەم دەرسانە زۆر بە باشی دەوترێنەوە. روپێوی بە جۆرێ پێشکەوتووە کە حاڵی حازر جووتیارەکان سوود لە فێرخوازەکان دەبینن. جگە لە من سێ مامۆستامان هەن. ئەمە جگە لەوەی کەشیشەکەمان هەفتەی دوو دەرسی ئاینی دەڵێتەوە، کەچی تۆ هەروا دەزانی من کافری تەواوم. بە کەشیشەکەش دەڵێم دەبێ چۆن دەرسەکەی بڵێتەوە. دەرسە ئاینییەکان بەمجۆرە دەڵێمەوە، بۆ نموونە بە بۆنەی جەژنی (سن پیتر)ەوە چیرۆکی پیترو پایولۆ و هەروەها چۆنیەتی نوێژکردنمان شەرح کرد. کاتێ کە فیوفان(٢) مردن، باسی تەبەرۆکی مردووانمان کردو بەمجۆرەو بەبێ بەرنامەیەکی دیارو روون هەموو یاساو رێسا ئاینییەکان و گشت جەژنەکانی تەورات و ئینجیل بە دەرس دەڵێینەوە. دەرس و دەوام لە سەعات هەشتی بەیانییەوە تا نیوەرۆ و لە سەعات سێوە تا شەشی پاش نیوەرۆ بەردەوامە. بەڵام دەرس تەقریبەن تا سەعات دووی پاش نیوەرۆ درێژە دەکێشێت، چونکە منداڵەکان لە قوتابخانەکە ناچنە دەرێ. هەمیشە سوورن لەسەر ئەوەی زیاتر دەرس بخوێنن و شەوان پتر لە نیوەیان هەر لە فێرگەو قوتابخانەکەدا دەمێننەوەو لە ژێر کەپرو ساباتێن باخەکەدا دەحەوێنەوە. لە کاتی فراقێن و

نیـوه ڕۆژەو عەسـران‌و دواتـرا ئێمـەی مامۆسـتایان دەکەوینـە ڕاوێـژو تـەگبیران، ڕۆژانـی شەمموان یاداشتەکانمان بۆ یەکتر دەخوێنینەوەو خۆمان بۆ هەفتەی داهاتوو ئامادە دەکەین.
وا تەسـەوردەکەم لـە مـانگی ئـەیلول دا دەسـت بـە چـاپی گۆڤارەکـە بکـەم. کـاری دادوانـی‌و دادگەری کارێکی خۆشەو حەزی لێدەکەم ، بەڵام عەیبەکەی ئەوەیە کە ئەربابان (ئاغایان) هەر هەموویان لووتیان لێ هەڵکردووم‌و لە هەموو شوێنێ کۆسپ‌و تەگەرەم دەخەنە ڕێ.
خودا حـافیز دۆسـتی ئـازیزم! بـێ نامـەم مەکـە، بـەڵام ئـەوەش بزانـە کـە مـن لـە وەڵامدانـەوەدا تەمەڵم.

*ل. تولستوی.*

*پەراوێز:*

*١- ئاماژەیە بۆ ئـەو چیرۆکـەی تـەورات کـە گوایـە کەرەکـەی بەلعامی جادوگـەر، بـە دەنگـی مرۆڤ، بە زمانی مرۆڤ قسەی کردووە.*

*٢- فیوفان: یەکێکە لە جووتیارەکان.*

## بۆ ئا. س. تورگینیف

١٨٦١/١٠/٨

ئاغای بەڕێز!

لە نامەکەتدا، سـەرباری ئـەوەی کـە بـە خـۆت پێت گوتـووم: "گوایـە بـە بۆکسـان تـەختم دەکـەیت" هێشـتاش کـارو داواکـەی منـت بـە شـتێکی نـا شـەریفانە زانیـوە. قەیـدی نیـە بـاوا بـێ، مـن داوای بـوردن دەکـەم‌و خـۆم بـە خـەتابار دەزانم‌و چاوپۆشـی لـە وەش دەکـەم کـە داوام لێکردوویت ببێتـە شەڕە دوئیلی(١) من.

*کۆنت. ل. تولستوی*

*پەراوێز:*

*١- ئەم نامە کورتە کە بە داخەوە کۆتایی بە مێـژووی پەیوەنـدی نێـوان دوو نووسـەر دێنـێ، بەلای خوێنـەرەوە، دوای هەڵوێسـتی تونـدی تولسـتۆی، سـەیر دەنوێنـێ، لـە کاتێکـدا بـۆ تێگەییشـتنی هەڵوێسـتی تولسـتوی دەبـێ ئـەو نامانـەی کـە پێشـتر لـە بـەینی هـەردوو نووسەردا هەبوون، لەبەرچاو بگیرێن. لە کاتێکا مخابن نامەکانی تولستوی بۆ تورگینیف نە پارێزراون، نامەکانی تورگینیف بۆ تولستوی کە ماون‌و لەبەر دەستدان، پەیوەنـدی‌و وەزع‌و حاڵەکان بە تـەواوەتی روون دەکەنـەوە، تولسـتوی سـوور بـوو بـوو کـە دوئیلێکـی ڕاستەقینەو جددی بکەن نەك لەو فشە دوئیلانـەی کـە عادەتـەن لـە نێـوان دوو نووسـەردا*

*روو دەدەن، کە بە دوو قۆڵی لەگەڵ کەسی سێیەمدا کە دەمانچەی پێیە دەڕۆن و تۆزێک ڕووبەڕووی یەکتر دەوەستن و پاشان دوئیلەکە بە خواردنەوەی شامپانیا کۆتایی دێت. بە قسەی ژنەکەی تولستوی، و بە گوێرەی ئەم نامەیە، تولستوی ئەو کاتە چاوپۆشی لە دوئێلەکە کردووە کە تورگینیف دوای هەموو هەوڵێکی عوزرخوایی، کە هیچ ئەنجامێکی دەست نەکەوتووە، دوئێلەکەی بۆ (بەهاری ئاینده) واتە بۆ دوای گەڕانەوەی لە پاریس، دوا خستبوو.*

## بۆ ئا. ئا. فت

**١٨٦١/١١**

**تورگینیف پیاوێکی کمە. هەقی دارکاریکردنی هەیە، تکات لێدەکەم، وەکو چۆن زۆر جارم لێ دووبارە کردویتەوە کە باسی ئەوم بۆ مەکە، قسەی ئەوم بۆ مەگێڕەوە، کەچی هەر قسە چەورو نەرمەکانیم بۆ دەگێڕێتەوە، بەو ئاوایەش ئەم قسانەی منیش دەربارەی ئەو، بۆ خۆی بگێڕەوە.**

***کۆنت . ل. تولستوی***

**هەروەها هیوادارم چیتر نامەم بۆ نەنووسیت. چونکە نامەکانی تۆش میناکی نامەکانی تورگینف ناکەمەوە.**

## بۆ و. پ. بتکین.

**مۆسکۆ ، ١٨٦٢/١/٢٦**

**تۆ لە پارچە کاغەزێکی دڕاودا نامەت بۆ نووسیوم و منیش هەمان شت دەگەڵ تۆدا دەکەم. تۆ بە جۆرە توڕەییەك بۆت نووسیوم، لێ من بە جۆرە مەحەبەت و خۆشەویستییەکی خزمانەوە وەڵامت دەدەمەوە، باوەڕبکە، زۆر بە جدی وامدەزانی ئەم شەش سەد فرانکەت پێ دراوەتەوە، خۆ ئەگەر نەدرابێتەوە هیچ گوناح و خەتایەکی منی تیا نیە. کاتێ نامەکەتم پێگەیی وام وێنا دەکرد دەمرم. ئەم بارە دەرونی و روحیەم بە درێژایی ئەم هاوینە ترسناك و قورسە بەردەوام بوو. هیچ کارێکم نەکردووەو هیچ بابەتێکم نەنووسیوەو لە بەرسڤ و وەڵامی نامەکەی تۆش دا، تەنیا نامەیەکم بۆ خوشکم و نامەیەکی دیم بۆ سەڕافەکەی خەڵکی مارسی، کە ئەدرەسەکەیم ون کردووە، نووسیوە. وام خەیاڵ دەکرد تۆ پارەکەی خۆت وەرگرتووەتەوە، کەچی وادیارە یارۆی سەڕاف**

خواردویەتی و خستویەتیە تەنکەی باخەڵی.هەفتەی داهاتوو ئەم شەش سەد فرانکە نەعلەتیەت بۆ دەنێرم.

ئێستا لە هەوڵ و هۆڵی بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکەمم(١)و تا تۆقی سەرم نقومی کارم! باسی ئەمەی کە تا چەند شارەزای کارەکەمم و چەندم دڵ پێوەیە، ئەمەیان ئاسان نیەو توانای گێڕانەوەیم نیە. هێڤیدارم کە لەکۆڕو ئەنجوومەنە ئەدەبیەکاندا هەراو هەنگامەیەکی سەیرم لەسەر بەرپا بکات و ئەم هەراو هەنگامەیە ورەم پێ بەرنەدات و ساردم نەکاتەوە. لێرە جۆش و خرۆشێکی گەورە هەستاوە. لە پترزبۆرگ و مۆسکۆو تولا هەڵبژاردن بەردەوامە. خۆزیا مەسەلەکە هەر هەڵبژاردنی نوێنەران بوایە! سەبارەت بە بیروبۆچوونی خۆم، پیاو ڕاست بڵێ ئەقڵم ئەم هەموو هەراو هەنگامەیە نابڕێ. تا لە رووی فێرکردن و پەروەردەوە یەکسانیەکی زیاتر لە نێو جەماوەری خەڵکدا بەرقەرار نەبێت ، دام و دەزگای دەوڵەتڕانیش باش نابێت. کە تەماشای بارودۆخەکە دەکەم لە خۆم دەپرسم: سەرەداوی ئەم ڕواڵەتبازی و سیناریۆیانە لە دەستی کێدایە؟ بەڵام لە ناخدا بۆ من هیچ فەرقێکی نیە، من بە شێوەیەکی کوت و پڕو چاوەڕوان نەکراو بە حاکمی بەش هەڵبژێردرام و سەرباری ئەوەی کە بەوپەڕی هێمنی و دروستی ئەرکی خۆم ئەنجام داوە، ئەشرافەکانم لە خۆم تووڕە کردووە. دەیانەوێ لێم بدەن و دادگاییم بکەن، لێ تا ئێستا بۆیان نەچووەتە سەر. چاوەڕوانم تۆزێ هێور ببنەوە تا خۆم وازبێنم و ئیستیقالە بدەم. لێ بە ڕای من بناغەی کارەکە دروست بووە. تەنیا لە دەوروبەری من بیست و یەك فێرگەو خوێندنگە بە نۆ هەزار فێرخوازەوە خۆبەخۆ دامەزراوە، بۆیە سەرباری هەموو ئەم هەراو هەنگامەیەش هەر بەردەوام دەبن. دەستتان ماچ دەکەم و تکام وایە لێم زیز نەبیت. ئێستا پارەکەت بۆ نانێرم چونکە نیمە، لێ هەفتەی داهاتوو بۆتی دەنێرم.

بێزەحمەت ئەدرەسی کابرای سەڕاف (مارسی)م بۆ بنێرەو بزانە بۆچی پارەکەی تۆی نەداوە.

بە هەرحاڵ سەبارەت بە وەزعی خۆت نامەم بۆ بنووسە. هەموو جار هەواڵت لە فت کە وازی لە شاعیری هێناوە، بەڵام هەر پیاوێکی باش و یەجگار هۆشمەندە ،دەپرسم. پیاو کە دەچێ بۆ مۆسکۆ، بەو خەیاڵەی کە زۆر لە وەزع و حاڵەکان بێ ئاگایە، بەپەلە بۆ هەواڵی تازە دەچێتە دیدەنی کاتکوف و لنگنیف و چیچرین، لێ ئەوان هەرچەندە ئاگاداری هەموو هەواڵێکی تازەن، میناکی یەك دوو ساڵی لەوە پێش فزە ناکەن، کەچی فت هەرچەندە لە جێی خۆی ناجوڵێت و پەزەکانی خۆی دەلەوەڕێنێ و بۆ خۆی دەژی، کە دەم دەکاتەوە پیاو ئەفسوونی خۆی دەکات.

هیچ شتێکم دەربارەی دۆستە هاوبەشەکانمان پێ نیە. لە هەموویان بێئاگام،و بە جۆرێ ئالکاومەتە کاری خۆمەوە کە هەر بە خەیاڵیشمدا نایەن. هەموو ددانەکانم خەریکە دەکەون و هەڵدەوەرن، دەربارەی ژن هێنانیش هێشتا هیچ هەنگاوێکم نەناوە،و لەگینە تا کۆتایی تەمەن هەر بە سەڵتی(بە عازەبی، بە ڕەبەنی) وەمێنم. ئێستا وەکو جاران لە ژیانی ڕەبەنی ناترسم. ئەدی تۆ چ دەکەی؟ کەنگێ لە روسیادا دەتبینم؟ چونکە جارێکی دی لە هەندەران نامبینی.

***پەراوێز:***

*١- مەبەست لە گۆڤاری (یاسنایا پولیانا)یە کە تولستوی لە بەرواری ١٨٦٢/١/١٨دا مۆڵەتی بڵاوکردنەوەی وەرگرت.*

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

**مۆسکۆ، ٢٢ – ١٨٦٢/٧/٢٣**

دۆستی ئازیزم. بەر لەوەی لە (سامارا) بکەومە ڕێ نامەکەم وەرگرتیت.بڕیارم دا لە مۆسکۆوە وەڵامی نامەکەت بدەمەوە. سوپاسی لوتفت دەکەم. ئەوەندەش نەخۆش نیم، یان ڕاستتر وایە کە پێت بڵێم لە گوێزی ساغ ساغترمو هیچ نەخۆشیەکم نیە. ژارۆ کوتلر! وام وێنا دەکرد مردووە. ئەوم بینی. دەڵێن ئێستا کەمێك باشتر بووە. لەبەرچی نیگەرانی من بوویت؟ بە درێژایی ئەم ماوەیە هەر نیگەران بووم، تازە، لە وەتای زانیاری تەواوم لەمەڕ یاسنایا پولیانا دەست کەوتووە، لە مەبەستی تۆ حاڵی بووم. ئایا بەڕاستی ئەم دۆستانەی تۆ باشن؟ پوتاپوڤ(١)و دلگروکوڤ(٢)و ئاراکچوف(٣)، هەموویان دۆستی تۆن. لە یاسنایاوە نامەیان بۆ ناردووم کە ڕۆژی ٧/١ سێ خزاگ(عەڕابەیەك کە بەسەر بەفردا ڕادەکێشرێت) بە جەندرمەوە بۆ گوند هاتوونو فەرمانیان داوە کە هیچ کەسێك، تەنانەت پورێش لە ماڵ وەدەرنەکەوێو دەستیان بە پشکنین کردووە. لە تاقیبی چیدا بوون، مەعلوم نیە. یەکێك لە دۆستەکانی تۆ، سەرهەنگێکی خوێڕی، هەر هەموو نامەکانو دەفتەری بیرەوەرییەکانی، کە لێبڕابووم تەنیا بەر لە مردن بە نزیکترین دۆستی بسپێرم، خوێندوومەتەوە،و بە تایبەتی دوو دەستە لەو نامانەمی کە ئامادە بووم هەرچی داراییم هەیە بیدەم بە مەرجێ بە نهێنی بمێننەوە، خوێندوونەتەوەو پاشان گوتویەتی شتێکی "گومان لێکراو"ی نەدۆزیوەتەوەو ڕۆییوە.

هەم بەختی منو هەم بەختی یارۆی دۆستی تۆ یاربووە کە لە ماڵ نەبووم دەنا دەم تۆپاند. بەڕاستی جوانە! ئەی ئافەرین ئەمەیە شێوازی دۆست پەیدا کردنی دەوڵەت! حکومەت بەم شێوەیە دۆست پەیدا دەکات! ئەگەر بەیانە سیاسیەکەی منت لە بیر بێ، دەزانیت کە من هەمیشە سەبارەت بە دەوڵەت بێ لایەن بوومو گوێم بە دەوڵەت نەداوە، بە تایبەتی لەوەتای خەریکی کاروباری قوتابخانەکەم، ئەم بێ لایەنیو بێ موبالاتیەم زیاتر بووە. سەبارەت بە ئازادیخوازە هاکەزاییەکانیش تەواو بێ لایەنمو لە ناخی دڵەوە لێیان بێزارم. من ئێستا ناتوانم بە ئاشکرا بیڵێم، بەڵام سەبارەت بەم دۆستە ئازیزەی تۆ، کە لە ماڵی مندا تاقیبی تایپو فۆتۆکۆپیو چاپکردنەوەی بەیاننامەی قاچاخ دەکات، لە ناخی دڵەوە هەست بە تووڕەییو نەفرەتو بگرە دژمنایەتی دەکەم، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی کە ئەم بەیاننامانە لە بنەڕەتدا خەمی من نینو ئەوەندە بێ تامن کە تاقەتی خوێندنەوەیانم نیە،و ناتوانم هیچیان تا کۆتایی بخوێنمەوە. ڕاستە کە جارێکیان ئەم بەیاننامانەو ژمارەکانی گۆڤاری زەنگ بۆ ماوەی یەك هەفتەی تەواو لە ماڵی

مندا بوون، بەڵام سەرەنجام بێئەوەی بیان خوێنمەوە ناردمنەوە. ئەم بابەتانە وەڕزم دەکەنو ئاگام لە حەقیقەتو سەرچاوەی هەموویانەو نەك هەر بە زمان بەڵکو بەدڵو گیان لێیان بێزارو وەڕزم.

بە جۆرێ شولیان لێهەڵکێشاوە کە بۆ تاقیبی خوێندکارانی زانکۆ، ماڵەکەی من دەپشکنن، ئەمە رێك وەکو ئەوەیە کە تۆ بە تۆمەتی کوشتنی منداڵێك بپشکنن. هەڵبەتە ڕاستە هێشتا ئەم ئیجرائاتە شەقڵی هێرش ئامێزی لەخۆ نەگرتووە. ئەگەر من بناسنو بایەخ بە ژیانی من بدەن دەتوانن زانیاری دروست تر بە دەست بێنن. ئەمانەن دۆستە ئازیزەکانی تۆ! جارێکیان بۆم نووسیت کە ژیان ئەوە نیە بە دوای پەناگەیەکی ئارامدا بگەڕێی، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێ ڕەنج بدەی، ئارەق بڕێژیو کاربکەی. من دەتوانم ئەم فەلسەفەیەی خۆم پراکتیزە بکەم، وێڕای ئەمەیش ئەگەر بکرابایە، بە فەرەسەخان لەم رێگرانە کە گۆناو دەستیان لە ئەنجامی شتن بە سابونی بۆندار هەمیشە دەبریقێتەوەو بزەی ئەفسوناوی لە لێویان نابڕێت، دوور بکەومەوە، بێگومان دوور دەکەوتمەوە. بەڕاستی ئەگەر عەمر باقی بێ رێگەی دێر دەگرمە بەر، هەڵبەتە نەك بۆ دوعاو پاڕانەوە لەبەر دەرگای خودا – بەڕای من دوعا پێویست نیە – بەڵکو بۆ دوور کەوتنەوەو رزگاربوون لە دیتنی ناپەسندیو ناجۆری ئەم رۆژانە گەندەڵییە و ئەم خەڵکە لە خۆڕازیو لوتبەرزە بەو هەموو قەیتانو کەتافیەو سەن سەنەو تەنتەنە قێزەونەوە . نازانم ژنێکی نەجیبو پاکی وەکو تۆ چۆن دەتوانێ لە پترزبۆرگدا هەڵبکات؟ هەرگیز سەر لەم کارە دەرناکەم. لەوەشە هەر لە ئێستاوە غوبار بەر چاوانی گرتبێتو هیچ نەبینی.

*ل. تولستوی.*

***پەراوێز:***

***١- پوتاپوڤ: بەرپرسی دایەرەی سێیەمی ئەمن بوو.***

***٢- دلگروکوڤ: سەرۆکی ئەمن بوو.***

***٣- ئاراکچۆڤ: لە نزیکانی دەرباری ئەلکساندەری یەکەم ، ئیمپراتۆری روسیا بوو.***

## بۆ ئا. ئا. تولیستایا

## یاسنایا پولیانا، ١٨٦٢/٨/٧

لە مۆسکۆوە رووداوەکەم بۆ نووسیویت، من ئەوسا تەنیا لە رێگەی نامەوە بە رووداوەکەم زانی بوو. بەڵام هەنوکە لە یاسنایام، هەرچی سەر دێنمو سەر دەبم زیاتر هەست بە سوکایەتی دەکەمو ژیانم لە بەر چاو تەنگ دەبێت. من ئەم نامەیە بە کەماڵی هوشیاری دەنووسمو هەوڵدەدەم هیچ

خاڵێکی لێ نەپەڕێنم‌و هەروەها هیچ زیادەیەك بە رووداوەکەوە نەنەم تا بتوانی وەزع‌و حاڵەکە وەکو خۆی، چۆن روویداوە بەو ئاوایە بە تالانچیانی میناکی پوتاپوۆ و دلگروکوف بگەیەنیت کە بە دەستی ئانقەست تۆوی دژمنایەتی دژی دەوڵەت دەچێنن‌و دەسەڵات‌و ئیحتوباری ئیمپراتۆر لەبەر چاوی لایەنگران‌و هەوادارانی دەخەن. من نامەوێ بە هیچ جۆرێ واز لەم مەسەلەیە بێنم‌و ناتوانم چاوپۆشی لێبکەم، هەموو هەوڵ‌و کۆششێکی من کە مایەی شادمانی‌و ئاسودەیی من بوو بە فیڕۆ رۆیی. پورێ ئەوەندە حاڵی خراپە زەحمەتە جارێکی دی بێتەوە تایم‌و باش ببێتەوە، خەڵکی ئیدی هیچ حیسابێك بۆ ئەو شۆرەت‌و ناوبانگەی کە بە ڕەنج‌و زەحمەتی چەندین ساڵە وەدەستم هێنا بوو، ناکەن‌و بە چاوی رێزو حورمەتەوەو وەکو پیاوێکی ئابڕومەندی سەنگین تەمەشام ناکەن، بەڵکو وەکو تاوانبارێك، ئاژاوەچییەك یان هەلپەرستێکی بێ بەر و پشت کە بە فڕوفێڵ‌و تەڵەکەبازی خۆی دەرباز کردووە، تەمەشام دەکەن، کە تووشم دەبن لە دڵی خۆدا دەڵێن: "ئەهای هاوڕێ! باش کلکت بوو بە تەڵەکەوە! ئەگەر پیاوی ئێستا دەربارەی دروستکاری‌و نێرەنگبازی دەم درێژی بکە. چیوای نەمابوو لە زندانت بپەستن" دەربارەی موڵکدارەکان ئەوە هەر باسی مەکە. لە کەیفان لە پێستی خۆ ناهێورن. بێزەحمەت پاش راوێژو شیرەت دەگەڵ پروسکی و ئا. تولستوی‌و هەموو ئەوانەی کە دەتانەوێ بە پەلە بە هانامەوە بێن، بۆم بنووسن دەبێ چۆن لەمبارەیەوە نامە بۆ ئیمپراتۆر بنووسم‌و چۆن نامەکەی پێ بگەیەنم؟ هیچ چارو مالیجەیەکی ترم نیە. دەبێ بە هەمان هەراو هەنگامەوە کە ئیهانەیان کردووم، قەرەبووی ئەم ئیهانەیە بکەنەوە – ئەگەرچی ئەم پێشهاتە لە قەرەبووکردنەوە نایەت – یان وڵات بە جێدێڵم. لەمبارەیەوە قسەم یەکەو نابێ بە دوو. تاقیبی هرزن ناکەم. هرزن بۆ خۆی ،و من بۆ خۆم چالاکی دەکەین. بە هیچ جۆرێ نایشارمەوەو بە ئاشکرا دەیڵێم کە لە ڕای بە جێهێشتنی روسیادا دارو نەداری خۆم، هەرچی موڵك‌وماڵم هەیە دەیفرۆشم، چونکە لەم وڵاتەدا هیچ جۆرە زامنێك نیە کە لە هەر ئان‌و ساتێکدا خەڵکی دەگەڵ خوشك‌و هاوسەرو دایکیا کەلەپچە نەکەن‌و نەیخەنە بەر شەلاخ (قامچی). هەنگێ بۆ هەتا هەتایە خاکی روسیا بەجێدێڵم.

بەڵام نهو بۆت دەنووسم بۆچی ئەم مەسەلەیە بەشەر دەخاتە پێکەنین‌و پاشان ئاگری توڕەیی هەڵدەگیرسێنێ. تۆ بۆ خۆت دەزانی ئەو قوتابخانەیەی کە دروستم کردووە چ بایەخێکی بۆ من هەیە؟ هەموو ژیانم بەو قوتابخانەیەوە بەند بوو. دێرو کڵێسای من بوو. کڵێسایەك بوو لە هەموو دڵە ڕاوکەو گومان‌و واسواسەیەکی هەڵپەی ژیان رزگاری کرد بووم، لەبەر خاتری برا نەخۆشەکەم بۆ ماوەیەك لێی دوور کەوتمەوەو بە گیانێکی ماندووترەوەو بەتاسەو ئەڵهای کارو چالاکییەوەو لە بەر ئەوەی پێویستم بە هاوسۆزی‌و مەحەبەت‌و ڤیانی خەڵکی دی هەبوو، بۆ ماڵ گەڕامەوەو بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو بە داوەری دادگای بەش هەڵبژێردرام. خاوەنی قوتابخانەیەك‌و گۆڤارێك بووم‌و لە ڕووی ویژدانیەوە نەمدەتوانی لە ترسی ئەمەی کە چینی ئەشراف ستەمکارو خۆسەر پارچە پارچەم دەکەن، ئەم داوەرییە قەبوڵ نەکەم‌و ڕەت بکەمەوە. ناڕەزایی دژی جۆری دادوەری من تەنانەت بە تۆش گەیی و دوو کەڕەت لە دادگادا داوام کرد دەربارەی دادوەرییەکەم دادگاییم بکەن، بەڵام هەردوو جارەکە دادگا ڕای گەیاند کە هەق بە منەو هیچ بەڵگەیەك دژی من

نیه(١). جا نەك هەر لەبەردەم دادگادا بەڵکو لەبەردەم ویژدانی خۆمیشدا ئاگادارم کە یاسام بە قازانجی ئەشراف، بە تایبەتی لەم دواییانەدا زۆر هەموار کردووە. لە هەمان ساڵدا قوتابخانەیەکی زۆر لە دەڤەرەکەدا دامەزراو کرایەوە، ژمارەیەکم لە خوێندکارانی زانکۆ هێناو سەرباری هەموو سەرقاڵییەکی خۆم بە کاری ئەوانیش ڕادەگەییم. هەر دوانزەیان، جگە لە یەکێکیان، خەڵکێکی زۆر چاك دەرچوون، یەجگار کەیف خۆش بووم کە هەر هەموویان دەگەڵ مندا کۆك و گونجاو بوون، هەڵبەتە زیاتر ڕمووەدەی ژینگەی کارەکەمان بوون و هەموویان منیان خۆش دەویست. هەموویان بە جانتای پڕ لە نووسخەی دەست نووسی بەرهەمەکانی هرزن و مێشکی تەژی لە هرزێن شۆڕشگێڕی هاتبوون، لێ لە هەفتەیەك پتری نەبرد کە هەر هەموویان نووسخە دەست نووسەکانیان سووتاندو بیری شۆڕشگێڕییان لە مێشکی خۆ دەرکردو دەستیان بە وتنەوەی دەرسی مێژووی مقەدەس و نوێژ بە منداڵی گوندییان کرد و ئینجیلیان بەسەردا دابەش کردن تا لە ماڵەوە بیخونینەوە. ئەمە حەقیقەتی مەوزوعەکە بوو. هەر یازدە خوێندکارەکە لە باوەڕو ئیمانەوە، ئەو کارانەیان کردبوو، من هیچ گوشارێکم لێ نەکردبوون کە کاری وا بکەن. من مەرج دەکەم کە لە ساڵی ١٨٦٢دا لە سەرانسەری ڕوسیادا هیچ خوێندکارێك نامێنێ کە هەڵگری بیروباوەڕی چوون باوەڕێن وان بێ.

ئەم وەزعە یەك ساڵی خایاند. کاری دادڤانی، قوتابخانە، گۆڤارەکە، قوتابییەکان و قوتابخانەکانیان ئەگەر هەندێ کێشەی خانەوادەیی لێدەربکەی نەك هەر بە باشی پێشڤە دەچوو بەڵکو لە باشیش باشتر دەچووە پێشێ. بە ڕادەیەك کە خۆم سەرم لەم هەموو شادمانیەی کە رووی تێکردبووم، سوڕما مابوو، و سوپاسی خوام دەکرد کە سەرەنجام کارێکی بێ سەریەشەم دۆزیوەتەوەو وای مژول کردووم، نامپەرژێ سەری خۆم بخورێنم. دەوروبەری بەهار هەستم بە بێ هێزی دەکردو چوومە دەف دکتۆرو پێی گوتم کە بە مەبەستی چارەسەر بە کومیس(٢)، سەفەر بکەم. ئەوە بوو دەستبەرداری دادوەری بووم، چونکە حەزم دەکرد لەوەی پتر خۆم ماندوو نەکەم، بەشی بەڕێوەبردنی قوتابخانەکەو گۆڤارەکەم پێوە بمێنێ. خوێندکارەکان، لە ماوەی سەفەرەکەی مندا، ڕێك وەکو ئەوەی خۆم لەوێندەر بووبم، ڕەفتاری نموونەییان کردبوو،و لە وەرزی کشتیاری دا، قوتابخانەکەیان داخستبوو، ئیدی دەگەڵ پورێدا لە یاسنایادا مابوونەوە. خوشکەکەم بۆ دیتنی من لە هەندەران گەڕایەوەو لە نووسینگەکەمدا کەوتە کارو هەموو چاوەڕوانی گەڕانەوەی نزیکی من بوون. ڕۆژی شەشەمی مانگی حەوت، سێ دانە خزاگ، بە زرنگ وهۆڕی ناخۆشی زەنگوڵەی ملی ئەسپێن پۆلیس بەسەر، بە چەك و ئەسلەحەوە خۆیان بە ماڵەکەی یاسنایامدا دەکەن. ئەو حاکم و کار بەدەستانەی کە چارەنووسی من و پورە هەفتاو پێنج ساڵەکەم و خوشکم و دە گەنجیان لە دەستدا بووە بریتی بوون لە سەرهەنگێکی پۆلیس، دارنوی بەرپرسی ئەمنی کراپلیونکو، سەرۆکی پۆلیسخانەی ناوچەکەو کبلزاکی دارۆغەی تایبەتی کە چونکە دەرفەتی دابوو زللەی لێبدەن ، نازانم لە چ دایەرەك دەریان کردبوو، و ئێستا نوێنەرایەتی فەرمانداری (تولا)یان پێ سپاردبوو. ئا ئەم پیاوە بوو کە هەر هەموو ئەو نامانەمی کە پێشتر تەنیا من و نووسەرەکانیان خوێندبوومانەوە، هەروەها یاداشتەکانمی کە هیچ کەسێك نەیدیتبوون،

خوێندبووەوە. هەرکە گەییوونەتە جێ یەکسەر هەموو خوێندکارەکانیان گرتووە. پورم بەو خەیاڵەی کە گوایە من هاتوومەتەوە بەپەلە بۆ پێشوازیم لە ژوور وەدەرکەوتبوو، کە چاوی بە جەندرمەکان کەوتبوو،دڵی داخورپا بوو و هێشتاش هەر نە هاتۆتەوە سەرخۆ. هەر هەموو خوێندکارەکانیان بە وردی پشکنی بوو، بەڵام هیچمان نەدۆزی بووەوە. جا ئەوەی مایەی پێکەنینە خوێندکارەکان لە شپرزەیی خۆیاندا، هەڵدەستن بە بەرچاوی جەندرمەکانەوە زۆر کاغەزو ئەوراقی سادەو بێ خەتەر، بەو خەیاڵەی کە نەبا (قاچاغ)بن، لە بن دارو دەوەنەکان دەشارنەوە ، یان دەسووتێنن. کاتێ مرۆڤ بەبێ هیچ هەقێكو بەبێ ئەوەی دەرفەتی بەرگریکردنی لە خۆی بدرێتێ، سزا بدرێت هەموو شتێکی لە لا دەبێت بە خەتەرو بیر لە فەوتاندن و شاردنەوەی دەکاتەوە. جا بۆیە هەر هەموو ئەم دەستدرێژیانە، وێڕای ئەوەی کە سوکایەتی کردنە بە ئێمە، ئەوەش دەسەلمێنێ کە شمشێری ستەمکاری و زۆرداری و بێدادی دیموکلیس بەدیار سەری هەمووومانەوە ڕاگیراوە. کۆمیسەرە تایبەتیەکەو جەندرمەکان، ئەم حەقیقەتەیان لە خەڵکیماڵەکە نەشاردووەتەوەو حاشایان لێنەکردووە. هەڕەشەی سزای توندو گرتنیان لێکردوون. داوای خواردنی خۆڕایی و مفتیان بۆ خۆیان و ئالیك بۆ ئەسپەکانیان، لێکردوون.کا بۆ خۆم و جۆ بۆ کەرەکەم.

جەندرمە چەکدارەکان هەموو شوێنێ دەگەڕان، هورایان دەکێشا، ڕێك وەکو ئەوەی وڵاتێکی بێگانەیان داگیرکردبێ لەبەر پەنجەرەی ژووری نووستنەکەمدا جنێویان دەدا. ڕێگەیان بە خوێندکارەکان نەدابوو بۆ نان خواردن و ئاوخواردن لەم بینایەوە بۆ ئەو بینایە بڕۆن. چوونەتە ژێر زەمینەکە، تەوالێت، ژووری ڕەسمخانەکە، ناو قوتابخانەکە، عەمارەکان، تاقیگەکەو داوای هەموو کلیلەکانیان کردووەو هەڕەشەیان کردووە ئەگەر کلیلەکانیان نەدەنێ دەرگاکان دەشکێنن، بەبێ ئەوەی مۆڵەتنامەیەك بۆ ئەو جۆرە کارانە نیشان بدەن. جا خۆزیا هەر بەوەندە دەبڕایەوە! چوونەتە ژووری کارەکەی من، کە لەو کاتەدا خوشکەکەم لەوێ نووستووە،و هەموو شتەکانیان ژێرو بان کردووەو داوە بەسەر یەکدا،دارۆغەی تایبەتی ، بە ناوکەوتبوو، هەر شتێك بۆ من نووسرا بوو، و هەر چیەك من لە تەمەنی شازدە ساڵییەوە نووسی بووم، هەمووی خوێندبووەوە. نازانم ئەو شتانەی بەلاوە چۆن بووەو چەند سەرنجی راکێشا بوو. بەڵام دەزانم لە سەرەتای شەودا دوای ئەوەی خوشکم داوای کردبوو کە ڕێی بدات بچێت بۆ ژووری دانیشتن و لەوێندەر بنوێ، ڕێگەی دابوو. دوای ئەوەش ئەم دیمەنە مەخسەرە ئامێزو قێزەونە تا ماوەیەکی تریش بەردەوام بووە. نامەو کارتە گومان لێکراوەکانیان خوێندوەتەوەو خستوویاننەتە لاوە، خوشکەکەم و پوریشم کە لە ترسان شپرزە دەبن، دەکەونە شاردنەوەی ئەوراق و کاغەزە ئاسایی و بێ خەتەرەکانیش. کابرای دارۆغەی تایبەتی نامەیەکی شازدە دندورف کرساکوڤ- ی پیر بەگومان لێکراو دادەنێ و بە ئەلاحەدە دەیخاتە شەپقەیەکەوە ، بەڵام سکرتێرەکەی من لێی دزی بووەوە. هەڵبەتە لە ئۆفیسی کارەکەی مندا هیچ نادۆزنەوە. من دڵنیام ئەوەی پترگومانی لا دروستکردوون، ئەوە بووە کە هیچ شتێکی قەدەغەو یاساغیان نەدۆزی بووەوە. هەروەها دڵنیام هەر بینایەك لە پترزبۆرگدا ئەگەر بەو وردیە تەفتیش بکرایەو بپشکنرایە، یەك لە سەدی یاسنایا

پاك‌و بێگەرد دەرنەدەچوو. هەر بەمەشەوە نەوەستاون، چوون بۆ موڵکەکەی ترم لە چرنیسکایاو ئەوراقەکانی بـرا خێـر لـە خـۆ نەدیوەکـەمیان، کـە مـن وەکـو یادگـارێکی پـیرۆز پاراسـتوومە، دەخوێننـەوەو دوای ئـەوەی دڵنیـا دەبـن کـە هیچـی یاسـاغ‌و قاچـاغی تیـا نیـە، داوای نیـوەرۆژە دەکەن‌و پاش هەڕەشەی پێویست ئەوجا دەڕۆن.

زۆر جار لە دڵی خۆمدا دەڵێم چەند بەختم یاربوو کە لەوێنـدەر نـەبووم، دەنا دەبوایە ئێستا لەسەر پیاوکوژی لە دادگادا بوایەم.

جا هەنوکە بیهێنە بەرچاوی خەیاڵی خۆت کە دوای ئەو رۆژە لە نێو دێهات‌و شاردا، لە بەینی دێهاتیـان‌و موڵکدارانـدا چ بانگەشـەو دەنگۆیـەك بڵاوبووەتـەوە. پـورێ لـەو رۆژەوە نـەخۆش کەوتووەو حاڵی بەردەوام بەرەو خراپی دەڕوات. کاتێ من گەییمەوە جێ دەستی بە گریان کردو بورایەوە. ناتوانێ لەسەر پێی خۆی بوەستێ. ئەو بانگەشەو مقۆمقۆیانەی کە گوایە من حەپس کـراوم،و یـان بـۆ هەنـدەران هـەڵاتووم، ئەوەنـدە بـەجێ‌و ڕێ‌و باوەڕکـەردەنی هۆنراونەتـەوە کـە تەنانـەت ئاشـنایانی من‌و ئـەو کەسـانەی کـە دەزانـن مـن چـەند لـە چالاکی نهێنی‌و پیلانگێڕی‌و هەڵاتن بێزارم، باوەڕیان کردووە. هەنووکە جەلادان رۆییون‌و مافی ئەوەیان داوە لە بینایەکەوە بۆ بینایەکی دی بێین‌و بڕۆین، لێ هەموو بەڵگەنامـەو قەواڵـەی خوێنـدکارەکانیان بـردووەو نایانـەوێ بیدەنەوە، جا بەم پێودانگە ژیانی من‌و ژیانی پورێ بە تـەواوەتی فەوتاوە، ئیدی شتێك نـابێ بە ناوی قوتابخانە، دەبێن بە گەپچاڕی ڕەمەکی مەردم.، موڵکداران بەم فەتح‌و سـەرکەوتنەی خۆیـان شادن،و ئێمە خۆشمان هەرکە گوێمـان لـە دەنگی زەنگوڵـەی ملـی ئەسـپان دەبێت، خۆ بـە خـۆ وا تەسـەور دەکـەین (خزاگـی) جەندرمانـەو هـاتوون بمانبـەن. دەمانچـەکەم پـڕ لـە فیشـەکەو لـە ژوورەکەدا حازرو ئامادەیەو چاوەڕوانم ئەم بۆیەرە بە هەر شێوەیەك بووە ببڕێتـەوەو دوایـی بێت. ئاغای جەندرمە بە لوتفێکی زۆرەوە ئاگاداری کردووینەتەوە ئەگەر هەر شتێکی شاراوە مابێتـەوە پێویسـتە ئـەو ئاگـادار بکرێتـەوە، بۆیـە لەگینـە سـبەینێ دەگـەڵ دادیـارو داروّغـە تایبەتیەکـەدا بگەڕێتەوە. لێرەدا تەنیا یەك خاڵ رۆشن و بەڵگە نەویستە، ئەویش ئەوەیە کە هەرکاتێ ئـەم کـارو ئیجرائاتانە بەبێ ئاگاداری ئیمپراتۆر بکرێت، دەبێت ئـاڵای یـاخی بوون‌و شـۆڕش هـەڵکرێت‌و بـە هەموو هێزو توانایەکەوە دژی ئەم بارودۆخە بخەبتی، چونکە نـاتوانی بـەم وەزع‌و حاڵـەوە بژیت. خۆ ئەگەر بە پێچەوانەوە، قەناعەتیان بە ئیمپراتۆر هێنابێ کە ئـەم پشکنینە زەرووریـە، لـە کاتێکا هیچ جۆرە سەرپێچییەکمان لە یاسا نـەکردبێت، دەبێ بـڕۆین بـۆ شـوێنێ کە دڵنیـابین دەتـوانین لەوێندەر سەری خۆمـان بـەرزبگرین یـان دەبێ ئـەم بیرە لـە مێشـکی ئیمپراتـۆر دەربێـنین کـە نـابێ گوێ بەمجۆرە ئیجرائاتە نا قانونیە بدرێت.

تکایە بمبورە. لەوەیە ئەم نامانەی من کێشە بۆ تۆش دروست بکات، لـێ هیـوادارم دۆستایەتی تۆ دەگەڵ مندا لە سەرووی ئـەم سـەرنج‌و تێبینیانـەوە بـێ‌و بتـوانی بـە شـێوەیەکی کـراوە بـاوەڕی خۆت لەمبارەیەوە دەربڕی و ڕێنوێنیم بکەیت. خۆ ئەگەر دەگەڵ بۆچوونەکانی مندا نیت، ڕەنگـە بەڵگەو هەنجەتەکانت قەناعەتم پێبکەن، یان بەلای کەمەوە بکەنە کارێك کە گوشارت نەکەمە سەر. خـودا حـافیز! دەسـتت مـاچ دەکـەم‌و سـلاو لـە خزمـان‌و کەسـوکارت دەکـەم، هەرچـەندە لێیـان بـە

گومانم‌و میناکی خەڵکێکی پاک‌و بێگەردیان نابینم‌و وام دێتە بەرچاو کە هەر هەموویان شەریکی ئەم تاوانانەن.

*پەراوێز:*

*١- ئەشراف‌و ئاغایانی دەڤەرەکە لە دەف پارێزگاری تولا سکاڵایان لە تولستوی کرد بوو کە گوایە هەمیشە پشتی جووتیار لە بەرانبەر موڵکداردا دەگرێت.*

*٢- کومیس: شیری مەێنراوی ماین.*

## بۆ تزار ئالکساندری دووەم

## مۆسکۆ، ١٨٦٢/٨/٢٢

**خاوەنشکۆ**

**رۆژی ٧/٦ ئەفسەرێکی سەرکردایەتی جەندرمە هاوڕێ دەگەڵ نوێنەرانی دادگادا، لە غیابی مندا هاتوونەتە موڵکەکەی من. میوانان، خوێندکاران، مامۆستایانی گوندەکەی دەڤەری ژێر ئیدارەی من، پورم و خوشکەکەم لە ماڵی مندان. نوێنەری جەندرمە، مامۆستاکانی ئاگادار کردووەتەوە کە دەست بەسەرن، هەنگێ ویستویەتی کەل‌وپەل‌و شتومەکە شەخسی‌و ئەوراقەکانیان بپشکنێت. ئەم پشکنینە دوو رۆژی خایاندووە، قوتابخانەکەو ژێر زەمینەکەو عەمارەکە بە وردی گەڕاون‌و بە گوتەی خودی ئەفسەری جەندرمە هیچ شتێکی قاچاخ و گومان لێکراو نەدۆزراوەتەوە.**

**سەرباری سوکایەتی کردن بە میوانەکانم، بە پێویستیان زانیوە هەمان سوکایەتی‌و حەقارەت بە من‌و بە پورم‌و بە خوشکەکەم ڕەوا بدینن. ئەفسەری جەندرمە، ژووری کارەکەی منیان، کە لەو ماوەیەدا خوشکەکەم وەکو ژووری نووستن بۆ خۆی بە کاری دێنا، پشکنیوەو کە لێیان پرسیوە بە چ هەقێك ئەمە دەکات، زۆر بە دڵنیاییەوە پێی ڕاگەیاندوون بە فەرمانی ئیمپراتۆر.**

**هەڵبەتە ئەو سەربازو پاسەوانانەی دەگەڵی بوون خۆی لە خۆیدا نیشانەی دروستی قسەکەیەتی. ئیدی دەگەڵ مامۆرەکاندا خۆی بە ژووری نووستنەکەی خوشکمدا کردووە، هەموو نووسین‌و تەنانەت دەفتەری یادگارو بیرەوەرییەکانی منیشی خوێندووەتەوەو کاتێ کە رۆییشتوون. بە میوانەکان‌و ئەندامانی ماڵباتەکەیان وتووم کە هیچ شتێکی یاساغ‌و و گومان لێکراویان نەدۆزیوەتەوەو ئیدی ئازادن. واتا لە هەمان کاتدا قازی ئێمەش بوون، چونکە دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە بە ناوی گومان لێکراوەوە بمانگرن. کابرای ئەفسەری جەندرمە ئەوەشی**

**گوتووە کە ڕۆییشتنی ئەو مانای ئەوە نیە کە دانیشتوانی ئەم ماڵە لە دوای ئەم پشکنینەوە خەیاڵ ئاسوودەو دڵڕەحت بنو بە ئاشکرا گوتوویەتی: "لەوەیە هەر ئەمڕۆ جارێکی دی بێینەوە!".**

**خۆم بە شایستەی ئەوە نازانم خاوەن شکۆتان دڵنیا بکەم کە من شایانی ئەو سوکایەتیە نەبووم کە دەرهەق بە من کراوە. ڕابردووی من، پەیوەندییەکانی من، چالاکیەکانی من کە لەلای هەموو کەسێك ئاشکرایە، لە خزمەتی ڕێنمایی گشتی دایە،و گۆڤارەکەی من کە ئاوێنەی ڕاستگۆیانەترین بیرو هزرینی منە، خۆی لە خۆیدا بەسە کە بۆ هەر کەسێکی، کە لە من بە گومانە، بسەلمێنێ کە من نە پیاوێکی پیلانگێڕم، نە بانگەشە چیم، نە پیاوکوژو نە ئاگر هەڵگیرسێنم. بۆیە پێویستی نە دەکرد کە بەم ئیجرائاتە زبرە بەختەوەریو خۆشیو ئاسودەیی لە خەڵکی هەڵگرن، سەرباری، سوکایەتیو گومانی تاوانباری، وێرای لۆمەو مقۆمقۆی خەڵکیو هەستکردن بە ترس لە ماڵەوەو لە ژینگەی کاردا، ئەم پشکنینە لە بەر چاوی خەڵکی سووك کردوومو ناوو ئیحتوباری، کە ساڵانێکی زۆر کارم بۆ وەدەست هێنانی کردووە، زڕاندووم، و هەموو هەوڵو چالاکیەکی منی، واتا دامەزراندنی قوتابخانانی گشتیو پێشکەوتووی لەکەدار کردووە. لە ڕووی عیزەتی نەفسی مرۆڤانیەوە لە خۆم دەپرسم کێ بەرپرسی ئەم بویەرەیە کە بەسەر مندا هاتووە؟ خۆم بە کەمتەرخەم نازانم، بە پێچەوانەوە خۆم زۆر بە هەق دەزانم. هیچ جاسوسێکی ئاژاوەگێڕ ناناسمو تەنانەت ناتوانم ئەو مامورانەش کە کە دادگاییان کردوومو سووکایەتیان پێکردووم بە خەتابار بزانم، چونکە چەندین جار دووپاتیان کردووەتەوە کە ئەوان دەستیان لەم کارەدا نیە، بەڵکو تەنیا جێبەجێکاری فەرمانی ئیمپراتۆرن.**

**کاتێ وەکو هەمیشە بیردەکەمەوەو پێموایە کە دەوڵەتو شەخسی خاوەنشکۆ پێویستە هەمیشە لایەنگری هەقو هەقیقەت بن، ناتوانمو نامەوێ باوەڕبکەم کە ئەم جۆرە فرمانە لەلایەن خودی ئیمپراتۆرەوە دەرچووبێ. بە پێچەوانەوە تەسەوردەکەم ویستی خاوەنشکۆ ئەوە نیە کە بێ گوناحان سزا بدرێنو محافەزەکارو ڕاستگەرایان هەمیشە لە ترسو لەرز و سووکایەتیو سزادا بژین.**

**جا بۆ ئەوەی بزانم گلەییو گازاندە لە کێ بکەم لەسەر ئەوەی بەسەر من هاتووە، بڕیارم دا ڕاستەوخۆ دەستەو دامێنی خاوەنشکۆ ببم. هیوادارم کە ناوی خاوەنشکۆ لە هەر ئەگەرێکی گلەییو گازاندە لەسەر ئەو بێدادییەی کراوە، پاكو بێگەردو بە دووربێت. ئەو کەسانەی کە بەو ناوەوەو لە سایەی ئەو ناوەدا ئەم خەتایەیان کردووە، ئەگەر سزاش نەدرێن، بەلای کەمەوە ناسنامەیان دیاری بکرێت.**

***خزمەتگوزاری***

***دڵسۆزو ئەمەکداری خاوەنشکۆ***

***کۆنت . لیڤ تولستوی (1)***

***پەراوێز:***

**١- ئەلکساندەری دووەم لە ئەنجامی ئەو ڕاپۆرتەی کە شازادە دلگروکوف، سەرۆکی ئەمن، دوای تاوتویێ کردنی نامەکەی تولستۆی، دەربارەی پشکنینی ماڵەکەی، پێشکەشی کردبوو. ڕازی بوو. بە گوێرەی ڕاپۆری ناڤبری پشکنین و تەحەڕی ماڵەکەی تولستوی لەسەر ئەوە کرابوو کە هەواڵی ترسناك لەمەڕ کەسانێك کە لە ماڵەکەی تولستویدا دەژیان، بەرز کرابووەوە. جا دلگروکوف بە خۆی دەستووری بە پارێزگار دابوو ئاگادار بێت کە ئەم پشکنینە بە هیچ شێوەیەك زیان بە تولستوی نەگە یە نێت.**

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

## مۆسکۆ، ١٨٦٢/٩/٧

چەند بەختەوەرم کە دۆستانی وەکو ئێوەم هەیە. نامەکەت ئاسوودەو شادمانی کردم. لەم دواییانەدا هەموو نەگبەتیەکان لە پڕو پێکڤە ڕوویان تێکردووم. لەلایەکەوە جەندرمەو لەلایەکی ترەوە گۆڤارەکەم خراوەتە ژێر سانسۆرێکی توندەوەو سبەینێ ژمارەی مانگی شەشەم دەردەکەم، ئەویش بەبێ وتارەکەی(١) خۆم کە مەعلوم نیە بۆچی بۆ پترزبۆرگ نێردراوە. سێیەمین و گەورەترین نەگبەتی- یان بە بۆچوونی تۆ بەختەوەری- ئەمەیە کە منی پیرەمێردی بێ ددان ئاشق بووم(٢)، بەڵێ ئەمە ڕاستە. نازانم ئاخۆ بەم قسانە حەقیقەتم گوتووەو هەقی مەسەلەکەم داوە یان نا؟ هەق نیە باسی ئەم مەوزوعە بکەم، بەڵام دەمەوێ ئەوەت بۆ باس بکەم کە بۆچی سەبارەت بەو بویەرو پێشهاتانەی بەسەرم هاتوون ئەگەر بە تەواوەتیش بێ موبالات نەبم، ئەوا هەست دەکەم لێیان دوورم، وەکو بڵێی ڕۆژگارێکی زۆریان بەسەرا بوریوە. هەق نیە باسی ئەم مەوزوعە بکەم چونکە لەگینە تا چەند ڕۆژێکی دی لەم وەزع و حاڵە تێکەڵ و پێکەڵ و هەستیارو لە هەمان کاتدا خۆشەی ئێستا بە شێوەیەك لە شێوەکان دەرباز ببم. تۆ خۆت دەزانیت ئەم بویەرو پێشهاتانە وەکو باس دەکرێ و دەگێڕدرێتەوە ڕوو نادەن، بەڵکو بەشێوەیەکی ئاڵۆزو ئاڵۆزکاوی وەها ڕوو دەدەن کە زمان بە ئاسانی دەرەقەتی گێڕانەوەیان نایەت. ڕۆژێك هەر هەموو ڕووداوەکەت بە دوورو درێژی بۆ دەگێڕمەوە، شادی یان خەمی بیرەوەرییەکانت بۆ هەڵدەڕێژم. بە هەرحاڵ بەشەر هەمیشە ترسی ئەوەی هەیە کە لە هەنبەر خۆیدا کەمتەرخەم بێت. مخابن یاساو ڕێسایەك نیە بۆ خۆ پاراستن لەم ترسە، بەڵکو تەنیا سۆز لە ئارادایەو ئەم حەقیقەتەیە کە دەبێتە مایەی ترس.

**نامەکەم بۆ ئیمپراتۆر بە (سیرمتف)ی گاردی خۆیدا ناردو داوام لە کریزانوڤسکی(٣) کردووە کە تاقیبی بکات. من ئێستا لە پیاوێك دەچم کە پێیان وردوخاش کردبێتو نەتوانێ ئەم بیرە لە مێشکی خۆی بڕەوێنێتەوە کە بە گوێرەی چ نەخشەیەکی پێشوەختە نیازی سوکایەتی پێکردنیان هەبووەو گەرەکیەتی بە هەر نرخێ بووە ئەوە بزانێت ئەم سووکایەتیە بە ئانقەست کراوە یان نا، بە گشتی چاوەڕوانی قەرەبووی سوکایەتییەکەیە، یان بەلای کەمەوە چاوەڕوانی پۆزشو عوزرخواییەکە. هەر هەموو غەریزە ناپەسەندەکانی خەڵکی کە هەمیشە مایەی بێزاری من بوون ئێستا تووشی واسواسەم دەکەن. سانسۆر وتارەکەی بڕیوم، پۆستە نازانم چی بەسەر نامەکەم هێناوە، جووتیارانو گوندییان سکاڵایان بۆ من هێناوە کە زەوییەکانیان زەوت دەکەنو من بەپێچەوانەی جارانەوە لە جیاتی ئەوەی هەوڵبدەم نەیەڵم وتارەکەم سانسۆر بکرێتو پۆستەو گەیاندن ناچار بکەم نامەکان لە کاتی خۆیدا بگەیەنێتو زەوی داگیرکراوی جووتیاران بگەڕێندرێتەوە، بەخۆم دەڵێم ئەمەش بوو بە وەزع؟ ئایا دەشێت وەزع لە روسیادا لەمە باشتر بێ؟ دەك داوەشێن! پیاو دەبێ ئەمجۆرە ولاتە بەجێ بێڵێ، دەبێ چاو لە هەموو شتێك بپۆشێت! هەڵبەتە ئەم بیرانە گەوجانەو قێزەوننو نیشانەی بێدەسەلاتییە. ئەمە دەزانمو نهو بە تەمام بە چاوی مەحەبەتو خۆشەویستیو سەفاوە بڕوانمە هەمووان. تەنیا ویستم دوو دێڕێك لە وەلامی نامەکەی تۆدا بنووسمو هەرکاتێ دەرفەتێکم بۆ ڕەخسا نامەیەکی دوور و درێژت بۆ دەنووسم.**

**خودا حافیز دۆستە ئازیزو باشەکەم. لە خودای گەورە دەپاڕێمەوە هەمان ئارامیو ئاسوودەیی کە نها بە هەموو توانایەکمەوە بەوپەڕی روونی بۆ خۆمی داوادەکەم، بە تۆشی ببەخشێت.**

**ل. تولستوی**

**لە جیاتی من دەستی بریس ئالکسیوڤیچ – ی نازدار بگوشەو زۆر سوپاسی ئەو لوتفەیان دەکەم کە سەبارەت بە من دەری بڕیوە.**

***پەراوێز:***

***١- مەبەستی وتاری (فێرکردنو پەروەردەیە) کە لە ژمارەی مانگی ٦٢/٧ ١٨ی گۆڤار یاسنایا پولیانادا بلاوبووەوە.***

***٢- تولستوی لێرەدا ئاماژە بۆ سونیا ئاندریوڤنای هاوسەری ئایندەی خۆی دەکات.***

***٣- کریزانوڤسکی: کارمەندێکی پایەبەرزی حکومەتە کە تولستوی لە جەنگی قرمدا ناسیاوی دەگەڵدا پەیدا کردبوو.***

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

## مۆسکۆ، ١٧- ١٨٦٢/٩/٢٠

**دۆستی ئازیزو نازەنینم ئالکساندرین!**

**ئایا لە بیرت ماوە کە بە منیان دەگوت رۆژێك دێت تۆش وەکو چۆن ئیسلادین بۆ کاترینا نیکولایوڤنای نووسی، بەو ئاوایە ئاشق دەبیتو ژن دێنیتو بۆمان دەنووسیت کە مالاواییت لە جیهانی سەڵتیو زگوردیاتی کردووە؟ ئەمڕۆ رێك ئەو رۆژەیە. رۆژی ٩/٢٣ دەگەڵ سونیابیرس، کیژی دۆستی سەردەمی منداڵیم لوبوکائیسلنوڤادا زەماوەند دەکەم. ئەگەر بمەویٰ بە نامە پێتی بناسێنم، دەبیٰ کتێبێکی چەند بەرگیت بۆ بنووسم. لەوەتای هاتوومەتە دنیاوە ئەوەندە خۆشحاڵ نەبووم. هەڵبەتە ئەو تۆ دەناسێتو رێزو حورمەتی بۆت هەیە. خۆزگەم بەو رۆژەی کە بۆ تەعاروفو یەکتر ناسین دەیهێنم بۆ لای تۆو بە دڵی پڕ جۆش، بەلام ئاسوودەو ئارامەوە، ڕای تۆی دەربارە دەزانم. بێزەحمەت بە ئەردەسی یاسنایا نامەم بۆ بنێرن. دەربارەی نامەکەمو جەندرمەکان حەزدەکەم هەر هەمووان، جگە لە دڵسۆزترین دۆستان، فەرامۆشم بکەن(١)، دەستەکانت ماچ دەکەم.**

***دڵسۆزتان***

***لیون تولستوی***

***پەراوێز:***

***١- مەبەست لە نامەکەی بەرواری ٨/٢٢ کە تولستوی بۆ ئالکساندەری دووەمی ناردبوو.***

## بۆ ت. ئا. بیرس، ژن خوشکی ئایندەی تولستوی

## یاسنایا پولیانا، ١٨٦٢/٩/٢٥

**تانیکا هەرە جوانەکەم. ئەگەر ئەم نامەیە(١) ونبکەی هەرگیز لێت خۆش نابم. بێزەحمەت هەر بیخوێننەوەو بۆمی بنێرەوە. هەوڵبدە بزانە چەند باشو کاریگەر نووسراوە چ وەکو بیرو هزرین**

**دەربارەی ئایندەو چ دەربارەی سپیاو(٢). لەلایەکەوە پێم ناخۆشە کە ئەو لێم دوور دەکەوێتەوە، بەڵام لەلایەکی تریشەوە قەناعەتم وایە کە بەشێك لە سۆزەکانی ئەو پەیوەندی بە منەوە نیە،و ئەو بەشە بریتییە لە خۆشەویستی ئێوە هەمووتانو بەتایبەتی دەرهەق بە تۆ. من کەسێکی بەغیلو غیرەباز نیمو لەم ڕووەوە سەرم لە خۆم سوڕ دەمێنێ. ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ کە چاك دەزانم خۆشویستنی تۆو دایکت بەلای منەوە چقاس(چەند) پێویستە. خودا حافیز ئازیزەکەم!**

**خودا لەو بەختەوەریو شادمانیە بێ وێنەیەت بەنسیب بکات کە منی تیادام. هەنووکە ئەو کلاوێکی سوری لە سەر ناوە کە تا ڕادەیەك لێی دێت . ئەگەر دەزانی ئەمڕۆ بەیانی بە چ کارامەییەکەوە ئەداو ئەتواری سەرەژنانی دەردێنا؟ لە هەموو ڕوویەکەوە بێ عەیب بوو. خودا حافیز! ئەم نامە پێی سەلماندم کە نووسین بۆ تۆ ئاسانو مایەی لەزەتە. ئیدی زوو زوو نامەت بۆ دەنووسم. نامەی زۆرت بۆ دەنووسم. زۆرم خۆش دەوێی، دەزانم تۆش وەکو سونیا حەزدەکەیت خۆشیان بوێی.**

***ل. تولستوی***

***پەراوێز:***

***١- مەبەست نامەیەکی سۆفیا. ئا. تولستویایە کە ئەم نووسینەی تولستوی بەگەڵ خرابوو.***

***٢- سوفیا تولستویا لە نامەکەیدا بۆ خوشکەکەی ئەمەی نووسی بوو: "سپیاوەکەم لە بیر چووەو لێرە لەو جۆرە دەست ناکەوێ."***

## بۆ س. ئا. بیرس
## مۆسکۆ، ١٨٦٢/٩

**سونیا ئاندریوڤنا(١)**

زۆر خەجاڵەتو شەرمەزارم لەوەی کە ئێوەم بە هەڵەدا بردووە. چونکە نە دەتوانن وەزعێکی وەها تەحەمول بکەنو نە دەتوانن شتی وەها قەبووڵ بکەن. جا ئێستا شتەکە روون دەکەمەوە، ئەو شتەی کە ئەندامانی خانەوادەکەی تۆ بە هەڵە لە من حاڵی بوون ئەوەیە کە وا تەسەوردەکەن گوایە من حەزم لە لیزا(٢)ی خوشکی تۆ کردووە یان گوایە هەوڵدەدەم حەزم لێبکاتو بەلای خۆمیا ڕابکێشم کە شتی وا بە هیچ جۆرێ لە گۆڕێ نیە. من چیرۆکەکە(٣)ی تۆم هەمیشە لە بیرە چونکە خۆم وەکو دوبلیچکی(٤) دێتە بەر چاو و قەناعەم بە خۆم کردووە کە جارجارێ ئەوە لە بیر بکەم (هاپو لیاون)م، یانی ئەو پیرەمێردە زۆر ناشیرینو ناقۆڵایەم کە دەبێ بە جددیو بە بەردەوامی تەنیا لە بیری کاردا بیٚو قەناعەت بەوە بکات کە خودا پێی داوەو هیچ خۆشیو شادییەك لەم دنیایەدا نە ناسێت جگە لە شادی ئەنجامدانی ئەرکی خۆی.
روونکردنەوەکەی ترم دەربارەی ئەو وشانەیە کە لە ئیڤیسی(٥) بە شێوەی ڕەمز بۆم نووسیت. ماناکەی بەمجۆرەیە: کاتێ کە تەمەشات دەکەمو لێت ورد دەبمەوە دڵم دەگیرێت چونکە گەنجایەتی تۆ ،پیری خۆمم بیردەخاتەوە، ئەو لەزەتو خۆشیانەم بیر دەخاتەوە کە تازە من نایگەمێ، جا ئەگەر لە بیرت بیٚ ئەم وشانە بەر لە خوێندنەوەی چیرۆکەکەی تۆ نووسراون. بەڵام خوێندنەوەی چیرۆکەکەی تۆو دیقەتدانو ورد بوونەوە لە وەسفو تایبەتمەندی شاعیرانەو رۆمانسیانەی ئەو لاوەی کە بەو هونەرمەندییەوە ئاماژەت بۆ کردبوو، و بەراوردی خۆم دەگەڵ دوبلیچکی دا ئەقڵی بە تەواوەتی هێنامەوە جیٚو چاوانم کرانەوەو حەقیقەتم بە تەواوەتی و بە جۆرێ بینی کە ئێستا ئەو چیرۆکەو خودی تۆ نەك هەر بەبێ کەمترین ئەسەفو غیرەو بەغیلی دەربارەی رابردوو یا پ(٦) یا ئایندە یا ئەو کەسەی کە تۆی خۆش دەوێ لە زەینی خۆدا تازە دەکەمەوە ، بەڵکو بە پێچەوانەوە بە هەمان ئارامیو لەزەتو خۆشی ئەو کەسەوە کە دەڕوانێتە منداڵێکی شەرمن، تۆ وەیاد دێنمەوە. تاقە شتێك کە مایەی داخە ئەوەیە کە خانەوادەکەتانم بە هەڵەدا بردووەو بە جۆرێ خۆم شەرمەزار کردووە کە دەبێ خۆم لە لەزەتو خۆشی ئاسایی هاتوچۆی ماڵی ئێوە مەحروم بکەم. هەروەها تۆ کیژێکی دڵو دەرون پاکیتو ناشێت درۆت دەگەڵدا بکرێت. بەڵێ من (دوبلیچکی)م و ناتوانم ژن بێنم، چونکە ناکرێ پیاو تەنیا لەبەر پێویستی بە ژن، ژن بێنی. من شتێکی ترسناكو مەحاڵم لە ژن هێنانو زەوجین گەرەکە، دەمەوێ وەکو چۆن من بەرابنەرم خۆش دەوێ، بەرانبەریش بەو ئاوایە منی خۆش بوێتو ئەمە مەحاڵە.
هاتوچۆی ئێوە تەرك دەکەم. دەگەڵ تانیکادا بەرگریم لێبکەن.

*ل. تولستوی.*

پەراوێز:

١- سونیا ئاندریوڤنا، هاوسەری ئایندەی تولستوی.

٢- لیزا، خوشکی گەورەی سونیا ئاندریوڤنا بوو کە لە ڕاستیدا کاتێ تولستوی خوازبێنی خوشکە بچووکەکەی کرد، زۆر ناڕەحەت بوو.

٣- سونیا ئاندریوڤنا لە ساڵی ١٨٦٠دا چیرۆکێکی نووسی بوو کە نێوەڕۆکەکەی تەقریبەن دەربارەی ژیانی خۆی بوو.

٤- دوبلیچکی: یەکێك بووە لە قارەمانانی چیرۆکی ناڤبری کە پاشان تاتینایا ئاندریوڤنای خوشکە بچووکی سونیا لە باسی چیرۆکەکەدا وای وەسف کردووە: "پیاوێکی ناڤسالێ، لێ چالاك و هۆشمەندو خاوەن باوەڕێکی ناپایەدار دەربارەی ژیان." قارەمانی سەرەکی چیرۆکەکە، ئیلینا، میناکی سونیا ئاندریوڤنا خاوەنی دوو خوشکە بە ناوی زینایداو ناتاشا. زینایدا حەزی لە دوبلیچکی کردووە، لە کاتێکا دوبلیچکی ئاشقی ئیلینایە. ئیلینا لە پێناوی خوشکەکەیدا، خۆی لە ڤیانو ئەڤینو شەیدایی دوبلیچکی دەدزێتەوەو بە جۆرێ ڕەفتار دەکات کە دوبلیچکی ناچار خوشکە گەورەکەی دەخوازێ."سونیا ئاندریوڤنا لە ژینامەکەی خۆیدا دەڵێت: "کەمێك دوای تاقیکردنەوەکانم چیرۆکێکم نووسی‌و خۆمو تانیایی خوشکم کرد بە قارەمانی چیرۆکەکەو ناوم نا (ناتاشا). لیڤ نیکولایوڤیچ-ش بۆ ناوی قارەمانی ڕۆمانی شەڕو ئاشتی ناوی چیرۆکەکەی منی (ناتاشا)ی هەڵبژارد. بەر لە شووکردن ئەم چیرۆکەم دەگەڵ دەفتەری بیرەوەرییەکانمدا کە لە یازدە ساڵییەوە هەڵمگرتبوو لەگەڵ کۆمەڵێك سکێچ‌و نەخشە و کارەکانی سەردەمی گەنجیمدا سووتاندو، ئێستا زۆر لەو کارەم پەشیمانم.

٥- ئیڤیسی: موڵکی باوە گەورەی سونیا ئاندریوڤنا بوو. تولستوی لە مانگی ١٨٦٢/٨ لە دیدارێکی باوە گەورەی سونیادا بۆ یەکەمجار ڤیانی خۆی بۆ سونیا دەربڕی، ئەوە بوو کە پیتی یەکەمی چەند وشەیەکی بە دەباشیر لەسەر بەردێکی ڕەش نووسی‌و داوای لە سونیا کرد کە مانای ئەو پیتانە هەڵبێنێ. سونیا هەردوو ڕستەکەی تولستوی هەڵێناو تولستوی دەقی هەردوو رستەکەی لەم نامەیەدا هێناوەتەوە: "گەنجایەتی تۆ پیری خۆمم بیر دەخاتەوە..." و "ئەو شتەی کە ئەندامانی خانەوادەکەی تۆ بە هەڵە لە من حاڵی بوون...."

٦- پ (Polivamov)، ئەو ئەفسەرە لاوەیە کە دەیویست سونیا ئاندریوڤنا بخوازێت.

## بۆ س. ئا. بیرس
## مۆسکۆ، ١٨٦٢/٩

**سونیا ئاندریوڤنا**

بەڕاستی وەزعم خراپە، تەحەمول ناکریٚ. سیٚ هەفتەی تەواوە کە هەموو رۆژیٚ بە خۆم دەڵیٚم: ئەمڕۆکە هەموو شتیٚکی پیٚ دەڵیٚم، لیٚ بە هەمان خەمباریو پەشیمانیو ترسو هەستی بەختەوەری دەروونی، جارانەوە، بەجێت دیٚڵم. پاشان هەموو شەویٚك دەگەڕیٚمەوە سەر ڕابردوو و خۆم ئازار دەدەمو لە خۆم دەپرسم بۆچی قسەم نەکرد؟ جاریٚکی دی بیر لەو شتە دەکەمەوە کە دەبوایە بیڵیٚمو دەبوایە چۆنی بڵیٚم. جا لەبەر ئەوەی نەبا نەتوانم یان جورئەت نەکەم هەموو قسەکانی دڵمت بۆ هەڵڕیٚژم ئەم نامەیەم دەگەڵ خۆدا هیٚناوە کە بیدەمە دەستی خۆت.

ئەو بۆچوونە نادروستەی کە لەماڵی ئیٚوەدا دەرهەق بە من پەیدا بووە، بە ڕای من ئەمەیە کە گوایە من ئاشقی لیزای خوشکت بووم. هەڵبەتە ئەمە بۆچوونیٚکی دروست نیە. بۆیە چیرۆکەکەی تۆ لە هزرو زەینی مندا چەسپی، چونکە لە کاتی خویٚندنەوەیدا دڵنیا بووم کە لە بابایەکی وەکو منی، دوبلیچی ئاساوە، دوورە خەون بە شادمانیەوە بدینیٚ...وئەو رۆمانسیەتەی تۆ لە ئەشقو ڤیان چاوەروانی دەکەی تەواو پەسندو بەجێیە...و هەرگیز غیرەم لەو کەسەی کە تۆی خۆشدەویٚ نەکردووەو ناکەم، بەڵکو تیٚکەلاٚویو پەیوەندیم دەگەڵ تۆدا میناکی تیٚکەلاٚویو پەیوەندیم دەگەڵ مندالاٚندا لە گیانی خۆشو بەلەزەتە. لە ئیڤیسی دا ئەمەم نووسی: "گەنجایەتی تۆ هەم پیری خۆمو هەم ئەو بەختەوەرییەم وەبیر دیٚنیٚتەوە کە تازە من نایگەمیٚ."

چ ئەو کاتەو چ دواتر درۆم دەگەڵ خۆدا کردووە. هەروەها ئەوسا دەمتوانی پەیوەندی ببڕمو جاریٚکی دی تیٚ هەڵچمەوەو بە تەنیا بەرەو دیٚرەکەم بگەڕیٚمەوە، لیٚ ئیٚستا تازە هیچ کاریٚکم لە دەست نایەتو تەنیا ئەوە دەزانم هەموو ئەندامانی خیٚزانەکەتانم خستووەتە گومانەوەو ئەو پەیوەندییە پاكو بیٚگەردو پڕ بەهایەم لەگەڵ تۆدا وەکو دۆستیٚكو میناکی مرۆڤیٚکی نیهاد پاك شیٚواندووە. نە دەتوانم بڕۆمو نە دەتوانم وەمیٚنم. تۆ ئافرەتیٚکی ئابڕومەندو ڕاستگۆو سەر ڕاستی، بیکە بە خاتری خودا، بە کاوەخۆ، بیٚ هیچ پەلەپەلیٚك، پیٚم بڵیٚ چ بکەم؟ زۆرجار ئەو شتەی رۆژیٚ لە رۆژان مایەی تەوسو توانجی کەسیٚك بووە، یەخەی خۆی دەگریٚتەوە. خۆ ئەگەر مانگیٚك لەوە پیٚش کەسیٚك پیٚشبینی ئەمەی کرد با رۆژیٚ تووشی بیٚقەراریو نیگەرانیەکی نەشئەئەنگیٚزی وەکو ئەمە دەبم، لە پیٚکەنیندا دەمردم، جا وەرە مەردی خودا بە وەکو ئافرەتیٚکی راستگۆو ئابڕومەند پیٚم بڵیٚ: ئایا حەزت لیٚیە شوو بە من بکەی؟ بە مەرجیٚ لە کانگای دڵتەوەو بەوپەڕی جورئەتەوە بڵیٚیت بەڵیٚ. لیٚ ئەگەر کەمترین سایەی گومانو دوو دڵی بەسەر رۆحتەوە هەبیٚ، باشترە بڵیٚی نەء.

تـوبی توخـودا بـاش سـیّ‌و دووی دڵـی خـۆت بکـه. هەڵبەتـه وشـەی "نـه"م لەبـەر گـران و نـاخۆش دەبێت، بەڵام هەرچۆنیّ بیّ بە خۆما ڕادەپەڕمووم کە بەرگەی بگرم. بەڵام هەرکاتیّ لە پایەی مێردا وەکو پێویست مەحەبەت لەلایەن ژنەکەمەوە نەبینم، زیاترم لەبەر گران‌و ناخۆش دەبێت.

## بۆ ئا. ئا. تولستویا
## یاسنایا پولیانا، ١٨٦٢/٩/٢٨

**دۆست‌و داپیرەی ئازیزم**

لـه گونـدەوە ئـەم نامەیـەت بـۆ دەنووسـم. لـه سـەرەوە دەنگـی ژنەکـەم دێتـه گـویّ کـه خـەریکی گفتوگۆیە دەگەڵ برایەکەمدا کە لەم دنیایەدا لـە هـەموو کەسـم پـتر خـۆش گەرەکـە. تەمـەنم گەییـه سی‌و چوار ساڵی‌و هێشتا نەمدەزانی دەشێت پیـاو بـەم رادەیـە خۆشەویسـتی بکـات‌و بەختـەوەر بێت. کە تۆزیّ هێورتر بوومەوە نامەیەکی تێرو تەسـەلت بـۆ دەنووسـم. ئێسـتا نـا!کە پتر هێور بوومەوەو هاتمەوە سەرخۆ. هەڵبەتە نها هێندە هێورو ئاسودەو بـە کـەیفم کـە لـە عەمراتمـدا شـتی وام بەخۆوە نەدیتووە، لیّ دەبیّ تۆزێك دەگەڵ ئەم ژینگـەی شـادمانی‌و خۆشـیەدا ڕابێم‌و خـووی پێوە بگرم. نهو هێشتا هەستدەکەم کە بە ناهەق بەختەوەرییەکی نـاڕەوام، کـە شایسـتەی نـەبووم، بە تالاّن بردووە. ئەوەتا وا خەریکە نزیك دەبێتـەوە، دەنگـی دەژنـەوم‌و نوقـومی لـەزەت دەبم. دوا نامەتم پێگەیی سوپاست دەکەم. مەعلوم نیە بۆچی خەڵکانی باشی مینـاکی تـۆو خـەڵکانی سـەیر تر لە هەموو خەڵکی وەکو ژنەکەم ئەو هەموو لوتفەتان بەرانبەر بە من هەیە؟.
حـاڵی پـوریّ هـەر ڕوو لـە خەراپییـە. دوای ئـەو پەرێشـانی‌و دڵ داخورپانـە تووشـی نەخۆشـی خەمۆکی بووە، یـادی نیکولیکـا(١) ئـازاری دەدا. دەگـەڵ (فـت)(٢)دا ئاشـت بوومەتـەوە. سـەرم لـیّ بدە. دەستی ماریژا پتروڤنا ماچ دەکەم. خودا حافیز دۆستی ئازیزم. بە دڵ لە ئامێزت دەگرم.

***ل. تولستوی***

***پەراوێز:***

***١- مەبەست لە نیکولایی برای تولستوی یە کە مرد.***

***٢- هەردوو نووسەر لە مانگی ١٨٦٢/١دا لە مۆسکۆ ئاشت بوونەوە. فت لە نامەیەکیدا کە لە مانگی ١٨٧٤/١١دا بۆ تورگینیف- ی نووسیوە، دەربارەی ئەم ئاشتبوونەوەیە دەڵێت: "جارێك لە ئامەنگێکی بۆڵماسکەدا کە لـە شانۆخانەیەکدا بەڕێوەچوو، تولستوی پاش***

*ئەوەی لە سەرەتادا وای نواند کە منی نەدیتوە، لەپڕ لێم نزیک بووەوەو گوتی: "نا! زویر بوون‌و تۆران لە تۆ مەحاڵە!" هەنگێ دەستی خۆی بەرەو من درێژکرد.*

## بۆ ت. ئا. بیرس(١)، ژنخوشکی تولستوی
## یاسنایا پولیانا ، ١٨٦٣/٣/٢٣

دەستی بە نووسینی نامەکە(٢) کردبوو، لێ لە ناکاو قەڵەمەکەی دانا. چونکە توانای نووسینی نییە. دەزانی لەبەر چی تانیای ئازیز؟ پێشهاتێکی سەیری بەسەر هاتووە، هەڵبەتە پێشهاتێکی سەیرتر لە من روویداوە، هەڵبەتە تۆ دەزانیت کە ئەو میناکی هەر یەکێك لە ئێمە لە گۆشت‌و خوێن چێ بووەو هەموو سیفەتێکی خاس‌و خراوی مرۆڤانی تیایە. بۆ نموونە هەناسە دەدا، گەرمای دەبێ، هەندێجار حەرارەتی بەدەنی زۆر بەرز دەبێتەوە، کەپووی دەگیرێت – جا بە چ مشەمشێك–و هتد... بە تایبەتی بەسەر ئەندامانی میناکی دەست‌و لاقیا، کە وەزع‌و حاڵەتی جۆراو جۆر وەردەگرن، زاڵ بووە، بە شێوەیەکی گشتی وەکو هەموومان حەرەکەی جسمانی خۆی هەیە. لە پڕێکا رۆژی ١٨٦٣/٣/٢١ نزیکەی سەعات دەی شەو ئەو رووداوە نا ئاساییە بەسەر هەردووکماندا هات. تانیا! من دەزانم تۆ هەمیشە رمودەو هۆگری ئەو بوویت، خۆشت ویستووە – نازانم هەنووکە چ هەستێکت لا چێدەکات؟– دەزانم تۆ رێزو لوتفت بەرانبەر بە من هەیە، دەزانم سەبارەت بە مەسەلە گرینگەکانی ژیان‌و خۆشەویسی دایك‌و باوکت کەسێکی زرینگ‌و هوشیارو رۆشنبیریت – جا خۆت ئامادە بکە کە ئەم رووداوەیان بۆ بگێڕیتەوە – منیش رووداوەکەت دەقاو دەق وەکو چۆن روویداوە بۆ دەنووسم.

ئەو رۆژە زوو لە خەو ڕابوو بووم‌و لە جێ هاتبوومە دەرێ‌و چ بە پێیان‌و چ بە سواری زۆر گەڕا بووم. شیومان خواردو ماوەیەك کتێبمان خوێندەوە – ئەو هێشتا مەیلی لە خوێندنەوە بوو– من ئاسوودەو زۆر شادمان بووم. نزیکی سەعات دە روخستەم لە پورێ خواست – وەکو هەمیشە مێربڤان بوو و قەولی دا کە جاری تریش بێتە لامان – چوومە ناو جێگاوە. ئاگام لێبوو سۆنیا چۆن دەرگاکەی کردەوە، چۆن هەناسەی هەڵکێشا، چۆن بە دەم نیمچە خەوەوە خۆی داکەند، گوێم لێبوو چۆن لە پشت پەردەکەوە وەدەرکەوت‌و لە تەختە خەوەکە نزیك بووەوە. چاوانم هەڵێنان‌و سۆنیام بینی. بەڵام نەك ئەو سۆنیایەی کە تۆو من دەیناسین، بەڵکو سۆنیایەکی چینی یانی دروستکراو لە هەمان چینی کە دایك‌و باوکت باسیان دەکرد. ئایا تۆ ئەو لە یستۆکە

چینیانەت دیتووە کە شان و مل و باسکیان ساردو سڕو ڕووتەو بازوویان هەمیشە بۆ پێشەوەیە، بەڵام بە بەدەنیانەوە نووساوەو قژیان بە بۆیەی ڕەش ڕەنگ کراوەو چین چین وەستاوەو سەری داوی قژیان کەمێك کاڵ بووەتەوەو چاوە رەشەکانیشیان لە چینی یە؟ گۆشەی چاوەکانیشیان بە بۆیەی رەش و بە شێوەیەکی زۆر بەرجەستە ڕەنگێنراوەو چینی کراسەکانیشیان گەورەیەو لە چینییەو یەکپارچەیە؟ سۆنیا عەینی لەم لە یستۆکانە دەچوو. بەدەنیشی سست و ئیفلیج کە دەستت لێدەدا، پێستی نەرم و خۆش، بەڵام وەکو چینی سارد بوو. وامزانی لە خەودام، تەکانێکم بە خۆدا، لیٚ ئەو بە هەمان دەقەوە بیٚ جوڵە لە بەرانبەرم وەستا بوو، پرسیم: "چیە لە چینی دروست بوویت؟" جا ئەو بەبیٚ ئەوەی زاری بکاتەوە بە هەمان وردە چین و سوراوی تۆخەوە، بیٚ جوڵە بوو – بەرسڤی دایەوە "بەڵیٚ لە چینی دروست کراوم!" موچوڕکێك بە گازەرای پشتمدا هات. چاوم بڕییە پێیەکانی، ئەوانیش چینی بوون– مەگەر هەر تۆ بزانی چ ترسێکم لیٚ نیشت – لەسەر پایەی تەختێکی چینی یەکپارچە بوو و عاردەکەی سەوز دەنواند. ستونێکی قاوەیی لە پێی چەپییەوە تا سەرووی ئەژنۆی، لە شێوەی داردەستێکدا کە مایەی سەرنج بوو، یەك تەختە بە لاقیەوە نووسا بوو. یانی دەگەڵ لاقیا یەکپارچە بوو. بۆم دەرکەوت کە بەبیٚ ئەم ستونە داردەست ئاسایە ناتوانیٚ بەپێوە بوەستێت. ئیدی خەمێکی وەها دڵ و دەروونی گرتم، مەگەر هەر تۆ کە ئەوت زۆر خۆش دەویٚ، پەی پیٚ ببەیت. باوەڕم نەدەکرد ئەوەی دەیبینم حەقیقەت بیٚ. دەستم بە گازکردنی کرد. بەبیٚ ئەو ستوونەو پایەکەی نەیدەتوانی بجوڵێت. تەکانی بچووکی بەرەو پێشەوە دەدا، دەتگوت خۆی بە عاردیدا بکێش دەکات تا بەلای مندا بکەویٚ. گوێم لە دەنگی پێیە چینییەکانی دەبوو کە بە عاردی ژوورەکەدا دەکەوت. کەوتمە دەست پێدا هێنانی. زۆر نەرم و نیان و خۆش و سارد بوو، و سەراپا لە چینی بوو. ویستم دەستی بەرز بکەمەوە لیٚ مەحاڵ بوو. چەندم هەوڵدا پەنجەیەك یان نینۆکێکی خۆم بە بەینی ئانیشك و قەبرغەیدا بکەم، نەچوو و نەچوو، چونکە بە توێژاڵێکی زۆر تەنکی ماجومی چینی، وەکو هەمان ماجومی کە ئویرباخ بە کاری دەبات و ئامانی پیٚ دروست دەکەن،ئانیشك و قەبرغەی پێکەوە لکێنرا بوونٚ. کەوتمە تاقیبی کراسەکەی. لەسەرو خوارەوە، بەدەنی یەکپارچە بوو. لە نزیکەوە لێی ورد بوومەوەو دیتم لەلای خوارەوە پارچەیەك لە چینی کراسەکەی هاتووەتە دەریٚ، بە جۆرێك کە لە ژێرەوە ڕەنگە قاوەییەکەی دەبینرا. ڕەنگی قژەکەی تەپڵی سەری کەمێك کاڵ بوو بووەوەو پەڵەیەکی سپی جێی گرتبووەوە. ڕەنگی سووچێکی لێویشی کاڵ بوو بووەوەو پارچەیەکی بچوك لە شانی هاتبووە دەریٚ. بەڵام هەموو شتێك ئەوەندە ئاسایی دەینواند دەتگوت سونیای خۆمانە، کراسەکەی هەمان کراس بوو کە من دەمناسی، بە هەمان حاشیەو پەراوێزی تۆڕی و پێچی ملەوە، جیاوازییەکەی ئەوە بوو کە چینی بوو. دەستە ناسك و جوانەکانی، چاوە درشتەکانی، لێوی، هەر هەموو شتێکی وەکو ڕاستی دەهاتە بەرچاو، بەڵام چینی بوون. چاڵی چەناگەی، سینەو مەمکی ناسکی هەمووی وەکو ئەسڵ بوو. گرفتاری وەزع و حاڵێکی ترسناك بوو بووم. نەمدەزانی چی بکەم و چ بڕیارێك بدەم، هەڵبەتە ئەو ئامادە بوو یارمەتیم بدات، لیٚ بوونەوەرێکی چینی چ کۆمەك و یارمەتیەکی لە دەست دیٚ؟ چاوە نیوە کراوەو

برژانگ‌و بروكانی بەدەوری یەكدا هەر هەموو لە زندوو دەچوون، نیگای لە من نەبوو، بەڵكو دەیڕوانیە تەختەخەوەكە، دیاربوو كە حەزی لە خەوەو بەو دەقەوە بەرەو پێش تەكانی دەدا. بە تەواوەتی پەشۆكا بوومو نەترەم بەردا بوو. لە پڕێكا گرتمو ویستم بیهێنمە ناو جێگاكە، قامكەكانم بە بەدەنە ساردە چینییەكەیدا نەدەچوون، ئەوەی زیاتر سەرسامی كردم ئەوە بوو كە لە ناكاودا سووك بوو، لە تۆ وایە لە شووشە دروستكراوە. پاشان بەرە بەرە بچووك بووەوە تا بە ئەندازەی لەپی دەستی منی لێ مایەوەو وێڕای ئەمەش هەر خۆی بوو و روخسارو بیچمی هیچ نەگۆڕا بوو. بالیفێكم هەڵگرت‌و لە سوچێكدا دامناو مستێكم پێدا كوتاو پاشان ئەوم لەسەر بالیفەكە داناو سەرپۆشەكەیم لە سەری كردەوەو چوار قەدم كردو ڕوویم تا نزیكی سەری داپۆشی. هیچ گۆڕانێكی بەسەردا نەهاتبوو، بە هەمان دەقەوە ڕاكشا بوو. مۆمەكەم كوژاندەوەو ئەوم هێنایە نزیكی بالیفەكەم، لە پڕێكا لە سوچی بالیفەكەوە گوێم لە دەنگی بوو كە دەیگوت: "لیڤ! بۆچی بووم بە چینی؟" نەمدەویست نیگەران‌و ناڕەحەتی بكەم، وەڵامم دایەوە هیچ نیە گوێی مەدەرێ، جارێكی دی لە تاریكییەكەدا دەستم پێدا هێنا، هێشتا هەر ساردو لە جنسی چینی بوو. لێ سكی بە جۆرێ بوو كە دەتگوت زندووە. شێوەیەكی قووچەكی هەبوو كە سەرەكەی بۆ سەرەوە بوو و بۆ لە یستۆكێكی(بووكەڵە) چینی هەندێك نا ئاسایی دەهاتە بەرچاو. هەستێكی سەیر بەسەر دڵم دا زاڵ بوو. لە پڕێكا لە خۆوە خۆشحاڵ بووم بەوەی كە وای لێهاتووەو سەرسامیەكەم ڕەوییەوەو هەموو شتێكم بەلاوە ئاسایی بوو. ئەوم گرت، ئەم دەست‌و ئەو دەستم پێكردو ئەوسا خستمە ژێر بالیفەكە. هیچ كاردانەوەیەكی نەنواند. بە دوو قوڵی خەو بردینیەوە، بەرەبەریان لە جێگە ڕابوومو بێئەوەی هیچ تەمەشایەكی ئەو بكەم لە ماڵ وەدەركەوتم. ترس‌و سەرسامیەكەی شەوێ هێشتا بەری نەدابووم. گاڤێ(كاتێ) بۆ فراڤین بۆ ماڵ ژڤریمەوە ئەو گەڕابووەوە سەر دۆخی ئاسایی هەمیشەیی خۆی. سەربورو ڕووداوەكەی شەوێم وەبیری نەهێنایەوە چونكە ترسی ئەوەم هەبوو چ ئەو و چ پوریێ بترسن. تا ئێستا ئەم شتەم جگە لە تۆ بۆ كەسی تر نەگێڕاوەتەوە. تەسەورم دەكرد ئەم ڕووداوە بە تەواوەتی لە بیر دەچێتەوەو جارێكی دی دووبارە نابێتەوە كەچی لەم ڕۆژانەی ئەم دواییانەدا هەركاتێ كە تەنیا دەبم، هەمان ڕووداو دووبارە دەبێتەوەو بویەرەكە موو بە موو وەكو ڕۆژی یەكەم ڕوودەداتەوە. ئەو كەمترین نیگەرانی دەربارەی ئەم بویەرە نیەو نانوێنێ. خۆمیش هەر وام، و بە ئاشكرا دەیڵێم كە تەنانەت لە ناخدا هەست بە جۆرە لەزەتێك دەكەم، لەوەیە ئەم ئیعترافە زۆر سەیر بنوێنێ‌و عەنتیكە بێتە بەرچاو، بەڵام وایەو گریمان ئەگەر ئەو لە چینی-ش دروست بووبێ، من هەر زۆر بەختەوەرم تانیای ئازیزم! هەر هەموو ئەم سەربهوردو واریقاتەم بۆیە نووسی تا خۆت ئامادە بكەیت كە ئەم هەواڵە بە باب‌و دایكت بگەیەنی‌و لە ڕێگەی بابتەوە ڕاوێژ بە پزیشكان بكەیت. مانای ئەم ڕووداوە چیەو ئایا بۆ منداڵی ئایندە خراپ نیە؟ نها ئێمە بە تە نیاین‌و ئەو لە نزیكی كورسییەكەی من دانیشتووەو هەست بە سەری كەپووە جوانەكەی دەكەم كە بە گەردنما دەچێت. دوێنێ بە تەنیا لە ماڵەوە مابووەوە. كاتێ كە چوومە ژوورەكەی سەیرم كرد (دورا)ی سەگمان خستوویەتیە سووچێكەوەو بە دەم وازییەوە مژولی كردووەو چیوای نەماوە پڕی بداتێ. لە

دورام داو سۆنیام له باوەش کردو بۆ ئۆفیسەکەی خۆمم برد. ئەمە جگە لەوەی ئەمڕۆ له (تولا)وه سەندوقێکی ئاڵقەریزی تایبەتیم، کە پێشتر ڕامسپاردبوو، بۆ دێنن. روکەشی ئەم سەندووقە چەرمو ناوەکەی مەخمەلی سوورەو ڕێك بە گوێرەی لەش و لاری ئەو دروستکراوە، یانی بە جۆرێك دروستکراوە کە بتوانێت بە ئانیشك و سەرو پشتی خۆیەوە بچێتە ناوی و هیچ ئاسیوێکی پێنەگات. سەرەکەشی بە چەرمی جیر دادەپۆشم.

لە کاتێکا کە مژولی نووسینی ئەم نامەیە بووم ڕووداوێکی ترسناك رووی دا، ئەوە بوو کە ئەو لەسەر مێزەکە وەستا بوو، و ن.پ(٤) بەلای مێزەکەدا تێپەڕیو خۆی بە مێزەکەدا دا، و ئەو کەوتە خوارەوەو لاقی لە پێیەوە تا ئاستی زرانی(ئەژنۆ) خراپ زامدار بوو. ئالکسی دەڵێت کە بە تۆزێك سپیاوی قوڕقوشمو سپێنەی هێلکە سارێژ دەبێتەوە. بێزەحمەت ئەگەر لە مۆسکۆ کەسێك دەناسێت کە دەرمانی ئەم جۆرە زامە بزانێ یەکسەر ڕەچەتەیەکمان بۆ بنێرە.

***پەراوێز:***

١- *مەبەست تاتیانیای ژن خوشکی تولستوی یە.*

٢- *لە سەرەتای ئەم نامەیەوە ژنەکەی تولستوی-ش سێ دێرێکی نووسیوە*

٣- *ئویرباخ: دۆستێکی تولستوی بوو کە کارخانەیەکی چینی سازی هەبوو.*

٤- *ن. پ: مەبەست (ناتالیا ئوخۆتنیسکایا)یە.*

## بۆ ئا. ئا. تولستۆیا

## یاسنایا پولیانا، ١٧-١٨٦٣/١٠/٣١

نامەیەکی چوار لاپەڕەیی حازرو ئامادەم لەبەردەمدایە بۆ تۆ، لێ بۆتی نانێرم. ئەوەندە لێت بێ ئاگامو هێندە خۆم دەرهەق بە تۆ بە خەتابارو کەمتەرخەم دەزانم کە دەتوانم بێژم لێت دەترسم، هەڵبەتە مەترسی لە دەستدانی دۆستێکی وەکو تۆ بۆ من لە ڕادەبەدەر ترسناکە. هەڵبەتە خەتو ئیمزای من دەناسیتەوە بەلام بێگومان لە خۆت دەپرسیت ئەو ئێستا کێیە؟ نها مێردو باوکم، هێندە بەم وەزعە ڕاهاتوومو خۆشحاڵم کە دەبێ بۆ هەستکردن بە بەختەوەری خۆم، وەزعو حاڵی زوگوردیاتی خۆم بێنمەوە بەرچاو. ئێستا بە بەردەوامی بیر لە وەزعی خۆم ناکەمەوە. ئیدی لە چۆنیەتی هزرو هزرینو هەستەکانم ناپرسمەوە، ئەمە تەواو بوو، نها تەنیا هەستدەکەمو بیر لە پەیوەندی خانەوادەییم ناکەمەوەو ئەم وەزعەش بووەتە هۆی ئەوە کە مەیدانێکی بەرینی تاوانی

هـزرو خـەیاڵم بۆ فەراهـەم ببیٚ. بـە عـەمراتم هێـزی زەیـنی خـۆمم بـەم ئازادیـە، بـەم ئامادەگیـە بـۆ کـارکردن نـەدیتبوو و کـاری ئامادەشـم هەیـە کـە بریتییـە لـە چیرۆکێك دەربـارەی قۆنـاغی نێـوان سـاڵانی ١٨١٠- ١٨٣٠ کـە لـە سـەرەتای پـاییزەوە تـەواو مـژولی کـردووم(١) و نـازانم بـە هـۆی لاوازی کەسـایەتیمەوەیە یـان بـە هـۆی بـە هێزییەوەیـە — هەنـدێجار وا وێنـا دەکـەم بـە هـۆی هەردووکیانەوە بێت — کە دەبیٚ دان بەوەدا بنەم کە بۆچوونی من سەبارەت بە ژیانی خەڵکی و کۆمەڵگە، لە چاو دواجاردا کە یەکترمان بینی، بە تەواوەتی گۆڕاوە. ئێستاش هاوخەمیانم، لیٚ پێم سەیرە چۆن تا ئەم رادەیە هاوسۆزیم دەگەڵ دەکردن؟ بە هەرحاڵ گەلەك بەختیارم کە ئەو قوتابخانەیەم دامەزراند ، چونکە ئەم دوا ماشوقەیەی من کاریگەریی بەسەر پێکهاتەی کەسایەتی منەوە هەبووە. ئێستاش منداڵان و پرۆسەی فێرکردن و پەروەردەم خۆش دەون، لیٚ بە ئەستەم دەتوانم خۆم بخەمەوە قاڵبی یەك ساڵ لەمەوپێشم. عەسران منداڵان دێنە دیدەنیم و یادگاری ئەو زەمانـەم، کـە مامۆسـتا بووم،هەڵبەتـە ئێسـتا مامۆسـتا نـیم، لـە هـزرو بیرا تـازە دەکەنـەوە. ئێسـتا نووسەرێکی تەواو عەیارم و تواناو هێـزی خـەیاڵ و نووسـینم گەییوەتـە ڕادەیـەك کـە لـە عـەمراتما شتی وام بە خۆوە نەدیتوە. مێردو باوکێکی بەختەوەرو ئاسوودەی ئەوتۆم کە هیچ جۆرە رازێکم لە هەنبەر کەسدا نیەو تاقە ئاوات و ئارەزووم ئەوەیە ئەم وەزعە وەکو خۆی بەردەوام بێت. تـۆم لـە جاران کـەمتر خۆشدەویٚ، بەڵام پەیوەنـدی و دۆسـتایەتی تـۆم یـەجگار بـەلاوە مەبەسـتە. لـە دڵـی خۆمدا، پتر لە هەر هەموو ئەو کەسانەم — کە ژمارەیان بیٚ ئەندازە زۆرە — کـە لـە ژیانـدا دیتـوومن خۆشتر دەوێیت و رێزت دەگرم. هەمیشـە گلەییـەکم لێـت هـەبووەو هێشـتاش ئـەو گلەییـەم لـە دڵـدا ماوەو چونکە ئێستا بە روونی بیردەکەمەوە ئەم گلەییەت بۆ دەگێڕمەوە. بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە ئێمە پەیوەندیمان بە یەکەوە هەبووە، تۆ تەنیا لایەنی گشتی زەین و روحـی خـۆتت بـۆ ئاشـکرا کردووم — هەڵبەتە باش لە مەبەستم حاڵی دەبیت — لیٚ هەرگیز وردەکارییـەکانی ژیـانی خـۆت بـۆ من باس نەکردووە، نها کە من وردەکارییەکانی ژیانی خۆمت بۆ دەنووسـم، نـازانم چ پرسـیارێکت لێبکـەم و چ شـتێکی دڵخـوازی خۆتـت لـە خـودا بـۆ داوابکـەم؟ تەنانـەت نـازانم جگـە لـە ئەشـقی چاکەکاری و باوەڕ بە لوتف و جوانی و چاکەکاری کە گرینگترین خەسڵەتی کەسـایەتی تۆیـە، لـە ژیاندا چ حەزو کەڵکەڵەیەکی ترت هەیە،و دڵت بە چ شتگەلێکی ترەوەیە. هەڵبەتە بە تـەما نـیم ڕیٚ بەرمـە نـاو حـەریمی موقەدەسـی دڵـی تـۆ، بـەڵام حەزدەکـەم ئاگـام لـەو رۆژانـە شـتانە بێـت کـە تـۆ حەزیان لێدەکەیت. دەترسـم بـە دروسـتی لـە مەبەسـتم حاڵـی نـەبیت، چـونکە وادیـارە شتەکە زۆر گەوجانـە دەگێڕمـەوە. مـن تـەبعێکی لاوازم هەیـە و زۆر بـە ئاسـانی دەکەومـە ژێـر کاریگـەریی شەپۆلی موگناتیسـی ئـەو خەڵکانـەوە کـە خۆشـم دەوێـن، بۆیـە هەمیشـە موعجـەبی کەسـایەتی تـۆ بووم و دەبم. هەرکـە سـەروکار دەگـەڵ تـۆدا پەیـدا دەکـەم یەکسـەر دەسـتکیشـی سـپی لـە دەسـت و پـاڵتۆی درێــژی رەش لەبــەر دەکــەم. ئێســتاش لــە بیرمــە دوای ئــەوەی شــەوێکم لەگــەڵ ئێــوەدا دەگوزەراند، تامی شتێکی شیرین و خۆش لە زەینما دەمایەوەو لە حاڵێکا من بە تەمای لـەزەتێکی سەرەکی تر لەمانە بووم. شتێك نەبوو کە پشتی پێوە بدەم. لەوەیە دەستی تەقدیر وای پـیٚ بـاش بووبیٚ، بەڕاسـتیش بـاش بـوو، بـەڵام عـەودالی شـتێکی دیکـە بـووم. ئایـا بیرت مـاوە کـە بـە نیـاز

بوویت چیرۆکێکم بۆ بنووسیت؟ وێنام دەکرد لەم حاڵەتەدا دەمانتوانی پە یوەندییەکی بنەڕەتی تر چێبکەین. ئایا دەشێت ئەم هەستانە بۆ هەمیشە لە دەست چووبن(٢)؟ هێشتا ئەوەی کە دەمویست بۆتی بنووسم نەم نووسیوە، بەڵام ئەگەر ئەم نامەیەم لە جیاتی ئەوەی بینێرم، بمخستبایە لاوە زۆر خەتەر دەبوو. بەم مانایەی کە بڕیارم دەدا چیتر نامەت بۆ نە نووسم. لە کوێی؟ چیدەکەی؟ چ بەرنامەیەلێکت بە دەستەوەیە؟ بڕیارو پڕۆژەکانی ئێمە بەمجۆرەیە: لە زستاندا هەرکاتێ وەزعی میزاجی سیرزا(٣) باش بێ‌و رێگە بدات، سیرزا یانی بزەیەکی بێگەردی خۆشەویستو دووچاوی چکۆلەی گەش. هیچی تری تیا بەسەر نیە. بۆ ماوەی دوو هەفتە دەچینە مۆسکۆ. هاوینەکە لە گوند بەسەر دەبەین‌و زستانی ئاینده بۆ شار دەڕۆین. خودا حافیز! کەسوکارو دۆستانتان چدەکەن؟ هیوادارم ئەم نامەیە بە کەس نیشان نەدەیتو بیدڕیت.
سۆنیا تۆی زۆر خۆش دەوێ – بەڕاستی– خۆی بۆ نووسینی نامەیەك بۆ تۆ، ئامادە دەکات. نازانم گەرەکیەتی چی بنووسێت، بەڵام زۆر حەزدەکەم بزانم.

***پەراوێز:***

١- *مەبەست لە رۆمانی (شەڕو ئاشتی)یە.*
٢- *تولستوی لێرەدا بە تەواوەتی خەتی بەسەر دوو دێڕو نیودا هێناوە.*
٣- *سیرزا: کوڕە نۆبەرەکەی تولستوی یە.*

## بۆ ئا. ئا. فت
## یاسنایا پولیانا، ١٨٦٥/٥/١٦

دۆستی ئازیزم ئاڤاناسی ئاڤاناسوڤیچ! بمبورە کە دەمێکە وەڵامی نامەکەتم نەداوەتەوە. بە خۆیشم نازانم بۆ، هەڵبەتە ڕاستە کە لەو کاتەدا یەکێك لە منداڵەکان نەساغ بوو و بە خۆیشم تایەکی قورسم لێهاتبوو و سێ دانە رۆژ لە جێگادا کەوتم. لێ نهو وەزعمان لێرە لە هەموو روویەکەوە بە دڵی خۆمانەو ژینگەکەمان یەجگار خۆشە. تانیای ژن خوشکم و هەروەها خوشکەکەم‌و منداڵەکانیشیان لێرەن‌و منداڵەکانمان باشن‌و رۆژ تا ئێوارێ لە هەوای ئازادا بەسەردەبن. خۆیشم وردە وردە خەریکی نووسینم‌و لە کارەکەم رازیم. دەنوك درێژان وەکو جاران لە فڕینی خۆیاندان، بە زۆری بە ئاسمانەوەن‌و هەموو عەسرێك تەقەیان لێدەکەم، بەڵام بەدەگمەن دەیان پێکم. لە بەڕێوەچوونی موڵکەکانم رازیم، یانی کەمتر وەختم دەگرێت،و هەرچیەکم بوێ بۆمی دەکەن. ئەمە هەموو شتێك بوو دەربارەی خۆم. بەڵام سەبارەت بە داواکەی تۆ کە گوایە لە

یاسنایا پولیانادا جارێکی دی بکەومەوە کاری بەڕێوەبردنی قوتابخانەکە، ئەمە ناکەمو وادیارە ئەنجامگیرییەکەی تۆ لە هەموو رووییەکەوە دروستە. گۆڤاری یاسنایا پولیانا، بە تەواوەتی لە بیرم کردووەو حەزناکەم یادی بکەمەوە. هەڵبەتە نەك لەبەر ئەوەی بابەتەکانی وەردەگرمەوە، بە پێچەوانەوە لەبەر ئەوەی زۆرم مژول دەکات. ئەگەر خودا تەمەن بدات هیوادارم ئەزموونی سێ ساڵ مژول بوونم بەم کارە دڵگیرەوە بکەم بە کتێبێك(١)، هیچ شتێك لەمەڕ ئەو وتارەی کە خەریکی دەینووسیت حاڵی نەبووم، وا باشترە کاتێ کە یەکترمان بینی خۆت بۆم شەرح بکەی. کاری زەویداری ئێمە لە کاری خاوەن کۆمپانیایەکی هەرەوەزی دەچێت کە سەهمەکانی لە قیمەت کەوتبن و لە بۆرسەدا نەچن. کارێکی زۆر خراپە. من سەبارەت بە خۆم بە جۆرێ ئەم بابەتە چارەسەر دەکەم کە زیانەکەی نیگەرانو ناڕەحەتم نەکات. لەم دواییانەدا زیاتر لە کاری خۆم رازی بووم، بەڵام بارودۆخی گشتیو هەژاریو بێنەوایی کە لە سەرەتاتکێدایەو برسێتی خەڵکی رۆژ بە رۆژ پترم ئازار دەدات(٢). زۆر سەیرو ترسناکە، لە ماڵی ئێمەدا لەسەر خوانەکە ناسکە توور، کەرەی زەرد، نانی نەرمو سورەوە بوو هەیەو بە پەردەیەکی پاك داپۆشراوە. باخەکە پڕە لە سەوزەواتو ژنانمان بە جلو بەرگی مۆزلینەوە زۆر شادو بە کەیف وێڕای گەرمی دنیا لەبەر سێبەری خۆشدا خەریکی باسو خواسی خۆیانن و کەچی تۆزێ لە خوارترەوە ئەهریمەنی خوێنخۆری برسیەتی وقاتوقڕی دەستی بەکاری خۆی کردووە. سەرانسەری مەزراکانی سوتاندووە، زەوییە وشکەکانی شەقار شەقار کردووە، چەرمی پاژنەی قرتماغە بەستبووی جووتیارانو ژنانی هەڵکەندووەو نینۆکی پێی حەیواناتی شەقار کردووە. دەگاتە سەر ئێسقانو هەمووان هەراسانو نیگەران دەکات و لەوەیە کاریگەرییەکەی بگاتە ئێمەش کە نها بە جلو بەرگی مۆزلینەوە لە سایەی درەختانی چڕە سێبەردا حەواوینەتەوەو بە شادمانیەکی تایبەتیەوە دەڕوانینە کەرەی زەرد لە نێو قاپێن نەخشیندا. بەڕاستی چ بۆ بەروبوومو چ بۆ حەیوانەکان کەشو هەوایەکی نالەبارمان هەیە. ئەدی وەزعی ئێوە چۆنە؟ بە وردی و درێژی باسی وەزعی ئەوێندەرم بۆ بکە. ئەگەر (بتکین) لەوێندەرە لە جیاتی من دەستی بگوشە، ئەدی بۆچی نەهاتە دیدەنی من؟ لە چەند رۆژێکی داهاتوودا — بە تەنێو بەبێ ماڵو مندالّ- بۆ نیکولسکویە دەڕۆم، لەبەر ئەمە تا ماوەیەکی کەمی دیکە بۆ ماڵی ئێوەش نایەم، و ئەگەر بەخت یار بێ زۆر چاکە تۆش بێی بۆ دیدەنی برلیف.

خۆمو ژنەکەم سلاومان بۆ ماریاپتروڤنا هەیە. بەنیازین هەموو مانگی شەش بەخێزانی لە نیکولسکۆیە بەسەر بەرین و لەم حاڵەدا بێگومان دێمە سەردانی تۆش.

بەڕاستی بەختو شانس زۆریان زوڵم لە تۆ کردووە. لە میانەی باسو خواسەکانمانەوە هەمیشە دەگەییمە ئەم باوەڕەی کە تۆ لە واری کشتیاریدا تەنیا حەز لە یەك شت دەکەیتو زۆری لەزەت لێدەبینی، و ئەویش بەخێوکردنی ئەسپە، و مخابن ئەم لایەنە لە هەموو لایەکانی تر قەیراناوی تر بووە. نها ناچار دەبێ کارەکەت بگۆڕیتو جارێکی دی بچیتەوە سەر هونەر کە لە ناخی تۆدا رەگو ریشەی داکوتاوە.

***ل. تولستوی***

***پەراوێز:***

***١- تولستوی لە ساڵانی نێوان ١٨٧٢- ١٨٧٤دا ئەنجامی ئەزموونە فێرکارییەکانی خۆی لە کتێبێکدا بە ناوی ئەلفبا تۆمار کردو وتارێکی دەربارەی فێرکاریو ڕێنوێنی گشتی نووسی.***

***٢- لە ساڵی ١٨٦٥دا، لە ویلایەتی تولادا قاتو قڕییەکی گەورە ڕووی دا.***

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

## یاسنایا پولیانا، ١٨٧٢/٩/١٥

**دۆستی ئازیزم ئالکساندرین**

**تۆ یەکێکی لەو کەسانەی کە لە ناخی دڵەوە بە دۆستانی خۆت دەڵێیت: "من دەبم بە شەریکی خەمەکانی تۆو تۆش لە شادییەکانی خۆتا بمکە بە شەریك". من کە لە دڵپاکی تۆ دڵنیام هەمیشە باسی شادیو خۆشیەکانی خۆمم بۆ کردویتو ئێستا لەم نامەیەدا داوای هاوسۆزیو هاوخەمی تۆ، سەبارەت بە خەمێك کە یەخانگیرم بووە، دەکەم.**

**بەڕاستی ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراوم لێقەوماوە کە ڕێڕەوی ژیانی بەتەواوەتی گۆڕیوم.**

**گایەك لە یاسنایا پولیانادا شوانێکی کوشتووەو من حاڵی حازر لە ژێر لێکۆڵینەوەی دادگاییدامو ناتوانم لە ماڵ وەدەربکەوم — تەنیا بە هۆی دەستووری خۆسەرانەی گەنجێکەوە بە ناوی یارمەتیدەری دادوەر- و تا چەند ڕۆژێکی دی تاوانباردەکرێمو دەبێ لە دادگادا بەڕەڤانیو داکۆکی لە خۆم بکەم. جا لە هەنبەر چ کەسانێکدا؟ باسکردنی ئەو کێشانەی بۆیان دروستکردوومو بیرکردنەوە لەو گرفتو ناڕەحەتیانەی کە بۆمی دروست دەکەن یەجگار خەمناكو ترسناکە.**

**بە ڕیشی سپییەوەو بە شەش منداڵەوەو بە ویژدانێکی ئاسوودەوەو بەکارکردنی بەردەوامو بە ویستنی خێر بۆ کۆمەڵگە، بەو باوەڕەوە کە لە ڕووی ویژدانیەوە خۆم بە کەمتەرخەم نازانم، بە هەستی دوورە پەرێزیو بێزاریو پەستی لەو دادگا تازانەی کە دیتوومن،و بەم ئومێدەی کە من کارم بە کاری خەڵکیەوە نیەو ئەوانیش ناڕەحەتم نەکەن، وێڕای هەموو ئەمانەش باوەڕبکە کاتێ بیر لەوە دەکەمەوە کە منداڵێکی وەکو ئەمە لە خوتو خۆڕایی حەز لە چارەی من نەکات، و کارێکی وەها بکات ڕامبکێشێتە پای مێزی دادگاییو پاشان هەواڵەی زیندانم بکات، ژیانی**

روسیام لەبەر چاو دەکەوێت، ژیان لە روسیادا زۆر بێ کەڵك بووە. بەڵام هەوڵدەدەم خۆم کۆنترۆڵ بکەم، ئاگری رق‌و تورەییم وەکوژێنم. بە هەرحاڵ ئەم رووداوە بە درێژی لە رۆژنامانـدا دەخوێنیتەوە. ئەگەر دەرگای دڵم بۆ کەسێك نەکەمەوە لە داخا شەق دەبەم. دەی باوا بێ، با بە ناوی دۆزینەوەی حەقیقەتەوە دادگاییم بکەن. ئێستا با لە بڕیارەکەی خۆم‌و ئەو کۆمەکەی لە تۆم دەوێ، ئاگادارت بکەمەوە.

ئەگەر لە داخانـاو لە غوربەتی زینداندا کە لەوەیە بمخەنە زندانەوە نەمرم – دڵنیام حوکمم دەدەن، چونکە رقیان لێمە– لێبڕاوم بە یەکجارەکی یان بەلای کەمەوە تا ئەو کاتەی ئازادی‌و ئیحتوباری فەردی لە روسیادا زامن نەبێت، بڕۆم بۆ ئینگلیستان. ژنەکەم بە خۆشییەوە بیر لە ئینگلیستان دەکاتەوەو حەزی لە هەموو شتێکی ئینگلیزییە. منداڵەکانیشم ئستیفادە لەم کۆچە دەکەن‌و دەرامەتیشم بەشی دابینکردنی ژیانم دەکات. خۆ ئەگەر هەموو شتەکانم بفرۆشم نزیکەی دوو سەد هەزار رۆبڵێك دەکات.

سەبارەت بە خۆیشم، هەرچەندە لە ژیانی ئەوروپایی بێزارم، بەڵام هیوادارم کە لەوێندەر بەلای کەمەوە تورە نەبم‌و بتوانم ئەم چەند ساڵە کەمەی کە لە تەمەنم ماوە ، بە هێمنی و ئاسوودەیی بەسەر بەرم‌و ئەو بابەتانەش بنووسم کە بە تەمای نووسینیانم. نەخشەکەمان ئەوەیە کە هەوەڵجار لە ئاقارو دەرێی لە ندەندا ئاکنجی(نیشتەجێ) ببین‌و پاشان شوێنێکی جوان‌و ساغڵەم لە نزیکی دەریادا کە قوتابخانەی باشی لێبێت هەڵبژێرین‌و خانوو و باخێك بکڕین. جا بۆ ئەوەی لە ئینگلیستاندا ژیانمان خۆش بگوزەرێ، پێویستمان بەوە دەبێ چەند ماڵباتێکی ئەشراف باش بناسین‌و هاتوچۆمان دەگەڵیاندا هەبێت. تۆ دەتوانی لەم بارەیەوە یارمەتیم بدەیت‌و ئەمە ئەو داوایەیە کە لە تۆم دەوێ. هیوادارم بۆمی جێبەجێ بکەیت. خۆ ئەگەر لە فەرزێکا خۆتیش لەوێندەر ناسیاوو ئاشنات نەبێ، دەتوانێ روو لە دۆستەکانت بنەی. دوو یان سێ نامە بۆ کردنەوەی دەرگای ماڵانی خانەوادەێن باشی ئینگلیزی، لە رووی منا بەسە. ئەم کارە بۆ منداڵەکانم کە دەبێ لەوێندەر پەروەردە بېن زەرورییە. جارێ ناتوانم کاتی کۆچەکەمان دیاری بکەم، چونکە ئەم جەلادانە دەتوانن بە کەیفی دڵی خۆیان ئازارم بدەن. تۆ نازانی ئەم ستەمکاریانە چەند ناخۆشن! وا باوە کە قانون بۆ زامنکردنی ئاسایشی تاکە، بەڵام وەزع‌و حاڵ لە وڵاتی ئێمەدا پێچەوانەیە. من ژیانێکی تەواو ئەمینانەو دوورە پەرێزم بۆ خۆم رێکخستووە. قەناعەت بە ژیانێکی ئاسایی دەکەم، چاوم لە دەستی کەس نیەو بە تەمای هیچ شتێك لە کەس نیم، جگە لە ئاسودەیی خەیاڵ هیچی ترم ناوێ، خەڵکی خۆشیان دەوێم، رێزم دەگرن‌و تەنانەت دزانیش تەماح لە ماڵەکەی من ناکەن‌و دزیم لێناکەن. لە هەموو روویەکەوە ئاسودەم‌و تەنیا گلەیی‌و نیگەرانیم لە یاساکانە. ئەوەی زیاتر ئازارم دەدات تورەییە، رقە. حەزدەکەم هەمیشە لە خۆشەویستیدا بژیم. رقم لە کەس نەبێ، کەس رقی لێم نەبێت. بەڵام نهو ناتوانم خۆم لە تورە بوون دووربگرم. نوێژی "ئەی بابی مە کە لە ئاسمانی"و مزمارەکانی ٣٧ دەخوێنم‌و کەمێك دڵم ئاسودە دەبێت، لێ دیسان مەنجەڵی رق‌و تورەیی لە دڵمدا دێتە کوڵ‌و جۆش‌و هێزی کارکردن‌و هـزرینم لە بەردەبڕێت. لە بەر ئارەزووی گەوجانەی تۆڵە ئەستاندن کارم وەلاوەناوەو چ

کەسێکیش نیە تۆڵەی بستێنم. جا ئێستا کە خۆم بۆ سەفەرو کۆچ ئامادە کردووەو بڕیاری جدیم لەمبارەیەوە داوە، هەست بە ئاسودەیی دەکەمو هیوادارم بە خۆما بێمەوە.

## بۆ ئا. ئا. تولستویا
## یاسنایا پولیانا ، ١٨٧٢/٩/١٩

دۆستی ئازیزم!

هەنووکە بە پەلە لەو گۆڕانکارییە چاوەڕوان نەکراوەی بەسەر مەسەلەی دادگاییەکەمدا هاتووەو نەخشەکانی منی بە تەواوەتی گۆڕیوە ، ئاگادارت دەکەمەوە. داوای بوردنت لێدەکەم کە بوومە مایەی ناڕەحەتی تۆ، ئیدی چ بکەم بە دەستی خۆم نەبوو. لە عەمراتم بە ئەندازەی ئەم مانگە عەزابم نەچەشتبوو، و ئیدی لەبەر خۆپەرستی خۆم کارێکم کرد کە هەمووان دەگەڵ مندا کەمێك غەزاب بچێژن.

پاش ئەوەی دەردەدڵی خۆم بۆ تۆ هەڵڕشتو بڕیاری سەفەرم دا ، هەستم بە ئاسودەیی کرد، جا ئێستا لەم کاتەدا نامەیەکم لە سەرۆکی دادگاوە پێگەییوە دەڵێت هەر هەموو ئەو ئیجرائاتەی بەرانبەر بە من کراوە، هەڵە بووەو لە ئێستا بە دواوە ئازادمو کەس ناڕەحەتم ناکات. جا ئێستا کە وای لێهات بۆ هیچ شوێنێك ناڕۆم، و تکام وایە بمبوری لەو ئەزیەتەی خستمە بەرت، وا چیرۆکی تەبریٔ بوونەکەی خۆمت بە درێژی بۆ دەگێڕمەوە.

کاتیٔ کە لە ئەسمارا بووم، گایەك شوانێك دەکوژێت. من کە لە ماڵەوە دەبم، بە مانگان کابرای پێشکارو خزمەتگوزارم نابینمو خۆم لە بەڕێوەبردنی موڵکەکان هەڵناقورتێنم، بە هەرحاڵ گەنجێك خۆی بە ماڵدا دەکاتو دەڵێت گوایە تەحقیقکارە. تەحقیق لە من دەکاتو دەپرسێت ئایا کوڕی شەرعیم یان نا ، دوای چەند پرسیارێکی دی دووپارتی دەکاتەوە کە بە کارێکی نا یاسایی تۆمەتبارمو ئەو کارە نایاسابییە کوشتنو مردنی کەسێکی لێکەوتووەتەوەو فەرمان دەدات بەڵێننامەیەك ئیمزا بکەم کە تا کۆتایی لێپرسینەوەکە لە یاسنایا پولیانا وەدەرنەکەوم.

پرسو جۆیەك دەکەم کە پێویست دەکات بەڵێننامەکە ئیمزا بکەم یان نا، دادپرس دەڵێت ئەگەر ئیمزای نەکەم زندانی دەکرێم. ئیمزای دەکەمو دەپرسم ئایا ئەم لێپرسینەوەیە زۆری پێدەچیٔ؟ بەرسڤم دەدەنەوە کە بە گوێرەی یاسا، دەبیٔ یاریدەدەری دادپرس لە زەرفی یەك هەفتەدا بە هەموو شتەکان ڕابگاتو کۆتایی پیٔ بێنیٔ. واتا یان شتەکە ئەرشیڤ بکات یان درێژە بە تاقیبەکە بدات، لە کاتێکا من دەزانم یەکێك لە ڕەعیەتەکانم ڕێك لەم هەفتەیەدا، چوار دانە ساڵی

خشته که چاوەڕوانی کۆتایی مەحکەمەیەکە، بۆ دەزانم بەم پێیە دادگاییەکەی منیش بە گوێرەی هەوەسی ئەوان ساڵێك تا دوو ساڵ دەخایەنێت. سێ هەفتە دەبورێ. منیش بە ئومێدی ئەمەی ئەگەر کێشەکەم تا یەك دوو هەفتەش کۆتایی نەیات، بێگومان لە عەرزی سێ هەفتەدا دوایی دێت، دەکەومە تاقیبی دۆسیەکەم. کارم گەییوەتە کوێ؟ کەچی نەك هەر دۆسیەکەم نەگەییوەتە هیچ کوێیەك، بەڵکو تازە لە دەستپێکدایە، دەپرسم کێ بەرپرسە لەوەی کە ئەمر بدات تاقیبەکە بەردەوام بێ یان ئەرشیف بکرێت، دەڵێن یاریدەدەری دادپرس کە گەنجێکی بیست ساڵانە. هەڵبەتە ئەگەر یاریدەدەری دادپرس– ش لە هەمان قوماشی تەحقیقکارەکە بێت، ئەوا بێ چەندو چون دەبێ چوار دانە مانگ لە زنداندا بخەوم. ئایا هیچ ئومێدێکی رزگار بوونم هەیە؟ دادگا دەبێت لەم بارەیەوە بڕیار بدات. بۆ نەگبەتی چونکە من خۆم قازی(حاکم) دادگای بەشم، لەو کاتەدا بۆ بەشداری لە دادگای ناوچەدا(بەش) بانگ کراوم. ئیدی ئەم مەسەلەیە دێتە پێشێ! بڕۆم یان نا؟ لە کێ بپرسم؟ موراجەعەی خودی سەرۆکی دادگا دەکەم. وەڵام دەداتەوە چاکتر وایە کە نەڕۆم.

نامەیەك بۆ دادگا دەنووسم کە ناتوانم بۆ دادگای ناوچە بڕۆم چونکە لە ژێر تاقیبو چاودێریدام. لە دادگادا یاریدەدەری دادسێن بە ڕاشکاوی ڕایدەگەیەنێت کە چونکە بە گوێرەی قانونی ١٤٤٦ بە کوشتن تۆمەتبارم – جا بزانە ئەم قسانە چەند ناخۆشە – بۆم نیە حاکمو قازی ناوچە بم. وێڕای ئەمەش دادگای ناوچە بە دانی بڕی ٢٢٥ ڕۆبڵ غەرامەم دەکاتو ناچارم دەکات بۆ ئەنجامدانی ئەرکی خۆم لە دادگادا ئامادە بم، دەنا دەخرێمە ژێر دادگا.

ناچار بە نامەیەك سەرۆکی دادگا ئاگادار دەکەمەوە، لە کاتێکا کە من لە ژێر تاقیبو چاودێریدام ئەگەر بۆ ئەنجامی ئەرکی خۆ لە دادگادا ئامادەبم دەبم بەگەپجارو ئەم دوو حاڵەتە بە هیچ جۆرێ تێکناکەنەوە. ئا ئەمەیە ئەو دادگایەی کە دەبێ من دادگایی بکات. ئەوەش بزانە لە مەسەلەی واریقاتی گایەکەدا کە نها بۆ لابردنی مەسئولیەت خراوەت ئەستۆی پێشکارەکەی من، ناشێت هیچ کەسێك تۆمەتبار بکرێت،و هەر تەحقیقکارێکی غەرەز لە دڵ دەتوانێ بە کەیفی دڵی خۆی هەرکەسێکی گەرەك بێ تۆمەتباری بکات. لە منەوە بیگرە، کە ئەوساکە لە سامارا بوومو هیچ دەستێکم لە بەڕێوەبردنی موڵکەکانم دا نەبووە تا دەگاتە تۆ کە بە فەرسەخان لە یاسنایا پولیاناوە دووریت. هەروەها ئەوەش بزانە کە من لە "تولا"دا نە کەس دەناسمو نە حەزم لێیە کەس بناسمو هەرگیز کەسم ناڕەحەت نەکردووەو خراپەم بۆ کەس نەبووە، تاقە داوام لە خەڵكو خوا ئەوەیە کە کاریان بە کارمەوە نەبێت. لە شەوەکییەوە تا بانگی شێوان مژولی کارمو حاڵی حازر خەریکی پێداچوونەوەی ئەو کتێبەمم کە لە ژێر چاپدایە(١). زۆر جاران لە خۆ دەپرسم ئایا بەڕاستی تاوانێکم کردووە؟ یان ئەقڵم لە دەست داوە؟ مرۆڤ ڕقی هەڵدەستێ، تورە دەبێتو دوای تورە بوونەکەی هەست بە شەرمەزاری دەکاتو لە ئەنجامدا تەرازووی تورەییەکەی لە جاران پتر سەر دەکات.

تازە تازە نامەم بۆ دەنووسن کە گوایە تەحقیقکارەکە هەڵەی کردووەو چ یاریدەدەری دادسێن و چ دادگا نەیانتوانیوە جگە لەوە چ ڕێچکە و ڕێگەیەکی دی بگرنە بەرو نها بەدحاڵی بوونەکە لاچووەو ئیدی ئەگەری وردە هەڵە دەرهەق بە هەرکەسێك هەیەو دەشێت بکرێ.

یەك مانگی ڕەبەق لە ژێر تاقیب و چاودێریدا بووم – هێشتاش بەردەوامە – ئەمە بە وردە هەڵە دەزانن، خۆ ئەگەر خۆم و شانسم ، یاریدەدەری دادسێن ئاگادار نەبوایەتەوە کە ناتوانن تۆمەتبارم بکەن، دادگاییان دەکردم و تا کۆتایی کارەکە بە ڕیشم پێدەکەنین. بەڵام تا ئەم ساتەوەختە بە فەرمی ئاگام لە هیچ ئەنجامێکی ئەسەح و تەواوەتی نیەو لەگینە هەمدیس راوبۆچوونی خۆیان بگۆڕن. بۆیە دەڵێم بڕیاری سەفەرەکەم گۆڕیوە چونکە لەگینە نەدرێمە دادگا. لە سەرەتای ئەم بویەرەدا لێبڕابووم هەرکاتێ بخوازن دادگاییم بکەن ولات بەجێ بێڵم. کاتێ کە نامەکەم بۆ تۆ نووسی سوور دەمزانی کە دادگاییم دەکەن. ئەم وردە هەڵانە، ئەم سەهوە بچووکانە، یەك دانە مانگ تەوقیفی خۆم و سێ دانە ساڵ حەپسکردنی یەکێك لە ڕەعیەتەکانم، چیرۆکی ئەو فەرماندارە زۆر دڵسۆزو جدیەم وەبیر دێنێتەوە کە بۆ دابینکردنی ئازوقەی خەڵکی و ئاوەدانکردنەوەی موڵکان بۆ هەموو موڵکداران، نیگابان و پاسەوانانی تایبەتی دامەزراند بوو، لێ ئەو پاسەوانانە لەبەر هەندێك کێماسی ناچیز کە لە هەر مرۆڤێکدا هەیە، هەڵدەستن لە بری پارێزگاری کردنی موڵکدارەکان، هەموویان دەکوژن. ئەمە بوو حاڵ و حیکایەتی کێشەکەی من. هەرچەندە هێشتا کێشەکان یەکلایی نەبوونەتەوەو بەڵێنی دەرنەچوون لە ماڵ هەڵنەوەشاوەتەوە،و هێشتا دەتوانن هەرجۆرە پەڵپ و بیانوویەکم لێبگرن، بەڵام لە نامەکەی سەرۆکی دادگادا وا بە دیاردەکەوێ کە بە تەمان وازم لێبێنن. ببوورە کە ناچار بووم بەم هەموو درێژدادڕییە وەختی تۆ بە فیڕۆ بدەم.

ئەمڕۆ بویەرێك هاتە پێشێ کە تەنانەت بەر لە گەییشتنی نامەکەی سەرۆکی دادگا ئاگری ڕقی دامرکاندمەوە. ئەم بەیانیە ژنەکەم تووشی تایەکی زۆر توندو سینگ یەشەیەکی ئەوتۆ بوو کە ئەگەری شێرپەنجەی مەمکی لێدەکرێ – ئێستا خەریکی شیردانە –و من لە پرێکا بۆ دەرکەوت وەرە مرۆڤ ئەو هەقەی نەبێ کە ئختیاری ژیان و بە تایبەتی خانەوادەکەی لە دەستا بێت، لەبەر ئەمە هێندەم هەست بە تووڕەیی و سوکایەتی کرد کە واریقاتی کوشتنی شوانەکەم منداڵانەو نابەجێ هاتە بەرچاوو کەوتمە گومانەوە دەربارەی هیجرەت بۆ ئینگلیستان. ژنەکەم نها حاڵی باشەو هیوادارم پێویستی بە نەشتەرگەری وەرەمی مەمك نەبێت. (ماشا)ی خوشکم چەند ڕۆژێك لەمە پێش بەجێی هێشتین. هەموو ڕۆژێك بە دنیایەك میهرو مەحەبەتەوە یادی دەکردیتەوەو ئەو گازاندەی لە خۆ دەکرد کە بۆچی نامەی بۆت نە نووسیوە، و من لۆمەی خۆم دەکرد بۆچی دەربارەی کێشەکەم نامەم بۆ نووسیوویت. تکاکارم بمبوری. دەستت ماچ دەکەم..

*ل. تولستوی.*

***پەراوێز:***

***١- مەبەست لە کتێبی (ئەلفبا)یە.***

## بۆ ئا. ئا. تولستویا
## یاسنایا پولیانا ، ٢٠-١٨٧٢/٩/٢١

دۆستی ئازیزم ئالکساندرین.

له نامەکەتا نووسیوتە: "ئایا قسەیەکم کردووە کە ئەزیەتی دابیت؟" سەرانسەری نامەکە(١)ت ئەم کارەی تێکردوومو شوکری یەزدان دەکەم کاتیٚ کە ئەم نامەیەم بە دەست گەیی تا ڕادەیەك ئارام بوو بوومەوە. هەڵبەتە تێگەییشتنو دەرککردنی وەزعی کەسێکی دی لە بەر رۆشنایی ئاوەزو لۆژیك مەحاڵە. بە تەمای ئەوەش نەبووم لە تۆ. بەڵام دەکرێت بە کۆمەکی دڵو لە ڕێگەی دڵەوە دەرکی بکەیتو لێی بگەیت. ئەمە ئەو شتە بوو کە لە تۆم چاوەڕوان دەکرد. مخابن بە هەڵەدا چوو بووم. من هەمیشە وام وێنا کردووە کە هەرکاتیٚ کەسێك بکەوێتە ناو مێروستانێکەوە پێویستە بەبیٚ لەقەفرتیٚو گریان، خۆی رزگاربکاتو خۆی لەوێندەر دەرباز بکات، بەڵام تۆ باوەڕت بەمە نیەو پێت وایە کە دەبیٚ شەهامەتو دلێریت هەبیٚو بە دوور لە خۆپەرستی،و بە گوێرەی بنەماو پرەنسیپێن مەسیح تەحەمولی هەرجۆرە رەنجو ئازارێك بکەیت. بەڵام بەڕاوبۆچوونی من شەهامەتو بوێری بۆ کاتێکە کە دژمنێك یان مەترسییەك لە ئارادا بیٚ، بەڵام لە هەر شوێنیٚ ئەگەر مەسەلە بێتە سەر دژایەتی درۆو نێرەنگو فەندەڵ فێڵان، دەبیٚ ڕاپەڕین بەرپا بکرێت، بە ڕاپەڕین درۆو نێرەنگان سەرکوت دەکرێت. جا بۆ ئەوەی مرۆڤ دەستەمۆی خۆپەرستی نەبێتو سوودی بۆ خەڵکی تر هەبێت، دەبیٚ بەر لە هەر شتێك خۆی لە رەنجدانو هەوڵو تەقەلای خۆڕایی رزگاربکاتو بۆ دەرچوون لە مێروستان چاکی هیمەتی لیٚ بکات بەلادا. بۆ ئەوەی بە گوێرەی رێنوێنیو بنەماکانی مەسیح ئەوەی خوا لە چارەی نووسیوین قەبولٚ بکەین، دەبیٚ بەر لە هەرشتێك توانای هەستکردنو هزرینمان هەبیٚ، بەڵام تا میرولەکان لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیان دابینو ئێشو نێشمان پێبگەیەنن، ناتوانین جگە لە رزگارکردنی خۆمان بیر لە هیچ شتێکی دیکە بکەینەوە. ئیدی ملدان بۆ ئێشو نێشی مێرووان کە سەراپامان چزئاژن بکەن، بە ناوی ئەوەوە کە تەقدیری خودایە، مەحاڵە. مەسەلەکە بە تەواوەتی بەندە بەوەوە چۆن بەدڵ نەك بە ئاوەزو لۆژیك دەڕوانینە مرۆڤێك کە — چ منداڵ بێتو چ گەورە — لە ناو مێرووستانێکدا لەقەفرتیٚ دەکات. ئەم دیمەنە بەلای خەڵکانێکەوە کۆمیدی یان مەخسەرەئامێزو گەوجانە دێتە بەرچاو، و بەلای خەڵکانێکی ترەوە تراجیدیو تانە ئامێزە. من ئەمە دەسەلمێنم کە زۆر کەسێن پایە بەرزو ئابڕومەندو سەنگینو بە ئیحتوبار لەوەیە بەبیٚ ئەوەی هیچ گوناهو خەتایەکیان کردبێت مل بۆ شەلاخ خواردن بدەنو تاقە نیگەرانیان ئەوە بیٚ کە نەبادا لە کاتی شەلاخ خواردنەکەدا کەسێك دیتبنی. ئەم جۆرە کەسانە سەرنجم رادەکێشن، بەڵام بە هیچ جۆریٚ هەستو سۆزی بەزەییم لەلا ناجوڵێنن. کەسانێکی تر هەن کە هەموو شتێك لە ڕای پاراستنی سەنگو قەدرو کەسایەتیو ئابڕوی خۆیان بەخت دەکەنو بەلای ئەوانەوە بچووکترین تانەو

سوکایەتی مایەی ڕەنج و ئازاری بەدەنیە. من بەزەییم بەمجۆرە کەسەدا دێتەوە. تەنیا ئەوەندە بەس بوو تۆ لەوە بگەی کە ئەو ڕق و توڕەییەی بەسەر دڵما زاڵ بوو، و نێڵی دەدام، زادەو هەڵقوڵاوی ئیرادەو دەسەڵاتی خودی من نەبوو، بەڵکو ئەنجامی ئاسایی هەستم بوو. ڕێك وەکو ئەو ئاوسان و ئازارەی کە لە چزی زەرگەتەیەکەوە چێدەبێت. تەنیا یەك شتت باس نەکردووە، بەڵام من بە خۆم باسی دەکەم، یانی نازانم بۆچی ئەم مەسەلەیەم بۆ تۆ گێڕایەوە؟ کاتێ وەبیرم دێتەوە بۆ ئەوە دەربارەی ئەم مەسەلەیە نامەم بۆ تۆ نووسی – ئێستا مەسەلەکەم تەواو لەلا ڕوونە – کە واریقات و بەسەرهاتەکەی من لە دەوروبەری خۆتا ئاشکرا بکەیت لە تەریقیدا سوور دەبمەوە ، بە تایبەتی کاتێ کە بیر لە بەرسڤەکەی تۆ دەکەمەوە. زۆر بە داخەوەم کە بوومە مایەی زەحمەت و ناڕەحەتی تۆ. دڵنیابە جارێکی دیکە ئەم جۆرە هەڵانە دووبارە نابنەوە. لەم کاتانەدا لە جاران پتر باوەڕم وایە کە باشترین کار بۆ مرۆڤێکی ڕاستەقینەو پابەندی ئابڕومەندی و حەقیقەت، هەوڵدانە بۆ ڕزگاربوون لەم دەریای خۆپەرستی و خۆسەری و درۆو دەلەسەیەی کە لە هەر چوار نکالەوە دەوری دوڕگەی بچووکی ژیانی ئابڕومەندانەو پڕ چالاکی و چەلەنگی ئەوی گرتووەو لە ناچاریدا هیچ چارەیەکی نیە جگە لەوەی ڕێگەی ئینگلیستان بگرێتەبەر، چونکە تەنیا لەوێندەر ژیانی، ئاسودەیی و ئازادیی ئەمینەو هیچ دەستدرێژییەکی ناکرێتە سەر.

خودا حافیز! دەستت ماچ دەکەم، تکات لێدەکەم بمبورە کە عەزیەتم داویت، ناڕەحەتم کردویت!

***پەراوێز:***

***١- تولستوی لە نامەکەیدا باسی مەسەلەی گایەکەی کردبوو.***

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

## یاسنایا پولیانا، ١٨٧٢/١٠/٢٦

**دۆستی ئازیزم ئالکساندرین**

کاتێ کە مژولی نامە نووسین بووم بۆ تۆ – بە تایبەتی لەو کاتەدا کە خەریك بووم دوا نامەم بۆ تۆ دەنارد– هەستم دەکرد کارێکی نابەجێم کردووەو پاشان کە نامەکەی تۆم وەرگرت، سەرم لە خۆ سوڕما کە چۆن ڕێگەم بە خۆ دابوو نامەیەکی وەهات بۆ بنووسم. لە کانگای دڵمەوە هیوادارم بمبوری لەوەی کە ئەزیەتی ڕوحم داویت.

به تەما بووم نامەیەکی درێژت بۆ بنووسم، لێ بەر لەوەی لە مۆسکۆ بەڕێ بکەوم، کۆمەڵێك نامەی زۆرم نووسی و ئێستا هەستدەکەم ناتوانم ئەوەی لە دڵمدایە بۆتی بنووسم، بۆیە با بمێنێ بۆ کاتێکی دی. جارێ ئەم نامەیە بۆ سوکنایی وێژدانم دەنێرم و دەستت ماچ دەکەم.

***دڵسۆزتان***

***ل. تولستوی***

سەبارەت بە مەسەلەی گایەکە لێت پرسی بووم چۆن بوو کە کابرای تەحقیقکار دانی بەوەدا نا کە گوایە سەبارەت بە تۆمەتبارکردنی تۆ هەڵەی کردووە، هەروەها لەوەشدا هەڵە بووە کە بەڵێننامەی پێ ئیمزا کردووم کە لە ماڵ نەچمە دەرێ، هەروەها ئەوانەیش کە سزایان بۆ من دانابوو هەڵەیان کردووە، بەشێوەیەکی گشتی دەشێت بگوترێ دەروستکردنی ئەو دۆسییەیە هەڵەیەکی گەورە بووە، چونکە بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە تاوانێك روویداوە، پاش چاوپۆشی لە من دەستیان بە تۆمەتبارکردنی پێشکارەکەی من کردووە، کەچی ئێستا وەکو رۆژی روناك خویایە(دیارە) هیچ کەمتەرخەمو خەتاباریێك لە ئارادا نیە، بۆیە ناشێت پێشکارەکەش تۆمەتبار بکرێت. جا بۆ ئەوەی کەمێك خۆم تەبرێ و پاك کردبێتەوە، دڵنیات دەکەم کە لەم دواییانەدا پاش تەواو بوونی کتێبی "ئەلفبا" دەستم بە نووسینی ئەو بەرهەمە درێژە – حەزناکەم ناوی چیرۆکی لێبنەم– کردووە کە ماوەیەك بوو خەوم پێوە دەبینی(١)، پوشکین گوتەنی کاتێ کە شەوقی نووسەرایەتی لە دڵماندا جۆش دەسەنێ، هەستیاری خۆمان لەمەڕ تورەهاتەکانی ژیان لە دەست دەدەین. تۆ پیاوێك بێنە بەرچاوی خۆت کە لەوپەڕی ئاسودەیی و لە ناو جەرگەی تاریکی دا گوێی لە هەنبەر هەر دەنگێکدا هەستیار بێ و کەمترین دەنگ، بچووکترین سرتەو ورتە سەرنجی رابکێشێت، لە پڕ هەست بکات لەبەر لوتیا تەرەقەیەك بتەقێننەوە یان مارشێکی سوپایی بە تۆنی فەرەنگی لێبدەن، باوەڕبکە ئازارێکی لەو جۆرەم تەحەمول دەکرد. ئێستا ئەم مۆتەکەیەم لە کۆڵ بووەتەوەو جارێکی دی دەتوانم لە تەناهی و لە نێو تاریکیدا بە خەیاڵی ئاسوودەوە گوێ هەڵخەم، ببیەم، چاو بگێڕم، بدینم، ئەمە لەزەتێکی گەورەیە. بەڵام وادیارە لە ڕادە بەدەر جڵەوم بۆ قەڵەم شۆڕ کردووە. تۆ نێوەڕۆك و بابەتی ئەم نامەیەی منت دیاریکردووە، چونکە داوات کردووە باسی منداڵەکانمت بۆ بکەم، بەسەر چاو، فەرموو ئەمەش داوایەکەت:

کوڕە نۆبەرەکەم قژ زەردە. کەسێکی زبر نیە. کەمێك لاوازە، بەڵام بەردەبارو لە هەڵس و کەوتیا نەرم و نیانە. کە پێدەکەنێ پێکەنینەکەی گیرۆ نیە، بەڵام گاڤێ کە دەگری، من بە ئەستەم دەتوانم جڵەوی فرمێسکانم بگرم و نەگریم. هەموو کەسێك دەڵێت لە برا گەورەکەم دەچێت. خەسێت و سوخەتی سەرەکی برایەکەم خۆپەرستی یان لە خۆبوردەیی نەبوو، بەڵکو میانڕەوی بوو لە هەموو شتێکدا. ڕاستە فیداکاری بۆ هیچ کەسێك نەدەکرد، بەڵام لە هەمان کاتیشدا نەك هەر خراپەی دەرهەق بە کەس نەکردبوو، بەڵکو هیچ کەسێکی بە ئاستەمیش زویرو ناڕەحەت نەکردبوو. لەزەت و خەمێن ژیانی بۆ خۆی هەڵدەگرت.

سیرزا، کوڕی دووەمم بە هۆش و گۆشە. زەینێکی ماتماتیکەوانی هەیە،و لە هەنبەر هونەردا یەجگار هەستیارە. زۆر باش دەخوێنیّ، لە بازبازێن و وەرزشدا لێهاتووەو بەهرەی هەیە، لیّ بڕێك گێژو کەمێك لە ئەنجامدانی کاراندا سست و خاوە. خەسڵەتێکی تایبەتی و مایەی سەرنجی نیە، خوو و تەبیعەتی لە کاتی ساغی و سەلامەتیدا فرە جیاوازە وەك لە کاتی نەخۆشیدا.

ئیلیا، کوڕی سێیەممە. هەرگیز نەخۆش نەکەوتووە. ئێسقانی ئەستوورە. دەمو چاوێکی شەنگوڵ و روون و گەش و بەڕەنگ و رووی هەیە. لە خوێندندا باش نییە، کەیفی لە خوێندن نیە، هەمیشە بیر لەو شتە دەکاتەوە کە پێی دەگوتریّ بیری لێنەکاتەوە. بە خۆی یاریەکانی دادێنیّ. کەسێکی بەزاکون و وردە. زۆر بایەخ بە خوی دەدات. زیتەڵ و لەزگین و شەڕانیە، هەمیشە ئامادەی هێرش و پەلامارە، بەڵام لە هەمان کاتدا بەسۆزو دلۆڤان و یەجگار هەستیارە. حەزی لە خۆشگوزەرانییە. حەزدەکات خۆش بخوات و باش بخەوێت. کاتیّ کە مرەبای گێلاس یان سوپی جۆ دەخوات ملچەملچی دەم و دانی زۆر بەرزە. هەموو کارەکانی جوان و مایەی سەرنجن. کاتیّ کە دەگری توڕەو گرژو مۆن دەبێت. لیّ کە پێدەکەنیّ هەمووان دێنێتە پێکەنین. هەر شتێك قەدەغە بێت زیاتر مەیلی بەلایدا دەچێت و حەزی لێدەکات. زوو سەر لە هەرشتێك دەردەکات. بە منداڵی بۆی دەرکەوتبوو کە ژنەکەم لە کاتی سکپڕیدا هەست بە جوڵەی منداڵەکەی ناو سکی دەکات. ئیدی تا ماوەیەکی دوورو درێژ گەمەو یاری دڵخوازی ئەوە بوو کە شتێکی خڕی دەخستە ژێر چاکەتەکەیەوەو بە سۆزێکی تایبەتیەوە دەکەوتە نەوازشت و لاوانەوەی و بەدەم زەردەخەنەوە دەیگوت: "منداڵە!" هەروەها دەستی بەسەر قۆقزی سپرینگە دەرپەڕیوەکانی قەنەفەکاندا دێناو دەیگوت: "منداڵە" ماوەیەك لەمە پێش کاتیّ کە مژول و سەرقاڵی نووسینی چیرۆکی "ئەلفبا"یەکەم بووم، ئەویش بە پێی زەوقی خۆی چیرۆکێکی داهێنا: "رۆژیّ کوڕێك پرسیاری کرد: ئایا خودا ڕیّ دەکات؟ خودا سزای داو ئیدی کوڕە بە درێژایی تەمەنی ناچاری رێکردن بوو".

ئەگەر من بمرم کوڕە گەورەکەم لە هەر شوێنیّ بیّ پەکی ناکەوێت و خۆی دەپەڕێنێتەوە، و دڵنیام لە فێرگەدا یەکەم دەبێت. بە پێچەوانەوەی ئیلیاوە، ئەگەر رێنوێنێکی جدی و دڵسۆزی نەبێت تیا دەچێت. ئەم هاوینە چووین بۆ دەریا، سیرزا سواری ئەسپ بوو و من ئیلیام خستبووە تەرکی خۆم. بەرەبەیان لە ماڵ وەدەرکەوتم. ئیلیا بە کڵاوو خاولییەوە ئامادەو روو بە پێکەنین چاوەڕوانم بوو. سیرزا بە هانکە هانك و بە سەری کۆت هات، من لێی توڕە بووم: "بڕۆ کڵاوێك پەیدا بکە دەنا لەگەڵ خۆمت نابەم". سیرزا بەغار رۆیی سەری بەم کون و بەو کەلەبەردا کرد، لیّ کڵاوی نەدۆزییەوە. لێم دووبارە کردەوە: "هیچ چارێکت نیە هەڕە کڵاوێك بدۆزەوە، دەنا لەگەڵ خۆمت نابەم، با ئەمەت بۆ ببیّ بە پەندو عیبرەت، چونکە دایمە شتێك گوم دەکەی". لەگەڵ ئیلیادا کەوتمە ریّ و چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد کە هاوسۆزییەك دەگەڵ برایەکەیدا بکات، لیّ هیچ کاردانەوەیەکی نەنواند، شادو بە کەیف و دەم بە پێکەنین باسی ئەسپی دەکرد. ژنەکەم لەم کاتەدا تەمەشای سیرزا دەکات کە زۆر زۆر دەگری. دەکەوێتە تاقیبی کڵاوەکە، لیّ نایدۆزێتەوە. وا وێنا دەکات برایەکەی کە سپێدە زوو بۆ راوە ماسی چوو بوو، بە هەڵە کڵاوەکەی "سیرزا"ی

لەسـەر کـردووە، کورتـە نامەیـەك بـۆ مـن دەنووسـێت بـەم ناوەڕۆکـەی کـە پێدەچێت سـیرزا هـیچ خەتایەکی نەبێت لە ونکردنی کڵاوەکەیدا، کاسکێتێکی لەسـەر دەنێـت و بـۆ دەف مـنی دەنێرێت. لە ناکاو لە سەر شۆستە بەرزەکـەی کـەنار کابینەکـەوە گـوێم لـە دەنگـی پـێ دەبـێ کـە بـە هەشـتاو دێتە پێشێ. سیرزایە کە بە غار بە دووماندا دێت – تومەز لە ڕێگە کورتە نامەکەی ژنەکـەمی گـوم کرد بوو– هەنگێ هۆن هۆن دەست بە گریان دەکات. ئیلیاش دەگری و چەند دڵۆپـە رونـدکێکیش لە چاوی من دێتە خوارێ.

تانیا، هەشت ساڵانە، هەمووان دەڵێن لە سۆنیا دەچێت، منیش پێموایە لەو دەچێت، نـەك لەبـەر ئەوەی حەز دەکەم وابێ و ئەگەر وابێ شتێکی خۆشە، بەڵکو ئـەم لێکچوونە یـەجگار زەق و دیـارە. خـۆ ئەگـەر تاقانـە بوایـەو منداڵـە چـکۆلەکانین دی نەبوایـەن هـەرگیز ڕووی شـادمانی و خۆشـی بەخۆوە نەدەبینی، چونکە گەورەترین کەیف و شادمانی ئەو ئەمەیـە کـە دەگـەڵ منـداڵانی بچوکترا تێکەڵ بێت و یاری بکات. هەڵبەتە گومان لەوەدا نیە زۆری پێخۆشە کە گەمە بە بوکەڵەیـەك بکـات، دەستی لێبدات، لەزەتێکی بەدەنی زۆر لەوە وەردەگرێت. هەموو کەس دەزانن کـە خـەون و ئـاواتی ئـەو هـەبوونی منـداڵانی زۆرە. چـەند ڕۆژێـك لەمـەوپێش بـۆ وێنـەگرتن بـۆ "تـولا"مـان بـرد. زۆری لێدەکردم چەقۆ بۆ سیرزاو شتی دیکە بۆ ئەوانی دی بکڕم. دەزانێت هەر کەسەیان حەزی لە چیە. هیچم بۆ خـۆی نـەکڕی و بـۆ تاقە سـاتێکیش لـە خـەمی خۆیدا نـەبوو، پێم گوت: "تانیـا بـۆ مـاڵ بگەڕێینـەوە. وەخـتی خـەوت هـاتووە!" گـوتی: نـە، نامـەوێ بنـووم. لـێم پرسـی: "بـیر لـە چـی دەکەیتەوە؟" وتی: "بیر لـەوە دەکەمـەوە کـە گەییشتینە ماڵـەوە لـە دایکـە دەپرسـم ئایـا ئیلیـا ژێـر بووەتەوە یان نا،و پاشان هەر یەکەو دیاریی خۆی دەدەمێ و لە سیمای سیرزا ورد دەبمەوە کـە وا دەنـوێنێ زۆر ڕازی نیـە، بـەڵام لـە نـاخی دڵـدا یـەجگار خۆشـحاڵە." زۆر هۆشمەنـد نیـە، لـێ میکانیزمی زەینی باشە، و ئەگەر خودا مێردێکی بە نسیب بکات، دەبێتە هاوسەرێکی بێ وێنە،و من ئامادەم دیارییەکی جوان بەو کەسە بدەم کە بیگۆڕێت بۆ ژنێکی نوێخوازو ئازادیخواز.

منداڵی چوارەمم "لیـڤ"ی نـاوە. منـداڵێکی جـوان و زیتەڵـە، هـۆش و گۆشـێکی باشـی هەیـە. هـەر جلـێ لەبـەر دەکـات دەڵێـی بـە بـاڵای خـۆی بـڕاوە. زۆر لێهاتوانـە لاسـایی کـاری هـەر کەسـێك دەکاتـەوەو بـە زەبەردەسـتی ئـەنجامی دەدات. ڕسـتەی "تێناگـەم" زۆر بـەکار دێـنێ،و هەمیشـە بەسەر زارییەوەیە.

پێنجـەمین منـداڵم ماسـایە. ئـەو کیژەیـە کـە خـەریك بـوو ببێتـە مایـەی مردنـی سـونیا. کچێکی لاوازی لەشـبەبارە. جەسـتەیەکی لاوازی سـپی وەکـو چـوڕی شـیری هەیـە، قـژی زەردو چـاوانی درشـت و پیرۆزەیـین، کـە دەگـەڵ نیگـا قـوڵ و زۆر جدییـەکانی دا یـەجگار گونجـاوو جوانـە. زۆر زرینگ و بە هۆشە، لێ جوان نیە. کەسایەتیەکی مەندو ئاڵۆزی هەیـە، هەمیشـە عـەوداڵی شـتێکەو لە هەوڵ و تەقەلای بە دەست هێنانیەتی و هیچ نادۆزێتەوە. وێڕای ئەمەش کۆڵ نادات و لە هەوڵ و تەقەلای خۆی ناکەوێت کە بگات بە ئامانج.

شەشـەمین منـداڵم پتروسـە. منـداڵێکی بـە دارو بـارە، دەم و دووی یـەجگار جوانـە. هەمیشـە ئانیشکەکانی لـە جوڵـەدان و لـە تـۆ وایـە پـەلاماری شـتێك دەدات. ژنەکـەم کـاتێ کـە ئـەو لـە ئـامێز

دەگرێت، سۆزو خۆشەویستییەکی گەرمو گوڕی لە لا چێدەبێت. بەڵام من هەست بە هیچ ناکەم. دەزانم وزەی بەدەنی یەجگار زۆرە، بەڵام نازانم ئاخۆ لەبەر ئەمە پێویستە پتر چاودێری بکەین یان نا. بۆیە من منداڵی ساوام، یانی منداڵی پێش دوو یان سێ ساڵیم خۆش نەگەرەکەو لێیان حاڵی نابم. ئایا تا ئێستا تۆم لەو خاڵەی کە هەمیشە دیتوومە ئاگادار کردووەتەوە؟ من خەڵکی بەسەر دوو دەستەدا دابەش دەکەم: ڕاوچیانو نا ڕاوچیان. نا ڕاوچیان منداڵانی زۆر بچووك، یانی ساوایانو نەوزادان- یان خۆش دەویو بەکامی دڵ لە ئامێزیان دەگرن، کەچی ڕاوچیان لە هەنبەر منداڵێکی نەوزادا هەست بە ترسو ناڕەحەتی دەکەن. هیچ ریزپەڕێك لەم یاسایەدا نابینم. تۆ بە خۆت حەقیقەتی ئەو یاسایە لە نك ناسیاوانی خۆت تاقی بکەوە.

***پەراوێز:***

1- *مەبەست کتێبی دەورانی پوتروسی گەورەیە.*

## بۆ ئا. ئا. فت

## یاسنایا پولیانا، ١٨٧٣/١/٣٠

چەند رۆژێکە کە نامە ئازیزو غەمگینەکەی تۆم وەرگرتووەو تازە بە تازە دەستم بە وەڵامدانەوەی کردووە. بەڵێ، غەم لە سەرانسەری نامەکەت دەبارێت، چونکە تۆ نووسیوتە تونچف لە مردندایەو پێی بە لێوار قەبرەوەیەو بە گوێرەی هەندێ دەنگۆو مقۆمقۆش تورگینیف- ش مردووەو دەربارەی خۆتانیش دووپاتی دەکەیتەوە کە مەکینەکە خەریکە لە کاردەکەوێتو بە نیازی بیر لە ئاسودەیی و بەختەوەری ئەبەدی بکەیتەوە. بە ئەرك نەبێ بە زووترین کات ئاگادارم بکەوە کە هەر هەموو ئەم هەواڵانە نا دروستو بێ بنجو بناوانن. هیوادارم بەڕاستی بێ بنجو بناوان بن، وادیارە تۆ تەنیا لە دووری ماریا پتردونا، وردە نیشانەکانت بەسەر هەڵدانەوەی نەخۆشییە ترسناکەکەی خۆت زانیوە. نابێ لە "بەختەوەری ئەبەدی" دڵگران بینو نە بە گاڵتەشی بگرین، چونکە زۆر لە ژیان زیاتر بۆ ئێمەمانان، بۆ هەموومان - بەلای کەمەوە من بە خۆم هەستی پێدەکەم- بایەخی هەیە. لێ تا زیاتر لە مبارەیەوە بیردەکەمەوە کەمتر قەناعەت دێنم کە ئەم "بەختەوەرییە ئەبەدییە" جگە لە "هیچ" شتێکی تر نیە، من قەناعەتم وایە کە دەبێ

تەشریفاتی مەزەبی رەچاو بکرێ،و خۆ لە "بەختەوەری ئەبەدی" دووربگرین. بە پارێزەوە مامەڵە دەگەڵ "بەختەوەری ئەبەدی" بکرێت.
بە هەرحاڵ هیچ شتێك لە ڕەچاوکردنی ئەم تەشریفاتو سرووتانە گرنگتر نیە. مەبەستم لە ڕەچاو کردنی تەشریفاتو ئەتەکێتی مەزەبی چیە؟ ئێستا نموونەیەکت بۆ دێنمەوە: لەم دواییانەدا چوو بووم بۆ دیدەنی برایەکەم، کوڕە منداڵەکەی مردبوو، و دەیانویست بە خاکی بسپێرن. کەشیشان گەیینە جێ، تابوتێکی چکۆلەو هەموو شتێکی دیکەی پێویستیان لەگەڵ خۆدا هێنا. براکەمو من خۆم دەربارەی بێهودەیی تەشریفاتی مەزەبی هاورەئی تۆین، بۆیە هەرکە یەکترمان بینی بێزاری و بێتاقەتی خۆمان سەبارەت بەم رۆتینیاتە دەربڕی، لێ دوای تۆزێك لە دڵی خۆدا گوتم: باشە ئەگەر ئەم تەشریفاتو ئەتەکێتە نەبوایە براکەم جەنازەی منداڵەکەی چۆن لە ماڵ دەبردە دەرێ؟ دەیخستە ناو گونیەکەوەو بە گالیسکە دەیبرد؟ گالیسکەچی لە کوێ دەست دەکەوت؟ لە کوێ دەیناشت،و بە شێوەیەکی گشتی چۆن هەموو کارەکانی رێکدەخست؟ ئایا جگە لە خوێندنی دوعاو نوێژی مردوو و داگیرساندنی بخوردو داری عود رێگەیەکی باشتر دەبوو؟ – بەلای کەمەوە بە بۆچوونی من باشترین رێگەیە – چۆن دەبێ لە ناو جێدا بمریو بۆگەن بکەیت؟ ئایا ئەوەندە بەسە کە جێگەکە بشۆیت؟ نەخێر بە هیچ جۆرێ شتی وا نابێت. بۆیە سەبارەت بەم پێشهاتە حەتمیەی ژیانی هەر مرۆڤێك، ڕەچاو کردنی تەشریفاتی مەزەبی زەرورەتو بایەخی خۆی هەیە.
منیش هیچ شتێك لە ژینگەی مەزەبی، بۆ هەموو قۆناغەکانی ژیانو گەشەکردنو پەروەردە بوون، بە گونجاوتر نازانم. جا ئەم قسانە بە زمانی سلاڤی بەلای کەمەوە بۆ من هەمان ئەو جەزمەو حاڵە فەلسەفیە دێنێتە ئاراوە کە لە سۆفیان دێت لە گەرمەی زیکرو فکریان دەربارەی نێرڤانا. مەزەب تەنیا لەبەر ئەمەی کە بە درێژایی هەزاران ساڵی بەردەوام ئەم خزمەتەی بە ملیونان کەس کردووە، شایستەی ستایشە، چونکە ئەمە خۆی لە خۆیدا، بە بۆچوونی من خزمەتێکی گەورەیە. لێ ئەنجامدانی ئەم خزمەتە چەند دەگەڵ لوژیکدا تێك دەکاتەوە؟ بە رواڵەت جۆرە گەوجێتییەکە، بەلام لە نێوان ملیاردان گەوجێتیدا تاقە گەوجێتییەکە کە بەرێك دەدات، بۆیە ناکرێت بە بێهودەیی دابنرێت.
تەنیا بۆ تۆ جورئەتی نووسینی ئەم جۆرە نامانەم هەیە. حەزم لێ بوو نامەت بۆ بنووسم، چونکە لەوەتای نامەکەی تۆم پێ گەییوە هەست بە خەمباری دەکەم. بێزەحمەت تا زووە باسی حاڵی خۆتم بۆ بنووسە.

*دڵسۆزتان*

*لیڤ. تولستوی*

نامەکەم بێ سەروبەرە چونکە پەستو توڕەم. ئەو کارەی کە دەستم داوەتێ(١) بێ ئەندازە قورسە. پێشەکیو موتاڵاو خوێندنەوە لە کۆتایی نایەتو نەخشەی کارەکە ڕۆژ بە ڕۆژ بەرینتر دەبێو لە سنووری توانای من دەردەچێت. ڕۆژێك باشمو سێ ڕۆژ نەخۆشم.

***پەراوێز:***

***١- مەبەست لە چیرۆکی پوتروسی گەورەیە.***

## بۆ ن. ن. ئوستراخوف
## یاسنایا پولیانا، ١٨٧٣/٥/١١

**دۆستی ئازیزم نیکولای نیکولایوڤیچ!**

**هەردوو نامەکەتم پێکەوە وەرگرت. نامەی یەکەم کە زۆر جوانو پڕ جۆش بوو لە قرمەوەو دووەم کە بڕۆکەیەك خەمناك بوو لە پترسبۆرگەوە نێردرابوون. کە ویستم وەڵامی هەردووکیان بدەمەوە، وەکو ئەو گوێدرێژەم لێهات کە لە نێوان دوو گیشە وێنجەدا دوو دڵ مابوو لە کامیانەوە دەست بە لەوەڕین بکات. ئاه! چەندم حەز لێبوو بە زووترین کات وەڵامی ئەو نامەیەیانت بدەمەوە کە لە قرمەوە ناردبووت! باوەڕبکە چ هەڵە بم و چ راست، وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە کە ئایا بەڕاستی چاکی جەوهەرو کرۆکی ژیانە یان نا، بەهەمان ئەندازە ئاسانە کە بڵێم ئەمڕۆ فلان رۆژی مانگە. ئەوەندە ئاسانە وەکو ئاو خواردنەوەیە بەلامەوە. هەڵبەتە من یەك لە باری خۆم دەتوانم بەروونیو ڕەوانی بەرسڤ بدەمەوە، بەلام ئایا لای خەڵکانی دیکەش مەفهومو روون دەبێت؟ جا بۆ ئەوەی بۆچوونی کەسێکی دیکەش لەمبارەیەوە روونو مەفهوم بێ، پێویست دەکات لەمەڕ مانای بابەتەکە هاو بیروبۆچوونی من بێت. مرۆڤ ناتوانێ هێمو بنەمای راستەقینەو مەتریالی ژیان نە دەرك بکاتو نە پیشانی بدات. هێمو بناغەی ژیان. واتا ئەوەی دەبێتە مایەی ژیان، زەرورەتو پێویستییەکە کە ئێمە بە هەڵە ناوی چاکەی لێ دەنەین. چاکی تەنیا دژی خراپەیەو هیچی تر. میناکی روناکی کە دژی تاریکییە، وەکو چۆن روناکیو تاریکی ڕەها نیە، بە ئاوایە چاکی یان خراپی ڕەهاش نیە. ئەمە جگە لەوەی چاکی تەنیا مادەیەکە، کەرەسەیەکە کە جوانی لێدروست دەکرێت، یانی ئەو شتەی بێ هیچ جۆرە هۆیەك یان زەرورەتو پێویستیو سوودو فایدەیەك حەزی لێدەکەین، خۆشمان دەوێ. بۆیە پێموایە لە جیاتی چەمکی چاکە کە چەمکێکی رێژەییە، چەمکی جوانی دابنرێت. تێکرای ئاینو مەزەبان کە دیاریکردنی بناغەو بنەمای ژیانیان بە کارو ئەرکی خۆ داناوە، لەسەر بنەماو پایەی جوانی رۆنراون. یونانیان جوانی بەدەنو مەسیحیان جوانی مەعنەویان کردووە بە بنەماو بناغەی خۆ. ئەمەی ئەگەر کەسێك زللەیەکی لەم رووەتت دا، رووەمەتەکەی ترتی بۆ رابگرە با لەویش بدات، نە کارێکی ئاقڵانەیە نە چاکەشە، بەڵکو کارێکی گەوجانەیە، بەلام جوانە وەکو جۆبیتەری جوان کە روناکی لە ئاسمانەوە**

پـەخش دەكاتـەوە، هـەركاتێ بخـوازن ئـەو شـتەی كـە بـە مانـای جـوانی بەرجەسـتە دەبێـتو دەردەكەوێ، بخەنە تای تەرازووی هەڵسەنگاندنە وەو باسـی زەرورەتـی پێشكەشـكردنی قوربـانی لەبەر دەرگای جۆبیتەرو چۆنیەتی خزمـەتكردنو یـان پـەپڕەوكردنی بكـەن،و یـان ئـەنجامگیری لـە چۆنیەتی عیبـادەتو دان پێدانان لـە دنیـای مەسـیحەت بكـەن، ئیـدی هـیچ شـوێنەوارێكی جـوانی نامێنێ،و ئەوسا هیچ پێوەرو محەكێك بۆ دیاریكردنی چاكەو خراپە نابێت. دەزانم دەڵێیـت وڕینـە دەنووسمو هیچ لە قسەكانم تێناگەیت، بەڵام وێڕای ئەوەش حەزم لێیە لەمبارەیەوە قسـەت لەگـەڵ بكەم. سەرقاڵی نووسینی چیرۆكێكم(١) كە هیچ جۆرە پەیوەندییـەكی بـە پوترسـی گـەورەوە نیـە. نزیكەی یەك دانە مانگە پێوەی مژولمو كاری لەسەر دەكەمو رەشنووسـەكەیم تـەواو كـردووە. ئـەم چـیرۆكە كـە یەكـەمین تاقیكردنـەوەی چـیرۆكی واقیعـی منـە، بـە تـەواوەتی بـاڵی بەسـەر رۆحمـا كێشـاوەو تـا تـەوقی سـەرم تیایـدا نقـوم بـوومو لەگـەڵ هـەموو ئەمەشـدا حـەزم لێیـە لـە بـەهاری ئەمساڵدا وەكو جاران خەریكی مەسەلە فەلسەفیەكان ببم.

لە نامەیەكی تردا كە بۆم نە ناردویت باسی ئەم چیرۆكەم بۆ كردوویت،وباسی ئەوەم بۆ كردوویت كە چۆن خوێندنەوەی دووبارەی (كـاری خـوایی)یەكـەی پوشـكین ئیلـهامی پـێ بەخشـیوم. هێشـتا دەستم بە هەڵەچنو راستكردنەوەی شەڕو ئاشتی نەكردووە. بە نیازم هـەموو شـتە زیـادەو كۆپلـە فەرەنسییەكانی لێ لابـەم،و حەزدەكـەم رەئـی تـۆ لەمبارەیـەوە بـزانم. ئایـا كـە لـەو كارانـە بوومـەوە دەتوانم بۆ تۆی بنێرم كە پێیدا بچیتەوە(٢)؟

بێزەحمـەت باسـی ئـەو كـارەی كـە بـە دەسـتمەوەیە بـۆ كـەس مەكـە. لەوەیـە لـە كۆتـایی مـانگی مایسـدا بـۆ سـامارا بـڕۆین. هـەموو مـاڵو منـداڵو ئەنـدامانی خانەوادەكـەم سـاغو سـەلامەتنو سڵاویان بۆت هەیـە. لـە بیسـتی هـەیڤی پێـنج بـە دواوە ئەدرەسـم سـامارا دەبێـت، تكایـە لـە بیرم مەكە. لە دەشتی سامارادا، نامەی تۆ ئازیزترو لەزەتی خوێندنەوەی بۆ من زیاتر دەبێت.

***پەراوێز:***

١- *مەبەست لە رۆمانی ئاناكارنینایە.*

٢- *ئوستراخۆف بەمجۆرە وەڵامی تولستوی داوەتـەوە: "نـەك هـەر دەتـوانی بینێریـت بەڵكو تكات لێدەكەم بینێرە. بەڕاستی ئەوە بۆ من دەكاتە بەختەوەرییەكی گەورە."*

## بۆ ت. ئا. کوزمسینکایا
## یاسنایا پولیانا ، ١٨٧٣/٥/١٨

**تانیای ئازیزم!**

دەزانی خەبەری مردنی داشای(١) جوان‌و ئازیزو نازەنینی من – نها هەر هەموو بیرەوەرییە زۆرو زەبەندەکانم لە زەین‌و بیرا زندوو دەبێتەوە– کارێکی ئەوتۆی تێکردوم کە لەوەسف کردن نایەت.

هەرگیز وێنام نەدەکرد کە ئەم مردنە تا ئەم ڕادەیە گیانسوزو بەسوێ بێت. ئێستا دەزانم تۆو منداڵەکانت چەند لە دڵما شیرینن. لە بەیانیەوە تا ئێواریێ هەر لە بیری ئێوەدا بووم‌و هۆن هۆن فرمێسکم دەڕشت. نەو گیرۆدەی ئەم هەستەم، کە ڕەنگە نها ئێوەش ئازار بدات، بۆ ساتێ فەرامۆشی دەکەی‌و ئەوسا سەر لە نوێ وەیادی دێنیەوەو بەوپەڕی ترس‌و خەمناکی لە خۆ دەپرسیت ئایا ڕاستە؟ تا شەوگارێکی درەنگ بێدار دەبن‌و لە خۆتان دەپرسن ئایا ڕاستە کە ئەو ئیدی نەماوە، بە یەکجارەکی ڕۆیی؟ بە ئیشێکی زۆر بۆ تولا چوو بووم. لەگەڵ گەردی بەیانیدا بۆ دیدەنی موسولوڤا چووم. خانم موسولوڤا زۆری لوتف کرد، گوتی: نایەڵم بەم زووانە بڕۆیت، هەموو شتێکم دەربارەی تانیا ئاندریوڤنا بۆ باس بکە. هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە. باسکردنی ژیانی شادی ئامێزو منداڵەکانی تۆ بۆ من لەزەتێکی فرەی هەبوو. ئەوسا نامەکانم وەرگرت. یەکەمجار نامەکە "ساسا(٢)"م کردەوە، لە یەکەمین وشەیەوە زانیم بویەرو پێشهاتێکی ترسناک‌و خەمناک رووی داوە. ئەوسا نامەکەی تۆم خوێندەوە کە هێنامە بەرچاوی خۆم چ ئازارێکت چەشتووە، گریام. بەڵام سەبارەت بە تۆ، چونکە کەسێکی ئیمانداریت، لە ناخی خۆمدا، لە دڵی خۆمدا هەستم بە ئاسوودەییەکی خۆش کرد. بەڵێ تەنیا ئاین‌و مەزەب دەتوانێ سوکنایی بە دڵ ببەخشێت‌و دڵنیام کە بۆ یەکەمجار پەیت بە بایەخ‌و گرینگی مەزەب بردووە، بیکە بە خاتری خوا هەرگیز ئەو ساتە پڕ ئازارانەی بەسەرت بردوون لە بیرمە کە، بەڵکو بیکە بە هاودەمی خۆت. لە بیرمە کە دەتگوت مەرگی ئێمەیەل ،خۆمان ترسناکە، بەڵام لە مردنی ئازیزێکدا، بە تایبەتی بوونەوەرێکی جوانی میناکی کوڕێك یان کیژێکی چکۆلە، چەندیش خەمناک‌و دڵتەزێن بێ، جوانیەکی عەجیب هەیە. بۆچی منداڵێك دەژی‌و دەمرێت؟ مەتەڵێکی ترسناکە! بە بۆچوونی من تەنیا یەك وەڵامی هەیە. "داشا ئیستا ئاسوودەترە!" ئەم قسانە چەندیش ئاسایی بن، ئەگەر بە دروستی دەرك بکرێن، بە دروستی بێنە تێگەیشتن هەر تازەو قوڵن، ئێمەش لە پاش ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم کارەساتانە باشترین‌و پێویستە باشتریش بین. من بەم قوناغەدا تێپەڕیوم، ئەم قۆناغەم تەی کردووەو دڵنیام کە چ وەکو لێکچوونی باری دەرونیت دەگەڵ باری دەروونی منداو چ لە میانەی شێوازی نامەکەتەوە کە وەکو پێویست لە ناوەڕۆك‌و چەمکەکەی گەییشتووم، ئەم نسکۆو کۆستە هەمان کاری لە تۆ کردووە کە مەرگی برایەکەم(٣) لە منی کرد – مەرگی منداڵێك زۆر شکۆدارترو نهێنی ئامێزترە– و تۆ وەکو پێویست بە ورە بەرزییەوە تەحەمولی دەکەیت. گرینگ ئەوەیە دەستبەرداری شین‌و گرین‌و شکایەت ببی‌و هەمیشە ئەم بیرە

لە زەین و مێشکی خۆتا پەروەردە بکەیت کە ئێمەمانان ناتوانین بزانین کێین و ئەسڵەن بۆچی هاتووینە دنیا، بەڵکو دەبێ ڕادەستی قەزاوقەدەر بین و تەواو، تکایە مەزمور "سروود"ی ژمارە سەدو سی ئەزبەر بکەو هەموو ڕۆژێ بیخوێنە.

لە گەڕانەوەمدا بۆ ماڵ، موسولف-م بینی و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە. زۆری لەبەر گران بوو، دڵم دایەوەو ماچم کرد. خودا حافیز ئازیزم! خودا سێبوری تۆو ساسا(٤) بدات- پڕ بە دڵ سەرخۆشی لێدەکەم‌و چەند حەزدەکەم ئارامییەکی ئاینی ئەوتۆتان هەبێت کە بتوانن بەسەر ئەم کۆستەدا، بە تایبەتی بەبێ شین و سکاڵاو گلەیی، زاڵ بن. هێشتا دووچاری کارەسات و کۆستێکی وا ترسناک و خەمناک نەبووین، لێ لەوەیە ڕۆژێك ئێمەش بگرێتەوە. حەقیقەت ئەوەیە کە ئەم ڕووداوە کۆست و کارەساتێك نیە، بەڵکو تەنیا قۆناغێکی گرینگی ژیانە کە دەبێ هەموو خەڵکانی چاك و ئابڕومەند بیبڕن. چەند باش بوو کە دەستی تەقدیر وای هانی بوو ڕێك لەم کاتەدا دایکت هاتبووە دیدەنیت. دەزانم تا چ ڕادەیەك سوکنایی بەخشی ڕوحت بووە. چونکە لەو دڵسۆزترت دەست نەدەکەوت. بە نامەکانی تۆوە بۆ تولا گەڕامەوە. سونیا بە کەیفخۆشی و بە دڵخۆشی بەرەو پیرم هات، لێ من پێمگوت: "نسیبەتێکی گەورە قەوماوە! زۆر گەورە!" پرسی: "حەننا مردووە؟" گوتم: "حەننا نیە. نامەکە لە لایەن ماڵی "کوتاییس"ەوە هاتووە، یەکسەرو بێ بیرکردنەوە وەك ئەوەی دەقی نامەکانی خوێندبێتەوە گوتی:

"داشا مردووە!"

پرسیم: لە کوێت زانیوە؟

هێندە پەرێشان و نیگەران و ناڕەحەت بوو کە نەیتوانی بەرسڤ بداتەوە.

سیرزاش زۆرت بۆ خەمبار بوو،و تانیا بۆ ماوەیەکی زۆر خۆی بەسەر تەختە خەوەکەدا داو گریا.

خودا حافیز ئازیزانم! خودا لەم قۆناغە دژوارەی ژیاندا سێبوریتان بدات، یارمەتیتان بدات.

***پەراوێز:***

***١- داشا: کیژە گەورەی تانیاو ئەلکساندر کوزمینسکی بوو.***

***٢- ساسا: ئالکساندر بیرس- ی ژنبرای تولستوی بوو.***

***٣- مەبەست لە نیکۆلای برا گەورەی تولستوی یە کە لە ١٨٦٠/٩/٢٠ کۆچی دوایی کرد.***

***٤- مەبەست ئەلکساندر کوزمینسکی یە.***

## بۆ ئا. ئا. تولستویا

## بـاژێرۆکی تـانانیکا، ١٨٧٣/٧/٣٠

کۆپییەکی ئەو نامەیەت کە دەربارەی گرانیو قاتو قڕی سامارام بۆ ڕۆژنامـان نووسـیوە، دەگـەڵ نامەیـەکی ژنەکەمـدا بـۆ دەنێـرم. هەنـدێجار وای بـۆ دەچـم چـونکە سـەرقاڵی مەسـەلەو هیوایـەتی دیکەیت، و لە ژینگەیەکی تەواو جیاوازدا کە زیاتر لـە دڵـی خۆتـەوە نزیکـە، دەژیـت، کاتـێ نامـەی منـت پێـدەگات دەڵێیـت: "بۆچـی وازم لێ نـاهێنی، بـۆ دەسـتبەردارم نابیـت؟" بـەڵام پـاش ئـەوەی نامەکەت خوێندەوەو تەواوت کرد. هەنگێ بەگوێرەی مەیلی دڵ، نەك بەگوێرەی هزرینو تێفکرین میناکی ئەسپێکی ڕەسەنو بـە ئەمـەك سـەری خـۆت دادەنـوێنیو بـەو پـەڕی ئاسـودەیی دەرونـیو دڵپاکیو سادەییەوە دەپرسیت: "ئێ! ئێوە بۆ کوێ بەرم؟ چەند کەسن؟ من ئامـادەم!" هـەنگێ ئەلکسـاندرینی ئـازیزو بـەڕێزو میرەبـانی مـن! سـەبارەت بـە ئامـادەیی تـۆ وەڵام دەدەمـەوە کـە: "سـەرباری ئـەوەی لـە بـواری وتـار نووسـیدا بـێ ئـەزموونو بـێ توانـام، نامەیـەکی زۆر سـاردو ناشیانەم بۆ ڕۆژنامەکان نووسیوەو لە ترسی ئەوەی نەبادا هەراو هەنگامەو مشتومڕو گەنگەشە بنێتەوە، قاتو قڕییەکەی "سامارا"م زۆر لە خۆی بچووکتر شەرح کردووەو سەرنجی ڕای گشتیم بـۆ ڕاکێشـاوەو هـەروەها نامەیەکیشـم بـۆ دۆسـتانم نووسـیوەو داوام لێکـردوون تـاقیبی وەزعو حاڵـەکان بکـەن.بـەڵام دەترسـم مەسـەلەکە درێـژا بکێشـێت، بۆیـە دەسـتی پاڕانـەوەم بـۆ تـۆ درێـژ کـردووە. ئەگـەر بخوازیـتو بتوانیـت. سـەرنجی هونەرمەنـدانو دەرونپاکـانی ئـەم جیهانـە، کـە خۆشـبەختانە هـەردوو توێژەکـە لـە یـەك قوماشـن، بـۆ ئـەم بابەتـە ڕابکێشـیت دەگەینـە ئـەنجامی دڵخـواز، و هـە نگـێ لـە ئاسـتی ئـەو چـاکیە مەزنـەی کـە دەرهـەق بـە هـەزاران کـەس دەکرێـت، شـادمانیو خۆشـی مـنو تـۆ لـەم سـەرکەوتنەدا، ئەوەنـدە کـەمو بچـووك دەبێـت کـە هـەر بـیری لێناکەینەوە. من حەزم لە کوڕزانەوەو لالانـەوەو پاڕانەوە نیە، بـەڵام بـە جورئەتـەوە دەنووسـم بـە درێـژایی ئـەم چڵو پێـنج سـاڵەی کـە لـەم جیهانـەدا بەسـەرم بـردووە هـەرگیز ئـەم جـۆرە دیمەنـەم نەدیتووەو تەنانەت تەسەوریشم نەدەکرد کە بشێت ئەم جۆرە دیمەنانـە هەبێت. کاتێ بیر لـەوە دەکەمـەوە کـە زسـتان چ دەبێـت، لـە حەژمـەتو لـە ترسـاندا مـووی بـەدەنم گـرژ دەبـن. هـەر ئێسـتا دوای نووسـینی ئـەم نامەیـە هـەواڵم زانـی کـە دروێنـەوانێك تووشـی تـاعون بـووە. جگـە لـە نـانی ڕەشی ناخۆش چیتر بۆ خواردن دەست ناکەوێ، خۆ ئەگەر ئێمـە فریـای ئـەو پیـاوە نـە کـەوتباین، داماوە لە برسا دەمرد. ئەم ڕووداوانە لە ڕادەبەدەر خەمناكو ناخۆشن، بە تایبەتی بۆ کەسێك کە وەکو پێویست ئاگاداری ئەوە بێت کە میللەتی ڕوس چەند میللەتێکی زەحمەتکێشو گوێڕایـەڵو هێمنو بـەردەبارو بـە تەحەمولـە. خـواردنی بـاشو سـاغڵەم نیـەو شینو شـکاتو دادو بێـدادیش ناگاتە هیچ کوێ. ئیدی دەبێ بمریت. خواستی خودایە. ئەوانە مەڕ نین، بەڵکو گـای بـە هێـزو بـە کارو مەلکەچو گوێڕایەڵنو خۆیان زەویـەکانیان دەکێڵن. هـەرکاتێ بمـرن، ڕایـان دەکێشـنە دەرێـی زەویەکانو خەڵکانی دی دەکەونە ڕاکێشانی هەوجاڕەکان. پێموانیە لە مەبەستم بگەیتو لەوەشە ئەم بەراوردەتان بەلاوە نابەجێو کۆساخانە بێ. تۆ لە جیهانێکدا ژیاوی کە بێگومان ناهەمواریو

ناهەنجاریو نالەباریو دزێویو ناشیرینی بەدەنیو مەعنەویو ڕەنجو عەزابو زەحمەت، بە تایبەتی عەزابی روحیو دەرونی تیا هەبووە، بەڵام لەوێدا شتێك نەبووە بە ناوی مەحرومیەتو داماویو نامرادی. کیژانی تەرکە دنیای ئێوە، لە ڕادەبەدەر بەزەییو دلۆڤانی بینەر دەهاڕۆژێنن، بەڵام ئەم ڕەحمو بەزەییە میناکی هەموو بەزەییەك سەبارەت بە هەر ڕەنجو ئازارو زەحمەتێکی رۆح لایەنی زەینی یان دەرونی هەیە، بەڵام کاتێ خەڵکانی سادەو ساکاری دڵپاك، ساغو سەلامەت لە رووی بەدەنیو روحییەوە، لە بەر نەبوونی ژەمە خواردنێك دەمرن، بە هەموو بوونمانەوە هەست بە دلۆڤانیو بەزەیی دەکەینو کە بەو دەردو عەزابەوە دەیان بینین پێمان شەرمە پێمان بگوترێ بەشەر: جا ئەم کارە گەورەیە کە تا ئەم ئەندازەیە لە دڵمانەوە نزیکە، نها لە دەستی تۆدایەو پێشوەختە سوپاسی ئەو لوتفەت دەکەم کە دەتوانی لەم ڕێگەیەدا بیکەیت:
زۆر سوپاست دەکەم بۆ دوا نامەت، و لە کانگای دڵەوە شەریکی هەموو نیگەرانیو خۆشیەکانتم.
دۆستی دێرینو ڕاستگۆتان.

*تولستوی.*

## بۆ. ئا. ئا. تولستویا

## یاسنایا پولیانا، ١٨٧٤/٣/٦

دۆستی ئازیزم، ئەگەرچی مودەتێکە نامەم بۆ نەناردویتو بۆ دیدەنیت نەهاتووم بۆ مۆسکۆ، بەڵام مادامێکی بە دۆستی ئازیزو مێریڤانی خۆمت دەزانمو نێوت دەبەم دڵنیابە کە هەستی ڕاستگۆیانەم سەبارەت بە تۆ بە هیچ جۆرێ لە کەمی نەداوە. ڕۆژێك نەبووە کە خۆمو ژنەکەم باسی تۆو ئەم قۆناغە دژوارە((١)) نەکەین کەپێیدا دەڕۆیت یان بیرمان لێ نەکردبیتەوە، هەمیشە لە بیرمانی. هیچ شتێك دەربارەی هەستو سۆزی تۆ سەبارەت بەخۆم نانووسم، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەزانم تۆ بەرانبەر بە من چۆنی، دڵ ئاوێنەی دڵە، ئەگەر وا نەبوایە ئەوەندەم خۆش نەدەویستی. وێڕای ئەمەش زۆر حەزدەکەم ڕەئی تۆ لەم بارەیەوە بزانمو بەڵگەیەکم بدەیتە دەست تا دڵنیا ببم کە بە هەڵەدا نەچوومو هەروەها هەندێ وردە شتانم بخەیتە بەردەست کە من پەیم پێ نەبردوونو نەم دیتوون. لە مێژە خۆم ئامادە دەکەم نامەت بۆ بنووسم. هەرچەندە ماوەیەکە کەمتر یەکدی دەبینینو کەمتر نامە بۆ یەکدی دەنێرین، لەگەڵ ئەوەشدا – نازانم هۆی ئەمە بدەمە پاڵ چی– دژواریو سەختی ئەو قۆناغەی کە بەسەرت بردووە یان لە حاڵی بەسەر بردنیدایت، لە ڕوحو دڵو دەرونی مندا ڕەنگی داوەتەوە. دەتوانم وەزعو حاڵی تۆ بەمجۆرە بێنمە بەرچاوی خۆم: داینەمۆیەکی یەجگار سوودمەندو نایاب هەیە کە هەموان بۆ ئەوەی

دەستیان بریندار نەبێت، بە هۆی هەندلێکی درێژی کانزایی دەیخەینەکار، لێ ئەم داینەمۆیە لە هەمان کاتدا پێویستی بە کرێکارانێکە کە لە دەوروبەریا بە دەستیش کاربکەن. دیارە تۆ بە کەماڵی مەیلەوە ئامادەی ئەرك‌و کاری یەکێك لەم کرێکارانە بگریتە ئەستۆ، و ئاساییە بەو تەبیعەتەوە کە خودا بە تۆی بەخشیوە، نەك هەر دەست بەڵکو دڵی خۆتیش فیدای ئەم داینەمۆیە بکەیت‌و هەمووی یان بە شێکی بریندار بکەیت. دەزانم کە شتەکە وایەو لە ناخی دڵەوە لە خەمی تۆدام، نیگەرانی تۆم. هەرکاتێ گومانم کردبێت دۆستایەتیم سەبارەت بە تۆ گۆڕابێ، ئازارێکم کەوتوەتە دڵ کە گومانەکەی ڕەواندوومەتەوە. هەرکاتێ دڵت بەم حەقیقەتە خۆش بوو نامەم بۆ بنووسە، لە غەیری ئەم حاڵەتەدا هیچ شتێکم بۆ مەنووسە. دوێنێ لە مۆسکۆ گەڕامەوە، و دەگەڵ تونسجوڤادا دەربارەی تۆ قسەم کرد. پتر لەبەر ئەوەم خۆش گەرەکە کە لە هزرو بیرەکانی تۆ دەگات‌و ڕێزت دەگرێت.

بۆیە پێش هاتنی تۆ ، بۆ مۆسکۆ نەهاتم چونکە پێشتر هاتبووم – تۆ نازانی ئێستا چوونە دەرەوەو ماڵ بەجێهێشتن‌و بە فیڕۆدانی ڕۆژانی پڕ بایەخ لە دەرێ بۆ من چەند قورس‌و دژوارە، بە تایبەتی کە تەمەنێکی زۆرم نەماوە. ئەمساڵ تووشی نسکۆیەکی ناخۆش بووین: شەشەمین منداڵم کە بچووکترین کوڕم بوو مرد. ئێستا هەر پێنج منداڵم هەن‌و چاوەڕوانین لە هەفتەی مبارەکدا یەکێکی دیکەمان لە دایك ببێ. لە نێو هەموو ئەو کارەساتانەی کە لەوە بوو بۆ ئازیزانی ئێمە بێتە پێشێ، هێشتا ئەم نسکۆیە سووکتر بوو، وەکو لە دەستدانی قامکە چکۆلە بوو لە نێوان هەموو قامکەکانی تردا. وێڕای ئەمەش هەر ناخۆش‌و بەسوێیە، بە تایبەتی ژنەکەمی لە ڕادەبەدەر خەمبارو ناڕەحەت کردووە. سەبارەت بە خودی خۆم مردن کاریگەرییەکی زۆر بە سوێی نیە، چونکە ئەمەم لە ئەنجامی مەرگی ئازیزترین برام دا تاقی کردووەتەوە. ئەگەر مەرگی کەسێکی ئازیز، لە مەرگی خۆمان نزیکی نەخستباینەوە.و جۆرە نائومێدیەکی سەبارەت بە ژیان لا دروست نەکردباین‌و نەبوایەتە بایسی ئەوە کە زۆر لە مردن نەترسین، لە هەموو ڕوویەکەوە دژوارو ناخۆش دەبوو، تەحەمول نەدەکرا. هەرکاتێ ئێمە بە خۆشییەوە لە کۆتایی خۆمان نزیك ببینەوە هەنگێ مەرگ لایەنە خەمناکەکەی خۆی لە دەست دەدات‌و دەگۆڕێت بۆ ڕووداوێکی گرینگ‌و جوان. مەرگ ئەو جۆرە کارەی بەسەر منەوە هەیەو پێموایە هەمان کاریگەریی بەسەر هەموو کەسێکەوە هەبێت. نموونەیەکی بچووکت بۆ دێنمەوە: لە کاتی بە خاك سپاردنی (پتژا)دا بۆ یەکەمین جار بیرم لەوە کردەوە کە لە کوێ دەنێژرێم؟ سەبارەت بە سونیاش، ئازارە بەدەنی یان ئازارو خەمی دایکایەتیەکەی لێدەرکە، سەرباری گەنجایەتیەکەی هەمان کاری تێکردووە.

ژیانمان ئەمەیە. هێندەمان کار هەیە فریای هیچ ناکەوین. نامان پەرژێتە سەر هیچ. منداڵەکان‌و فێرکردن‌و پەروەردەیان لە جاران پتریان وەخت گەرەکە. هیچ درێغییەك لە پەروەردەکرنیان ناکەین‌و وەختی تەواویان بۆ تەرخان دەکەین. بەخۆم لەمبارەیەوە ئەو پەڕی هەوڵیان دەگەڵدا دەدەم‌و شانازی بە منداڵەکانمەوە دەکەم. جگە لەمەش سەرقاڵ‌و مژوڵی نووسینم‌و دەستم بە بڵاوکردنەوەی چیرۆکێك کردووە کە خۆم دڵم پێی خۆشە، لێ پێناچێت بە دڵی خەڵکانێکی دی بێت، چونکە یەجگار سادەیە((٢)).

ملاحەزە بفەرموو، و بزانە چ وردەکارییەکی ژیانی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە. بێزەحمەت تۆش باسی ڕەوشی ژیان و خۆشی و ناخۆشیەکانی خۆتم بە وردو درشتەوە بۆ بنووسە.

کەسوکارەکەت، بەتایبەتی دایك و خوشکەکانت چ دەکەن؟ لە کوێن؟ حاڵی ئیراسکوف یاڤاسیلوڤنا چۆنە؟

هەڵبژاردنی شازادەخانم ڤیازنکایا((٣)) بە نوێنەرایەتی ژنانی روسیا یەجگار بەجێیە. بە پێچەوانەوە کلوسین((٤)) بۆ نوێنەرایەتی نابێت و دەبێتە مایەی شەرمەزاری و نەگبەتی پیاوانی روسیا.

کاتێ کە ئەو لە زەینی خۆدا بەرجەستە دەکەم کە بەو پەڕی غرووروو لە هەمان کاتدا بەوپەڕی گەوجێتییەوە وەکو خواوەندەکانی ئۆڵەمپ لەنێو لۆردانی ئینگلیزدا شوێنی خۆی گرتووە، لە شەرمەزاریدا سوور هەڵدەگەڕێم. ڕێك دەکاتە ئەو روسییە نارەسەن و ئەقڵ سووك و بێ شەخسیەتەی کە بە حوکمی لاوازی تەبیعەت و رەفتاری خۆی، بێ هیچ چەندو چوونێك، بێ هیچ جۆرە باوەڕو ئیمانێك لاسایی رواڵەتسازی ئەوروپاییەکان دەکاتەوە. هەمان روسیایی نارەسەن کە بێگانان و فەرەنگیان بە نوێنەری هەموو رووسێکی دەزانن و لێی بێزارن.

وا تەسەوردەکەم بە باسکردنی قات و قڕی سامارا تۆم نارەحەت و نیگەران کردووە. من لە سەردەمی گەنجایەتیمەوە پتر لە هەر سیفەتێکی پۆزەتیف خووم بە سیفەتێکی نێگەتیفەوە گرتووە، ئەویش سادەییە، تا پتر تەمەنم هەڵدەکشێت بەلامەوە پڕ بایەخ تر دەبێت. ئەگەر لەتە نانێك لە جیاتی ئەوەی کە لەلایەن قاتی زەدەیەکەوە بە قاتی زەدەیەکی تر بدرێ، لەلایەن دەوڵەمەندێکەوە کە نقومی نازو نیعمەتە پێشکەش بکرێت دەنگ و دەنگدانەوەیەکی گەورەی لێ دەکەوێتەوە.

ئاه خودایا! ئەم رواڵەتبازی و فەخرفرۆشیانە چی لێ شین دەبێت؟ تازە لە مۆسکۆ گەڕاومەتەوە و هەرچەندە خۆم لەوە دوورگرتووە کە گوێ لە چیرۆکی خۆنوێنی ئەو کەسانە بگرم کە هەنگاوێکیان بەرەو یارمەتی دانی لیقەوماوانی قاتی و قڕییەکە ناوە، کەچی بێئەوەی بە دەستی خۆم بێ بەدڵێکی پڕ نەفرەت و بێزاری ئەو تۆوە لەو کەسانە، گەڕاومەتەوە کە مەحاڵە تا ماوەیەکی دوورو درێژ هێور ببمەوە و ئاسودەیی حاسڵ بکەم. بەتایبەتی کە حەزدەکەم منداڵەکانم ژیان بە کارێکی جدی و یەکسان بۆ هەموو تیرەی بەشەر بزانن، کەچی سەیردەکەم خەڵکی بە دەگمەن مل بۆ ئەم بیرە دەدەن. خودا حافیز! دەستت ماچ دەکەم!

*دۆستی ئەمەکدارتان*

*ل. تولستوی.*

***پەراوێز:***

***١- لە کۆتایی مانگی ١/١٨٧٤دا، ئا. ئا. تولستویا بە بۆنەی زەماوەندی دۆشس-ی گەورە، مایا ئالکساندروڤا، دەگەڵ دۆك ئەدمبورگدا، وێرای هەموو ئەندامانی دەرباری روسیا بۆ***

*مۆسکۆ رۆیی. ئا. ئا. تولستویا کە هاودەمو مامۆستای دوشسی گەورە بوو، لە رادەبەدەر بەم جیابوونەوەیە خەمبار بوو.*

*٢- تولستوی لە هەیڤی ١٨٧٤/٣دا بەشی یەکەمی ئاناکارنینای بۆ گۆڤاری پەیامبەری روس نارد.*

*٣- شازادەخانم ڤیازنکایا کە یەکێك بوو لە خانمانی دەرباری بۆ هاوڕێیەتی دۆشس ماریا ئالکساندروڤنا لە سەفەریا بۆ لەندەن، بۆ رێوڕەسمی زەماوەندەکە، هەڵبژێردرا بوو.*

*٤- کولوسین. کۆنە دیپلومات و هاوڕێی منداڵی تولستوی بوو، بەڵام تولستوی لێرەدا هەڵەی کردووە، چونکە کولوسین بۆ بەشداری رێوڕەسمی زەماوەندەکەی دۆشسی گەورە لە لەندەن، هەڵنەبژێردرا بوو.*

## بۆ ئا. ئا. فت
## یاسنایا پولیانا، ١٨٧٥/١٠/٢٦

**ئافاناسی سوفیچ-ی ئازیزم!**

بۆیە دەمێکە نامەم بۆ نە نووسیوویت چونکە بە درێژایی ئەم ماوەیە نەخۆش بووم، و نەخۆشی ماڵ و منداڵەکەشم لەولاوە بوەستێ. نها چ خۆم و چ ئەوان کەمێك باشترین و هیوادارام بتوانم بەم زووانە دەست بەکار بکەمەوە. کاری ئێمەمانان بەڕاستی کارێکی قورس و ترسناکە. بۆ ئەوەی بتوانین کاربکەین پێویستە مەیدان و شانۆی ژێر پێمان بە بەردەوامی فراوان و بەرین ببێ. جگە لە خۆمان کەسی تر ئاگای لەم راستیە نیەو مخابن هەڵبژاردنی ئەم شانۆیە بەدەستی خۆمان نیە. هەرکاتێ بەبێ شانۆ کاربکەی جگە لە بە فیڕۆدانی ئەوزارەکانی کار هیچ شتێکی دی بە دەست ناهێنی و ئەوجا دەبینی کە بەردەمت گیراوەو ناتوانی بچیتە پێشترەوە. ئەم راستیە زیاتر کاتێ هەست پێدەکرێت کە کارەکە دەستی پێکردووە. وا دەزانیت کە هیچ هەنجەت و بیانوویەك بۆ درێژە نەدانی کارەکە لە ئارادا نیە. بەردەوام گوشار لە خۆت دەکەی، لێ هەستدەکەی وزەو تاقەتی پێویستت بۆ هەوڵ و کۆششی زیاتر نیەو ئیدی هیچ چارەیەکت نامێنێ جگە لەوەی کە دابنیشیت و چاوەڕوانی دەرفەت و دەلیڤەیەکی گونجاوتر بکەی. منیش وامکردو هەنووکە هەستدەکەم کە زەمینەکە رەخساوەو خۆش بووەو خەملیوەو جارێکی دی قۆڵم لێ هەڵماڵیوە.

لەم ماوەیەدا دوو کتێبم خوێندوونەتەوە کە بە خەیاڵی هیچ کەسێکدا نایەن، کەچی ئەفسوونیان کردووم. یەکێکیان بریتییە لە کۆمەڵێك زانیاری هەڵبژاردە سەبارەت بە کێونشینانی

قەفقاز کە لە تەفلیس بە چاپ گەیەنراوەو کۆمەڵێك حیکایەت و ئەفسانەو هۆزانی کێونشینانی لە خۆگرتووە کە بەبۆچوونی من دەشێت لە ریزی گەنجینانی هۆنراوەدا دابنرێت. دەمەویٚ بۆتی بنێرم، کاتیٚ ئەم کتێبەم دەخوێندەوە بەردەوام بیرم لای تۆ بوو. بەڵام نا، بۆتی نانێرم، چونکە دڵم نایەت لە دەستی بدەم، ناو بە ناو، هەرجارەی کۆپلەیەکی لیٚ دەخوێنمەوە. نها نموونەیەکت لە کتێبی ناڤبری بە کۆپی کراوی بۆ دەنێرم:

*خاکی سەر گۆڕەکەم وشك دەبێتەوەو تۆش لە بیرم*

*دەکەیت دایکە گیان*

*گیای سەر گۆڕەکەم لە گۆڕستاندا چەکەرە دەکات و خەمی*

*تۆ دەکاتە ژێرەوە ئەی بابی پیرم.*

*ئەشکی چاوانی خوشکەکەم وشك دەبێتەوەو دەردو ئازار*

*لە دڵی باردەکات.*

*ئەی گوللە بتەقەو مەرگ ببارێنە! بەڵام ئایا تۆ کۆیلەی*

*ئەمەکداری من بوویت؟*

*ئەی خاکی تاریك و نوتەك، تۆ من لە هەمێز دەگریت،*

*ئەدی من نەبووم کە بە سمی ئەسپەکەم پایەماڵم*

*دەکردیت؟ ئەی مەرگ تۆ ساردو سڕیت، ئەدی*

*من ئاغای تۆ نەبووم؟*

*جەستەی من نهو بەشێکە لە قەڵەمڕەوی زەوی*

*لیٚ ئاسمان روحم لە خۆ دەگرێت.*

*

باوەڕ دەکەیت زۆر جوانە؟

نها دەستپێکی شیعرێکت بۆ دەنووسمەوە:

**هەڵۆیەکی سپی بە ئاسمانەوە خۆی دەگەیەنێتە نێچیرو**

*بە چنگە قولا پیەکانی دەیگرێت و بە دەنووك لێی بەردەبێت.*

*توڵە پڵنگێکی بەڵەکی بەلەزو چنگ تیژ خۆی*

*دەگەیەنێتە حەیوانێکی سورکار.*

*شمنراتی دلێر روباری ئەترەك بەجیٚ دێڵیٚ و دەگەڵ*

*سوارانی کارامەی چیچاندا بەرەو کەناری چەپ دەڕوات.*

*دایکە گیان! بۆ ساتیٚ وەرە دەریٚ تا بە چاوی*

*خۆت پەرجۆیەك ببینی: لە ژێر بەفری ئەستوردا،*

*گیا چەکەرەی کردووەو سەری دەرهێناوە.*

*دایکە بچۆ سەربان، لە قەراخی سەربانەکە نزیك ببەوەو*

*تەمەشاکە لە ژێر بەستەڵەکی گوزەرگاوە گوڵێکی بەهاری*

*سەری دەرهێناوە.*

*لە ژێر بەفری ئەستورا هەرگیز گیا چەکەرە ناکات، لە ژێر بەستەڵەکی گوزەرگادا هەرگیز گوڵ ناڕوێت. تۆ تەنیا لەبەر ئەوەی ئاشقی ڕوانی گوڵت لە ژێر بەستەڵەکدا تەسەور کردووە؟*

ئەم شیعرانەت بەدڵ بوو؟ سڵاوم بە ماریاپتروڤنا بگەیەنن.

*ل. تولستۆی.*

## بۆ ئا. ئا. تولستویا
## یاسنایا پولیانا، ٨-١٢/٣/١٨٧٦

**دۆستی ئازیزم.** زۆر بە نامەکەت خۆشحاڵو شادمان بووم. زۆرم پێویست بەو نامەیە بوو. لە وەزعو حاڵت ئاگادار بوومەوەو زانیم کە هیچ گۆڕانکارییەك لە پەیوەندییەکانماندا ڕووی نەداوە. تۆ نازانی چەندم ئاندرویوفیچ-ی ئێوە خۆش دەوێ. هەروەها بەرەبەرەو بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار پەیوەندی خوێنی ئێمە تا چ ڕادەیەك بتەوو بەهێز بووە. چیرۆکی مردنی منداڵەکانم بەمجۆرەیە: دوای پێنج منداڵ کە لە ژیاندان – خودا ئاگاداریان بێت – شەشەمین منداڵم هاتە دنیاوە، کوڕێکی قوتو قەڵەو بوو، هاوسەرەکەم زۆری خۆش دەویست. لە تەمەنی یەكساڵیدا شەوێك حاڵی تێك چوو، و هاوسەرەکەم بەرەبەیان بۆ چەند ساتێك لێی دوور کەوتبووەوە. لە پڕ هەواڵیان بۆ من هێنا منداڵەکە ، کە ناومان نابوو پتجا، مردووە. پاش ئەو منداڵێکی فرە جوان – لە چەند مانگێکدا بە تەواوەتی دەرکەوتبوو کە کەسێکی بە شەخسیەتو خۆشەویستە – لە تەمەنی یەکساڵیدا بە وەرەمی مێشك گیانی سپارد. ئێستاش کە بیرم دەکەوێتەوە چۆن یەك هەفتە بە دەم گیانەڵڵایەکی دڵتەزێنەوە دەتلایەوە، ئاگرم لە دڵو دەروون بەر دەبێت. زستانی ئەمساڵ ژنەکەم فرە نەساغ بوو، حاڵی زۆر خراپ بوو. نەخۆشیەکەی بە کۆکەیەکی توند دەستی پێکرد. گەییە حاڵی مردن،و بەم حاڵەوە کیژێکی بوو کە تەنیا چەند سەعاتێك ژیاو پاش ئەوەی ژنەکەم لە مەترسی دەرباز بوو ئەوسا هەستمان بە کاریگەریو خەمناکی لە دەستدانی گیانپروکێنی منداڵەکە کرد. تازە هاوسەرەکەم لە جێگا هەستا بوو – هێشتا شەش هەفتەی بەسەرا نەبوری بوو– کە پورە پیرەکەم، ئیلپنکا یوسکوڤا لە پڕێکا ماڵاوایی لە ژیان کرد. تەنیا

یەك ساڵ بوو وازی لە دێر هێنابوو و هاتبوو دەگەڵ ئێمەدا بژی. لە پڕ نەخۆش کەوتو زۆری ئازار چەشت.

سەیر ئەوەیە کە مەرگی ئەم پیرەژنە بتەوە هەشتاو دوو ساڵەیە کارێکی ئەوتۆی لە روح و گیانم کرد کە ناتوانم دەگەڵ نارەحەتی مەرگی هیچ کەسێکی پێشترا بەراوردی بکەم. لە دەستدانی ئەم پیرەژنە کە دوا نموونەی نەسڵی کۆن و یادگاری باوك و دایکم بوو زۆری خەمبار کردم، ئازاری دام، دیتنی رەنج و عەزابی ئەو دڵی گوشیم، هەڵبەتە ئەم مەرگە کاری دیکەشی تێکردم کە نها ناتوانم باسی بکەم، و رۆژێ بۆتی باس دەکەم. خۆشی لە خۆت کە ئە هلی ئیمانی. بۆ ئێمە تەحەمولی ئەم نسکۆیە، ئەم خەسارەتە زۆر زەحمەتە.

به نامەکەتدا وا دیارە حاڵت باشە، و زۆر شادم کە باشیت، بە تایبەتی کە کیژە ئازیزەکەت لە نك ئەنگویەو ئێوەش بە سۆزو خۆشەویستییەوە پە زێڕایی دەکەن،و هەروەها خۆشحاڵم کە دایکت دەگەڵ ئێوەدا دەژیو دەورانێکی پیری باشی هەیە. لە هەموو کەسێك پتر قەدری بگرن، لە جیاتی من دەستەکانی ماچ بکەنو کارێکی وابکەن کە دوعای خێرم بۆ بکات، یادی بەخێرم بکاتەوە. ئانای(١) من نارەحەتی کردوومو بە تەواوەتی تورەی کردووم. وەکو شاگردو قوتابیەکی بەدخوو ئازارم دەدات، بەڵام لە عەلەیی مەدویێ، ئەگەر دەشتەویێ باسی بکەیت بە پارێزەوە باسی بکە، چونکە بتەوی‌ و نەتەویێ بە کیژی خۆمم قەبوڵکردووە.

*دڵسۆزتان*

*ل. تولستوی.*

***پەراوێز:***

***١- مەبەست لە ئاناکارنینای قارەمانی رۆمانە بە ناوبانگەکەی تولستویە.***

## بۆ ئی. س. تورگینیف
## یاسنایا پولیانا، ١٨٧٨/١٠/٢٧

**ئیڤان سیرجیفی ئازیز**

لە هەموو روویەکەوە بەرانبەر بە تۆ خۆم بە گوناهبارو کەمتەرخەم دەزانم، بە تەما بووم یەکسەر دوای سەفەرکردنت نامەت بۆ بنووسم، کەچی نەك نامەم بۆ نە نووسیت بەڵکو بەرسڤی نامەکەشتم دواخست. بارودۆخی ئێرە لە سایەی لوتفی خواوە باشە، بەڵام من لەبەر ئەوە نامەم بۆ نە نووسیویت کە لەو دواییانەدا — بە ئاشکرا دەیڵێم — تووشی نارەحەتیو نیگەرانی دەروونی بوو بووم. خۆم بە ڕاوو شکارو خوێندنەوەوە مژول کرد، بەڵام دەستم نە دەچووە هیچ

جۆره چالاکییەکی زەینیو تەنانەت نەمدەتوانی نامەیەکی جدیش بنووسم، زۆر دەسەوسان بووم. هەندێجار ئەم حاڵەتەم لێدێت، ئەگەر تۆ وانیت، هەوڵبدە لەو وەزعەی من حاڵی ببیت. هەر لە بەر ئەمە بوو کە نەمتوانی نامە بۆ تالستون بنووسم، بەڵام نها بە تەمام نامەی بۆ بنووسم.

شوپیلر، قوزاقەکانی کردووە بە ئینگلیزیو نوسخەیان بۆ ناردووم، پێدەچێت پاچڤەیەکی باش بێت، بەڵام پاچڤە فەرەنسیەکەی کە لەلایەن بارونس منگدن– ەوە کراوە، و بە خۆت لە ماڵی ئێمەدا ئاشنای بوویت، زۆر باش نیە. تکایە وا بیرنەکەیتەوە کە خۆم هەڵدەکێشم، سوێندت بۆ دەخۆم، و باوەڕبکە هەرکاتێ کە بە شێوەیەکی لامسەرلایی چاو بە بەرهەمەکانما دەخشێنم، یان کاتێ کە ئاماژەیەك بۆ ئەم بەرهەمانە دەکرێت، هەستێکی ناخۆشو ئاڵۆز بە رۆکم دەگرێت، بەشی هەرە زۆری ئەم هەستەش، زادەی شەرمو ترسی ئەوەیە کە نەبادا ببمە مایەی گاڵتەو تەوسو توانجان. لە کاتی نووسینی ئوتوبیوگرافیەکەشمدا هەمان هەست بە جۆرێ بەرۆکی گرتم کە بۆم دەرکەوت توانای نووسینیم نیەو حەزدەکەم دەستبەرداری ئەو کارە ببم.

هەرچەندە من رێزو حورمەتم بۆت هەیەو قەناعەتم وایە کە تۆش بەرانبەر بە من لوتفت هەیە، پێموایە تەنانەت تۆش گاڵتەم پێدەکەی. بۆیە باشتر وایە باسی نووسینەکانی من نەکەین. تۆش دەزانی هەر کەسەو شێوازی تایبەتی خۆی هەیەو دڵی بە شێوازی خۆی خۆشە،و کەس بە دۆی خۆی ناڵێ ترشە . باوەڕبکە من بەش بە حاڵی خۆم حەزم لێیە هەمان شێواز بگرمەبەر کە قسەی پێدەکەم. لە کانگای دڵەوە خۆشحاڵم کە حاڵت باشەو وەزعو حاڵی خانەوادەکەت بە دڵی دۆستە،و بەش بە حاڵی خۆم زۆرم پێخۆشە کە پیرێکی گورجو گۆڵو چەلەنگیت. بێگومان لە ماوەی ئەم شازدە ساڵەدا کە یەکترمان نەدیتووە، لە هەموو ڕوویەکەوە، بە تایبەتی لە رووی بەدەنیەوە باشتر بوویت.

هیوادارم ئەوەی بۆ من لە ژیاندا مایەی شادمانیە بە نسیبی تۆش ببێ. ئەو هیواو ئاواتەش بریتییە لە کارو باوەڕ بە بایەخو گرینگی کار. کاتێ کە دەڵێیت دەست بەرداری نووسین بوویت، حەزناکەم باوەڕت پێبکەم. چونکە تۆ وەکو بوتڵێك وایت کە هەڵگێردرابێتەوەو هێشتا باشترین محتەوای تیا ماوەو ئەوەندەی بەسە کە بەشێوەیەك رابگیرێ کە شلەکەی ناوی بە ئاسانی ئاوەڕۆی خۆی وەربگرێتەوە. ئاواتە خوازم چ بۆ تۆو چ بۆ خۆم ڕەوتی وەزعو حاڵو بارودۆخەکە بە گوێرەی مرازی دڵ بێت.

لە دێهاتەکانی ئێمەدا پاییزێکی یەجگار جوانەو تانهو رێویەکی فرەم ڕاوکردووە. بە هەموو دڵمەوە لە ئامێزت دەگوشم، و هاوسەرەکەشم سلاوی هەیەو سوپاست دەکات کە ئەو دیاریەت بۆی ناردووە.

*دڵسۆزتان*

*تولستوی.*

## بۆ ئەلکساندری سێیەم، ئیمپراتۆری روسیا

## یاسنا پولیانا، ٨-١٥/٣/١٨٨١

**خاوەنشکۆ!**

من، پیاوێکی بچووک، بێ توانا و ناجسنم، بێئەوەی کەسێك داوای لێکردبێت، نامەیەك بۆ ئیمپراتۆری روسیا دەنووسێت و ئامۆژگاری دەکات کە لە دژوارترین و ئاڵۆزترین هەلومەرج دا کە هاتووەتە ئاراوە چ رێگەیەك بگرێتە بەر؟ زۆرچاك هەستدەکەم ئەم کارە تا چ ڕادەیەك سەیرە، بێ ئەدەبانە و لاسارانە یە، وێڕای ئەمەش هەر دەینووسم. لە دڵی خۆمدا دەڵێم نووسینی ئەم جۆرە نامەیە کارێکی بێهودەیە، چونکە نامەکەت ناخوێنرێتەوە، گریمان وا خوێنراشەوە، بەشتێکی زیانبەخش دادەنرێت و تووشی سزا دەبیت. بە هەرحاڵ لە نووسینی ئەم نامەیەدا شتێك نییە کە بێتە مایەی پەشیمانی. ئەگەر ئەم نامەیە نەنووسیت و پاشان بۆت بە دیاربکەوێ هیچ کەسێك ئەوەی کە تۆ ویستووتە بە ئیمپراتۆری بڵێی،پێی نەگوتووە و کاتێ کە کار لە کار ترازا، ئیمپراتۆر پەنجەی پەشیمانی دەگەزێت و بەخۆی دەڵێت "کاشکێ کەسێك ئاگاداری دەکردمەوە!" هەنگێ بۆ هەتا هەتایە لەوەی کە حەقیقەتت بۆ ئیمپراتۆر نەنووسیوە ژێوان دەبیتەوە. لەبەر ئەمە دەستم داوەتە قەڵەم و بیرو بۆچوونی خۆم بۆ ئیمپراتۆر هەڵدەرێژم. ئەم نامەیە لە شارەدێیەکی ناوبزرەوە دەنووسم و بە تەواوەتی ئاگاداری حەقیقەت و ڕاستیەکان نیم. هەواڵەکانم لە رۆژنامان و قسەو باسی سەر زاری خەڵکییەوە بە دەست هێناوە و ڕەنگە هەواڵی سواو وبێ بنج و بناوان بن و ئەو جۆرە رووداوانە هەر لەبنی روویان نەدابێ. ئەگەر وابوو تکاکارم ئەم ئیرادو گلەییەم لێ مەگرە و بمبورە، باوەڕبکەن لەبەر ئەوە ئەم نامەیەم نە نووسیوە کە هەڵە بەرانبەر بەخۆم کراوە، بەڵکو بەرانبەر بە هەموو خەڵکی هەست بە قسورو درێغی دەکەم و ترسی ئەوەم هەیە ئەگەر لەم رووەوە هەنگاوێك نەنەم لەمەش زیاتر کەمتەرخەم دەبم.

من ئەم نامەیە بە شێوازی ئەو کەسانەی کە عادەتەن بەقسەی قەبە و قەڵەوی بەرواڵەت بریقەدار و پرشنگدار، و بە ناوەڕۆك پوك و پوچەڵ بۆ پاشایان دەنووسن و هێندەی دی مەسەلەکانی لێ تاریك و ئاڵۆز دەکەن و هەست و بیرەکانی لەلا تاریك دەکەن، نانووسم، بەڵکو نامەی پیاوێکە بۆ پیاوێکی تر، بە هەست و سۆزی راستەقینە و رێزو حورمەتەوە، بە قسەی روون و ڕەوان و بێ ڕتوش و ئارایشتەوە کە حەقیقەتەکان روونترو ئاشکراتر بنوێنێ.

بابی تۆ، ئیمپراتۆری روسیا کە هەمیشە چاکەی کردووە و چاکەی ڕەعیەتی خۆی ویستووە، بەشێوەیەکی نامەردانە بە دەستی دژمنانی شەخسی نەکوژرا، بەڵکو بە دەستی دژمنانی ئەو نەزم و نیزامەی کە هەبوو، و بەناوی ئایدیا و ئامانجێکی بەرزی مرۆڤایەتیەوە کوژرا. تۆ لە جێگەی ئەو لەسەر تەختی پاشایەتی رۆنیشتیت (دانیشتیت) و نها لە بەرانبەر هەمان ئەو دژمنانە دایت کە ژیانیان لە بابت تاڵ و حەرام کرد. جا ئەوانە دژمنی تۆشن، چونکە تۆ

جێنشینی بابتیو ئەوانیش ئامادەن لە پێناوی وە دەست هێنانی ئامانجەکەی خۆیاندا تۆش بکوژن. هەستی تۆڵە ئەستێنی لەم بکوژانەی بابت، لە ناخی دڵتەوە جۆش دەسەنێ، و لە هەمان کاتدا لەو ئەرکو بەرپرسیاریەتیش دەترسیت کە لە ئەستۆت گرتووە. وەزعی لەمە خراپتر تەسەور ناکرێتو بۆیە واسواسەی بەدکاری، بەتوندی گومرات دەکات، لەرێت دەردەکات، بەخۆتان دەڵێن: ***"دژمنانی نیشتمان، یانی کۆمەڵە گەنجێکی بێ سەروبەرو خوانە ناس کە ئاسودەییو ژیانی ملیونان هاوڵاتی روسیایان شێواندووەو بابیان کوشتووم نها ئالای یاخی بوونیان هەڵکردووە. دەرهەق بەوانە جگە لەمەی کە خاکی روسیا لەم تاعونە پاك بکرێتەوەو ئەوانە وەکو مێروانی خشۆكو ترسناك لە نێو ببرێن چ شتێکی دی دەکرێت، چ چارێکی دی هەیە. سۆزی شەخسی یان تۆڵەی خوێنی بابم بۆ ئەم کارەم هان نادات، بەڵکو ئەركو وەزیفە بۆ ئەم کارەم هاندەدات. هەموو خەڵکی روسیا چاوەروانی ئەم کارەن لە من."*** جا هەر ئەم کەڵکەڵەو واسواسەیە دەبێتە بناغەو بنەماغی خەتەرو مەترسی لەسەر وەزعی تۆ. هەر هەموومان، چ پاشاو چ دێهاتی سادەو ساویلکە بین، خەڵکانێکین، بنیادەمێکین کە مەسیح بە رێنوێنییەکانی خۆی، بە ئامۆژگارییەکانی رێگەی راستی پێ نیشانداوین. من باسی ئەركو مەسئولیەتی تۆ وەکو ئیمپراتۆرو پاشا ناکەم، چونکە ئەركو وەزیفەی ئینسانی لە پێش ئەركو وەزیفەی ئیمپراتۆرییەوەیەو ئەم ئەركو وەزیفانە دەبێ بناغەو هێمی کارو ئەرکی ئیمپراتۆر پێك بێنێو دەگەڵ ئەركو مەسئولیەتەکانی ئیمپراتۆردا تێکبکاتەوە.

خودای گەورە لێت ناپرسێت ئایا وەزیفەو ئەرکی ئیمپراتۆریی خۆت بە جێ هێناوە یان نا؟ لێت ناپرسێت ئایا وەکو تزاری روسیا مەسئولیەتەکانی خۆت بردووەتە سەر یان نا؟ بەڵکو دەخوازێ بزانێ ئایا وەزیفەو ئەرکی مرۆڤانی خۆت ئەنجامداوە یان نا؟ وەزعی تۆ ترسناکەو رێك لەبەر ئەمەیە کە پێویستمان بە رێنوێنیو ئامۆژگارییەکانی مەسیحەو داوای لێدەکەین لەم ساتە هەستیارە وەسوەسە ئامێزەدا کە بەرۆکی هەر مرۆڤێك دەگرێت، فریات بکەوێ. نها ترسناکترین بیروخەیاڵ بەسەرتا زاڵ بووە، بەڵام چەندیش ترسناك بێت، رێنوێنییەکانی مەسیح دەی رەوێنێتەوەو لە هەنبەر کەسێکدا کە گوێڕایەڵو ملکەچی ئیرادەی خوایی بێت، بە بای دا دەدات.

ماتیو(١) ٥/٤٣: "تۆ بیستووتە کە گوتویانە: هاوڕەگەزی خۆت خۆشبوێو ڕقت لە دژمنت بێ. من لە جیاتی ئەوە دەڵێم دژمنەکانیشت خۆشبوێ و سەبارەت بەو کەسانەی کە رقیان لێتە چاکە بکە تا پایەی رۆڵەی خوای گەورەت دەست بکەوێ." هەروەها لە زمانی ماتیوە ٥/٣٨: "بیستووتە کە گوتویانە چاو بە چاوو دان بە دان، من لە جیاتی ئەوە دەڵێم: "ڕادەستی خراپە کردن مەبە" ماتیو ١٨/٢٢: "نەك حەوت جار بەڵکو هەفتا جار هەوت، من دووپاتی دەکەمەوە رقت لە دژمنت نەبێ، بەڵکو چاکەی دەگەڵ بکە. دەستەمۆی خراپە مەبەو هەرگیز درێغی لە بەخشینو لێبوردەیی مەکە." ئەمە ئەرکی مرۆڤە، ئەمەیان دەربارەی مرۆڤ گوتووەو، هەر مرۆڤێك لەسەرێتی ئەنجامی بدات. هیچ جۆرە زەرورەتێکی ئیمپراتۆرییو دەوڵەترانی دژی ئەم دەستوورو فەرمانانە نیە. ماتیو ٥/١٩: ***"هەرکەسێك کە بە بچووکترین ئەم حوکمو فەرمانانە کار نەکات لە***

*قەڵەمڕەوی حکومەتی ئاسمانی دا بچووکترین ئینسانەو بە پێچەوانەوە هەرکەسێك کاریان پێ بکاتو فێری خەڵکی تریشیان بکات، بە یەکێك لە گەورەترین مرۆڤان دەژمێردرێت."*

ماتیو ٢٤-٧/٢٥: *"هەر کەسێك کە بە قسەی من بکاتو بە کاری بێنێ بەلای منەوە وەکو ئەو پیاوە ئاقڵەیە کە ماڵەکەی لەسەر تاوێر ڕۆنابێت.بارانی توندو سێڵاوو گەردەلوول‌و با هۆزی تووش کار لەم ماڵە ناکاتو هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنێت، چونکە لەسەر تاوێر ڕۆنراوە. هەر مرۆڤێك گوێ لەم قسانە بگرێت، مرۆڤێکی مەزنە."*

من چاك دەزانم ئەو جیهانەی کە تیای دەژین تا چ رادەیەك لەو حەقیقەتە خواییانەی کە لە رێنوێنییەکانی مەسیح داو لە دڵی ئێمەدا هەن، دوورە. بەڵام حەقیقەت هەر حەقیقەتەو هەمیشە لە دڵی ئێمەمانانـدا زندووەو بە شەوق‌و زەوقێکی فرەوە هەوڵی بە دەستهێنانی دەدەین. من دەزانم پیاوێکی بێ قەدرو قیمەت، بەد خوو، و کۆیلەی هەموو جۆرە وەسوەسەیەکم‌و هەزار جار لە و کەسانەی کە دژی تۆ ئالآی یاخی بوونیان هەڵکردووە، بێ تواناترم‌و هەرگیز بەرەو حەقیقەتو چاکەکاری نەچووم‌و بۆ کەسێکی وەکو من کە پڕم لە هەموو جۆرە خەراپییەك ئەوپەڕی گوساخیو نابەجێییە بە تەمای ئەوە بم لە تۆ، یانی چاوەڕوانی ئەوە بم لێت کە لە رادەبەدەر بەسەر نەفسی خۆتا زاڵ بیت. لە تۆی ئیمپراتۆری روسیا، کە نزیکانی دڵسۆزو فیداکار دەوریان داویت، بخوازم کە بکوژانی بابت ببەخشیتو لە بری خراپەکەیان لوتفو مەرحەمەتی شاهانەیان دەرهەق بکەیت. بەڵام وێڕای ئەمەش نە دەتوانم‌و نە حەزدەکەم ئەم حەقیقەتو راستییە وەشێرم کە هەر هەنگاوێکی تۆ بەرەو بەخشین، هەنگاوێکی چاکەو هەر هەنگاوێکت بەرەو سزادان، هەنگاوێکی خراپە. هەروەها لەو ساتانەدا کە ئاسودە بیرو خەیاڵ، دوورم لە هەر وەسوەسەو گومڕاییەك، بە هەموو هێزو توانایەکمەوە تێدەکۆشم رێگەی مەحەبەتو چاکە بگرمەبەر،و لە قولآیی دڵمەوە حەزدەکەم تۆش میناکی بابتان لە ئاسماندا بەرەو کەماڵ بڕۆیتو گەورەترین شاکار لەم جیهانەدا ئەنجام بدەیتو بە گژ وەسوەسەدا بچیتەوەو تۆی ئیمپراتۆری روسیا بۆ هەموو جیهان ببی بەسەر مەشقی جێبەجێکردنی رێنوێنییەکانی مەسیح‌و بە چاکە بەرسڤی خراپە بدەیتەوە.

لە هەنبەر خراپەدا چاکە بکەن‌و هەمووان ببەخشن، ئەمە تاقە کارێکە کە پێویستە بکرێ. خواستی خواییش هەر ئەمەیە، بەڵام کێ تواناو دەرفەتی بەکارهێنانی ئەم پەندو رێنوێنییەی هەیەو کێ نیەتی، ئەمەیان مەسەلەیەکی ترە. بەڵام پێویستە تەنیا ئارەزووی ئەوە بکرێتو هەر ئەوەش ئەنجام بدرێ،و هەر ئەمەش بە چاکە دادەنرێت، دەبێ بزانی هەر ئارەزوو و کەڵکەڵەیەکی پێچەوانەی ئەوە، جگە لە واسواسەو وازوازی هیچی تر نیەو لە هەموو ڕوویەکەوە ناپەسندو بێ بناوان‌و ناپایەدارە. هەرچەندە مرۆڤ پێویستە هەمیشە پەیڕەوی مەشیەتی خودا بکاتو ناتوانێ رێنوێنێکی دیکەی هەبێ، بەڵام پەیڕەوی فەرمانە خواییەکان لۆژیکی ترین هەنگاوو هەڵوێستە بۆ ژیانی تۆو ژیانی میللەتەکەتان. حەقیقەتو چاکی، هەمیشە هەر حەقیقەتو چاکین، ئیدی لە سەر زەوی بێ یان لە ئاسمان. عەفوکردن‌و بەخشینی کەسانێك کە بە ترسناکترین شێوە یاسایێن مرۆڤانیو خوایی پایەماڵ دەکەن،و چاکە کردن دەگەڵ ئەو کەسانەدا، بەڕای میانڕەوترین

خەڵکان بە شێتایەتی و ئایدیالیزم دەژمێردرێ و بە بۆچوونی زۆر کەسی دی هەڵەیەکی گەورەیە، بیانوو هەنجەتیان ئەمەیە کە: نابێ عەفوکردن هەبێت، بەڵکو دەبێ عفونەت و گەندەڵی پاك بکرێتەوەو ئاگر لە کوورەدا خەفە بکرێت و نەهێڵدرێ بڵێسە بسەنێت. لێ هەرکاتێ داوا لەم جۆرە کەسانە بکەین کە بیروباوەڕی خۆ روون بکەنەوەو بیسەلمێنن، دەبینی هەر ئەوانن کە شێتایەتی و دژمنایەتی دەکەن. نزیکەی بیست ساڵێك لەمەپێش ئەنجوومەنێك پێکهێنرا کە زۆربەیان خەڵکانی گەنجن و لە سیستەمی باوو رژێم و دەوڵەت پڕو بەداخن. ئەمانە بە تەمای نەزم و نیزانێکی دیکەن، یان لە بنەڕەتدا بە خۆشیان نازانن چ نیزامێکیان دەوێ، بەڵکو هەوڵدەدەن لە رێگەی کارێن دژە خوایی و دژە ئینسانی میناکی ئاگر بەردانەوەو سوتمان نانەوە، تالانی و کوشت و کوشتارەوە ئەو سیستەم و رژێمەی کە هەیە لە ناو ببەن. ئەوە نزیکەی بیست دانە ساڵە دژی ئەم لانەی گەندەڵییە خەبات دەکەن، بەڵام ئەم لانەیە نەك هەر نەڕوخێنراوەو نەڕوخاوە، بەڵکو ئاژاوەچیانی تازەشی پەروەردە کردووە،و ئەم یاخیانە دەستیان داوەتە کارێن ترسناك و زاڵمانەو سەرکێشانەی ئەوتۆ کە ڕەوت و ڕەوشی ژیانی بە تەواوەتی شلۆق کردووە. ئەوانەی کە دەیانویست بە شێوەیەکی سەرڤە سەرڤە(سەتحی) ئەم دومەڵ و جەراحاتە پاك بکەنەوە دوو رێگەیان گرتە بەر: رێگەی یەکەم: ئەوە بوو کە بە توندی بکەونە سەرکوتکردن و تەمبێ کردنی ئاگر هەڵگیرسێنەکان و دومەڵ و کوانەکە لە رەگەوە دەربێنن. رێگەی دووەم: ئەوە بوو کە رێگە بدەن کوانەکە رەوتی ئاسایی خۆی تەی بکات و بەرە بەرە و خۆبەخۆ دەربێ و چاك ببێتەوە. لایەنگرانی ئەم رێگەیە پێیان وابوو بە ئیجرائاتی ئازادیخوازانە دەکرێت ئاگری ئەم یاخی بوونە خەفە بکرێ و هێزێن دژمنکارانە کپ بکرێتەوە.

بە بۆچوونی ئەو کەسانەی کە مەسەلەکە لە رووە مادییەکەوە دەبینن هیچ رێگەیەکی تر نیە، یان دەبێ بە ئیجرائاتی توند ئاگرەکە بتەمرێنرێ، یان بە تەگبیری ئازادیخوازانە خەفە بکرێت. ئەو خەڵکانەی کە لەم هەلومەرجەی ئێستادا بۆ باسی ئەم بویەرو رووداوانە لە دەوری یەکتر خڕ بوونەتەوە، چ خەڵکانی ناودارو ناسراوبن، ئەنجوومەن یان ئەندامانی شوراکان بن یان نوێنەرانی ئەنجوومەن بن، کاتێ بیر لە چۆنیەتی لە بەین بردنی گەندەڵی دەکەنەوە، ناتوانن مەسەلەکە بە شێوەیەکی جیاواز لەم دوو بۆچوونە بخەنە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە. یان ریشەکێش کردنی – بە سەرکەوت کردن، سزادان، دوورخستنەوەو رەهەنەکردن، ئیجرائاتی پۆلیسی، توندکردنی سانسۆر لەسەر چاپەمەنی و بلاڤۆکان و...– و یان بەشێوەیەکی ئازادیخوانەو چاوپۆشی و گوزەشت و بوردن – سووکە جەزا، پەنابردنە بەر یاساو دەستوورو گەنگەشەی پەرلەمانی– خەڵکی هێشتا دەتوانن شتی تازە دەربارەی چۆنیەتی ئەم ئیجرائاتە بڵێن و ئاساییە کە خەڵکانی سەر بە دەستەوەتاقمە جیاوازەکان ناتوانن بە ئاسانی رێکبکەون و لە ئەنجامدا دەگەڵ یەکدا دەکەونە گەنگەشەو مشت و مڕ. بەڵام هیچ دەستەیەك لەم تاقم و دەستانە بە سەرکەوتووی لەم گەنگەشەو باس و خواسانە دەرناچێت و هیچ رێگەو چارەیەك بۆ ریشەکێش کردنی گەندەڵی یان دوورە پەرێزی لە کارێن توندوتیژی نادۆزنەوە، بەڵام دەتوانن ئاگری یاخی بوونەکە کەمێك کز بکەن. تاقمێك تێدەکۆشن کە نەخۆشییەکە بە نەشتەرگەرییەکی گەورە چارەسەر بکەن، بەڵام

دەستەیەکی دی پەنا وەبەر نەشتەرگەی نابەن بەڵکو دەخوازن بە زەبری دەرمان‌و فەراهەنکردنی هەلومەرجی باشترو ساغڵەمتر بۆ نەخۆشیەکە، کاری بکەن کە نەخۆشیەکە خۆبەخۆ چارەسەر ببێت‌و نەمێنێ. زۆر لەگینە کە هەر یەکێك لەم دوو دەستەیە پەنا وەبەر زۆر تەگبیری تازە ببەن یان هەر هیچ نەکەن،و هەردوو دەستەکە پەنا وەبەر هەموو جۆرە تەگبیرێکی پێویست بەرن، بەلام هیچ یەکێکیان نەك نەخۆشەکە چارەسەر نەکەن، بەڵکو نەخۆشیەکەی لێ قورس بکەن‌و درێژا بکێشێت‌و بەرە بەرە بەرەو خەتریی بەرن، بۆیە من پێموایە کە ناشێت دەخالەتی خوایی لە واری دۆزێن سیاسیدا بە جۆرە خەیاڵپەروەری‌و شێتایەتیەك بزانرێت. لە کاتێکا کە پابەندی بە مەشیەت‌و ویستی خواوە میناکی پیرۆزترین پرەنسیب لەم دنیایەداو لەم ژیانەدا تەمەشا بکرێت، نابێ ئەگەر هەموو حیکمەتەکانی ئەم جیهانە دادی چارەسەرکردنی کێشەیەکی نەدا، نابێ بە چاوی سووکەوە تەمەشا بکرێت. جا بۆ شیفای نەخۆشەکە چ پەنابردنە بەر توندوتیژی و چ رێگەدان بەوەی کە نەخۆشییەکە رەوتی ئاسایی خۆی تەی بکات، هیچیان سوودیان نە بەخشیوەو حاڵی نەخۆشەکە بەرەو خراپی‌و خەتەری رۆییشتووە. جا لەم بەینەدا رێگەی دیکەی چارەسەر هەیە، رێگەیەکی سەیری ئەوتۆ کە پزیشکان ئاگایان لێی نیە، بۆچی پەنا وەبەر ئەم رێگەیە نەبرێت؟ هیچ باسێك لەمەڕ سوودەکانی ئەم ئەزموونەوە نیە، لە کاتێکا بێهودەیی رێگەکانی دیکە ئەسەحەو ئەم رێبازە تازەیەش هێشتا تاقی نەکراوەتەوە.

بە بیانووی بەرژەوەندی دەوڵەت‌و قازانجی جەماوەری خەڵکەوە، دەستیان داوەتە قەدەغەکردنی ئازادی، دوورخستنەوەو سزادان‌و هەر بە هەمان هەنجەت‌و بیانووی بەرژەوەندی‌و قازانجی جەماوەر، ئازادیان بە ئاژاوەگێران داوە بێئەوەی لە هەردوو بوارەکەدا هیچ کاریگەرییەکی هەبووبێت. باشە بۆچی نابێت بە ناوی خوداو بێ بیرکردنەوە لە بەرژەوەندی دەوڵەت‌و قازانجی جەماوەری گەل، پرەنسیپ‌و رێنوێنییەکانی ئەو بەکار بهێنرێ؟ دیارە جێبەجێکردنی رێنوێنییەکانی ئەو لە هیچ حاڵەتێکدا هیچ زیانێك ناگەیەنێت.

دیارە چاکیەکی دیکەی ئەم رێبازو رێگەتازەیە ئەوەیە کە دوای ئیسپاتی بێهودەیی‌و بێبەر بوونی دوو رێگەکەی دی بەکار دەبرێت. سەبارەت بە رێگەی یەکەم کە بریتییە لە بەکار هێنانی سزای توند، هەموو کەس دەزانێ ئەم ئیجرائاتە چەند بە رواڵەت دروست بێ، ناپەسندە،و رێگەی دووەمیش دەکاتە دانی ئازادی نابەجێ.

بەمجۆرە دەوڵەت بە دەستێك ئازادی دەداو بە دەستەکەی تری قەدەغەی دەکات. جێبەجێکردنی ئەم دوو رێبازە کە بە رواڵەت بۆ دەوڵەت بە سوود دەهاتە بەرچاو، بۆ جێبەجێکارانی، رێبازێکی نا پەسند بوو، بەلام رێبازە تازەکە نەك هەر دەگەڵ تەبع‌و تەبیعەتی مرۆڤانیدا تێك دەکاتەوە، بەڵکو ئەوپەڕی شادی بە روح‌و گیانی مرۆڤ دەبەخشێت. چاوپۆشی‌و لێبووردەیی‌و بەرسڤدانەوەی خراپە بە چاکە، خۆی لە خۆیدا کارێکی پەسندە. بەم پێودانگە پراکتیزەکردنی دوو رێبازەکەی پێشوو، لە بنەڕەتدا پێچەوانەی گیانی مەسیحیەتەو جگە لە پەشیمانی هیچ ئاکامێکی تری نیە، لە کاتێکدا بەخشین ئەوپەڕی لەزەت بە هەر بەخشندەیەك دەدات.

سێیەمین ئیمتیازی گوزەشتو لێبوردەیی مەسیحیەت بەسەر زەبرو زەنگو سەرکوتکاریو ئیدارەی دەستکردی کاروباران، لەوەدایە کە دەگەڵ بارودۆخو پێویستییەکانی ئێستادا زۆر گونجاوە، چونکە حاڵو پێگەی تۆو بارودۆخی وڵاتی روسیا لە حاڵی حازردا لە حاڵی نەخۆشێك دەچێت کە بە قەیرانێکی ترسناکدا تێدەپەڕیو رەنگە بچووکترین هەڵەو بەکار هێنانی رێبازی بێ سوودو ترسناك، وەزعو حاڵی نەخۆشەکە بە تەواوەتی خەراپ بکاتو بخاتە مەترسییەوە. ئەمە حەقیقەتەکەیە. پەنا بردنە بەر ئیجرائاتی هەڤدرۆ ناکۆك، یان وەڵامدانەوەی خراپە بە سزاێن زاڵمانە، یان هاندانی نوێنەران بۆ زەبرو زەنگو توندو تیژی لەوەیە چارەنووسو ئایندەی وڵات بە تەواوەتی بخاتە خەتەرەوە. لەم دوو هەفتەیەدا کە دادگایی تاوانبارانو دەرکردنی قەرار دەربارەیان دەست پێدەکات، لەو سێ رێگەیەی کە هەیە دەبێ یەکێکیان هەڵبژێردرێت. یەکەمیان کە خراپە بە خراپە لە ناوبردنە ، دووەمیان کە لاوازکردنی ئازادیە، هیچ یەکێکیان هیچی لێ ناڕوێ . دەمێنێتەوە رێگا تازەکە، واتا رێگای پەیڕەوکردن لە پرەنسیپو بنەماکانی مەسیحیەت کە پێویستە تزار میناکی مرۆڤێكو ئەنجامدەرو جێبەجێکاری ئیرادەی خوایی پەیگیری بکات.

**خاوەنشکۆ!** لە ئەنجامی بەدحاڵی بوونێکی ترسناكو شووم کە کەوتە دڵو دەروونی شۆڕشگێڕەکان هەستێکی توندی بێزاریو ڕقو دژمنایەتیان سەبارەت بە بابت بەسەردا زاڵ بوو کە بە کوشتنی ئەو شکایەوە. دەتوانی ئەم رقو دژمنایەتیە بۆ هەتا هەتایە وەکو جەنازەکەی بابتان بە خاك بسپێریت. شۆڕشگێڕان دەیانتوانی، ئەگەر بە ناهەقیش بووە، گلەیی لە بابی تۆ، بە بۆنەی کوشتنی دەیان کەس لە ئەندامەکانیانەوە، بکەن. بەڵام تۆ لە بەردەم خۆتو خوای خۆتا پاكو بێگوناه و بێگەردی. جا ئەگەر تا چەند رۆژێکی دی ئەو کەسانەی کە پێیان وایە پرەنسیپو رێنوێنییەکانی مەسیحیەت تەنیا بۆ باسو گفتوگۆ باشە، و بۆ پاراستنی ژیانی میللەتێك پێویستە پەنا وەبەر خوێن رشتنو کوشتن ببرێت، سەر بکەونو ئاو لە دووی بێڵیان بڕوات، هەنگێ تۆ بە ناچاری لەم حاڵەتی پاکیو ئاسودەیی ویژدانە دەردەچیتو جارێکی دی رێگەی تاریکی دەگریتەبەر و بە ناوی بەرژەوەندی وڵاتەوە هەر ئیجرائێك، تەنانەت پێشێلکردنی قانونی خواو ئینسانش بە حەڵاڵو ڕەوا دەزانیت.

ئەگەر چاوپۆشی و گوزەشت نەکەیتو بەپێچەوانەوە بکەویتە سزادانی تاوانکاران، هیچ کارێکت پێناکرێت جگە لەوەی سێ چوار کەس بە زۆرو بە ناهەق لە نێوان سەدان کەسدا جیا بکەیتەوە،و لە ئەنجامدا خراپە هەر خراپەی لێدەکەوێتەوە، لە جیاتی سێ چوار کەس، سی چل کەس دروست دەبنو پێدەگەنو تۆش ئەو چەند ساتە بە نرخەی کە لە باقی ژیان بەنرخترن لە دەست دەدەیتو بەمجۆرە ئەو ساتانەی کە دەتتوانی بە گوێرەی ویستو مەشیەتی خوایی کار بکەیتو نەتکرد بۆ هەتا هەتایە لە دەست دەدەیتو بۆ هەمیشە بە هەنجەتو بیانووی بەرژەوەندی دەوڵەتەوە خوو بە خراپەوە دەگریت، رێگەی خراپە دەگریتەبەر.

ئەگەر چاوپۆشیو گوزەشت بکەیتو بە چاکە بەرسڤی خراپە بدەیتەوە، هەرچەندە سەدان کەس لە تاوانکارانو خەتاباران نایەنە سەر دینی تۆ، بەڵام وەخۆدێنەوەو لە کەری شەیتان دێنە خوارێو پەنا بۆ خودا دەبەنو لە ئەنجامدا دڵی هەزارانو بگرە ملیونان کەس لەمەی کە لەم ساتە

ترسناك‌و هەستیارەدا، كوڕێك وێڕای ئەوەی بابی كوژراوە،و ئیمپراتۆری ولاتە، بووە بە ڕەمزو ئیلهامبەخشی چاكەكاری، دێتە جۆش‌و خرۆشی شادی‌و داخوڕپان.

**خاوەنشكۆ!** ئەگەر تۆ ئەم پیاوانە بانگ بكەیت‌و پارەیان وێدەیت‌و رایان بسپێرێت بۆ ئەمریكا بڕۆن‌و بەیاننامەیەك لە ژێر سەر ناڤی "دوژمنانی خۆتان خۆش بوێ" بلاوبكەنەوە، من نازانم كاردانەوەی خەڵكی چۆن دەبێت، لیٚ من، یانی هاوولاتی سپلەو بەدكردەوەی تۆ، دەبم بە سەگ‌و خولامی تۆ. هەنگیٚ لە كەیف‌و خۆشیان روندك لە چاوانم دێنە خواریٚ ، وەكو چۆن ئێستاش هەر جاریٚ كە ناوی تۆم بەرگویٚ دەكەویٚ ناتوانم بەری گریانی خۆم بگرم. بەلام بۆچی دەڵێم نازانم كاردانەوەی خەڵكانی دی چۆن دەبێت؟ چونكە دڵنیام ئەم قسانە لە سەرانسەری روسیادا شەپۆلێكی چاكەو مەحەبەت دێنێتە ئاراوە. حەقیقەتی پرەنسیپ‌و بنەماكانی مەسیحیەت لە دڵی بە شەراندا هەمیشە زندووەو ئێمە بە فەزڵی زانینی ئەم حەقیقەتەیە كە مرۆڤانمان خۆش دەوێن.

جا تۆی تزاری روسیا نەك هەر بە قسە، بەڵكو بە كردەوەش ئەم حەقیقەتە ئەنجام دەدەیت‌و پەیڕەوی دەكەیت. ڕەنگە بە لای تۆوە ئاشكراو بەڵگە نەویست بیٚ كە لەبەر ئەم فاكتەرو هۆكارانەی خوارەوە هەڵبژاردنی ڕێگەی بەخشین‌و گوزەشت پەسند تر بێت:

1- ***ئەم ئیجراتە كە هێشتا تاقی نەكراوەتەوە، بە بەراورد دەگەڵ ئیجرائاتەكانی دیدا كە تاقیكراونەتەوەو هیچیان لیٚ شین نەبووە، ئەگەری سەركەوتنی پترە.***
2- ***ئەم ئیجرائە بە قازانجی جێبەجێكارەكەی دەشكێتەوە.***
3- ***ئێستا تۆ لەسەر دووڕیانێكی، ئیدی دەرفەتەو دەتوانی قەراری خۆت بدەی كە بە گوێرەی ڕێنوێنییە خواییەكان‌و بیٚ هیچ پاشگەزبوونەوەو پاشەكشەیەك كار بكەیت، با خەڵكانی دی هەر بۆ خۆیان بڵێن كە ئەم كارە نەكردەنیەو ئەگەر ئەمە بكەیت پایەو بناغەی دەسەلاتی پاشایەتی لەق دەكەیت.***

با وا تەسەوربكەین خەڵكانیٚ بەو تەسەورە ڕاهاتبن كە ئەم ئیجرائە تەنیا لایەنی رۆحانی هەیەو لە ژیانی ئاساییدا قابیلی پراكتیزە كردن نیە. گریمان دكتۆران دەڵێن: ئێمە ئەم پێشنیازانەی ئێوەمان قەبوڵ نیە، چونكە هەرچەندە تاقی نەكراونەتەوەو زیانەكانی بۆ كەس ساغ نەبووەتەوە،و ئەگەرچی ڕاستە ئێمە بە قەیراندا تێدەپەڕین، بەلام پە نابردنەبەر ئەم ئیجرائاتانە، نەك قەیرانەكە چارەسەر ناكات بەڵكو خراپتری دەكات. بەڵگەو بیانووشیان بۆ ئەو قسانە ئەمەیە: چاوپۆشی‌و گوزەشت بە گوێرەی پرەنسیپەكانی مەسیحیەت‌و وەلامدانەوەی خراپە بە چاكە سەبارەت بە تاك، بە یەك مرۆڤ ، لەوەیە باش بێت، بەلام سەبارەت بە ولاتێك بیٚ سوودە، جیٚ بە جێكردنی ئەم پرەنسیپانە سەبارەت بە ڕێڤەبردنی ولات، جگە لە داڕوخان‌و وێرانی ولات هیچی تری لیٚ شین نابێت.

**خاوەنشكۆ!** ئەمانە هەمووی درۆیە، ئەو ئیدیعایەی كە یاسائێن خوایی، مرۆڤان لە قوڕی رەش دەنێت درۆی رووتە. مادامێكی ئەم یاسایانە بۆ بەشەر هاتووە، كەواتە یاسایی خواییەو جگە لەم یاسایە خوایەك نیە. هیچ قسەیەك لەمە دزێوترو ناشیرینتر نیە كە بڵێین یاسائێن خوایی سەبارەت بە بەڕیوەبردنی ولات قابیلی جێبەجێكردن نیە. ئەگەر وابیٚ مانای وایە قانونی خوایی نیە. بەلام

ئەگەر گریمان ئەوە لە یاد بەرین یاساێن خوایی لە سەرووی هەموو یاساکانی ترەوەیەو هەمیشە قابیلی جێبەجێکردن بێت، زۆر باشتر وایە ئەوە لە یاد بەرین کە قانونێن خوایی قابیلی جێبەجێکردن نییە و هەرکاتێ بەکار ببرێ وەزع و حاڵەکان خراپتر دەبێت و ئەگەر تاوانباران بێنە بەخشین و زاندانیان و دوورخراوان ئازاد ببن وەزعەکە خراپتر دەبێت، بەڵام دەبێ ئەم پرسیارە بکەیت بۆچی دەبێ وابێ؟ کێ دەڵێ وا دەبێت؟ چۆن دەتوانن ئەم ئیدیعایە بسەلمێنین؟ ئەم لێکدانەوەیە خۆی لە خۆیدا نیشانەی بێ ئیرادەییە! ئەمە جگە لەوەی هەقی ئەوەت نیە هەموو رێگەو پێشنیازەکانی خەڵکانی دی ڕەت بکەیتەوە چونکە هەمووان دەزانن رێگاکانی تۆ دروست نین. دەڵێن ئەگەر هەموو زاندانیەکان ئازاد بکەن قەتڵ و عام بەرپا دەبێت، و ئەگەر ژمارەیەکی کەم لە زندان رزگاربکەن ئاژاوە روو دەدات و ئەگەر ژمارەیەکی زیاتر ئازاد ببن ئاژاوەی توندتر بەرپا دەبێت. بە جۆرێ قسە دەکەن لە تۆ وایە شۆڕشگێڕەکان تەنیا کۆمەڵە چەتەو رێگرێکن و هیچی ترو هەرکە دەستگیرکران دەبێ وەکو کۆمەڵە ئاژاوەگێڕو شەڕانیەك لە وارو وێخیان بنشیت و لە ڕەگ و ڕیشەوە دەریان بێنی. بەڵام ئەمە ڕاست نیە، حەقیقەت وا ناڵێت. مەسەلەی ژمارە بایەخی نیە و لە ناوبردنیان و دوور خستنەوەو نەفی کردنیان بەژمارەی زۆر رێگەیەکی دروست نیە. بەڵکو دەبێ رێگەیەکی تر بێتە هەڵبژاردن، ئەویش بریتیە لەوەی کە هۆکاری هەڵچوون و یاخی بوونەکەیان لە نێو بەریت. دەبێ بزانی ئەم شۆڕشگێڕانە کێن؟ خەڵکانێکن کە لە نەزم و نیزامی وەخت بێزارن و بە ناپەسندی دەزانن و لە زەین و بیری خۆیاندا نەخشەی نەزم و نیزامێکیان داناوە کە زۆر لە نیزامی وەخت باشترە. بە روخاندن و سەرکوتکاری دژایەتیان ناکرێت، ژمارەیان گرینگ نیە، بەڵکو ئامانجەکەیان گرینگە. بۆ ئەوەی دژایەتیان بکەی دەبێ بیریان بخوێنیەوە. ئامانجیان بریتییە لە خۆشگوزەرانی و یەکسانی و ئازادی بۆ هەموو ئەندامانی میللەت. بۆ یەکسانی و ئازادی بۆ هەموو ئەندامانی میللەت. بۆ دژایەتی ئەوانە دەبێ ئامانجێك بخەیتە روو کە لە ئامانجەکەی ئەوان بالاتر بێ و بەلای کەمەوە ئامانجەکەی ئەوان لە خۆ بگرێت. فەرەنسیەکان، ئینگلیزەکان و ئەڵمانەکان ئێستا کەوتوونەتە دژایەتی ئەوان، بەڵام هیچیان بە هیچ نەکردووە.

تەنیا ئامانجی شیاو ئەوەیە کە بنەمای ئایدیالی ئەوان لە خۆ بگرێت، یانی ئایدیال و ئامانجی مەحەبەت و لێبوردەیی و بەرسڤدانەوەی خراپە بە چاکە. تەنیا بە بەخشین و مەحەبەتی مەسیحیانە و مومارەسەکردنی لەسەر کورسی ئیمپراتۆریەتەوە، و بە باسکردن و گرتنەبەری رێگەی فەرمانڕەوایی مەسیحیەت، دەشێت ئەو خراپ بوونی بارودۆخەی کە ئەمڕۆ یەخانگیری روسیا بووە لە نێو ببرێ و نە هێڵرێت.

لە هەنبەر ئینسانیەتی ئیمپراتۆرێکەوە کە پابەندی یاساێن خوایی بێ، هەر ئاژاوەو شۆڕش و یاخی بوونێك وەکو مۆم لە بەردەم ئاگردا دەتوێتەوەو لە نێو دەچێت.

***پەراوێز:***

***١- ماتیو: Matteo، بە زمانی ئیتاڵیایی یەکێکە لە حەوارییەکانی (یاوەر) مەسیح.***

## بۆ ا. ن. پیپن
## موسکۆ، ١٨٨٤/١/١٠

**ئالکساندر نیکولایوڤیچ**

زۆر خۆشحاڵم کە پەیوەندیت دەگەڵدا بگرم. لە مێژە تۆ دەناسم. باشە، بەوپەڕی خۆشحاڵیو بەکەماڵی مەیلو ئارەزووەوە نامەکانی تورگینیف-ت بۆ دەنێرم، بەڵام دەترسم نامەی زۆری نەدۆزمەوە. زۆر نارێكو پێکم. لە ڕۆژانی جەژنی لە دایکبوونی مەسیحدا بۆ گوند دەگەڕێمەوەو هەر نامەیەکی بدۆزمەوە بۆتی دەنێرم. من هیچ نهێنییەکم نیە کە لە خەڵکی تری وەشێرم، لەبەر ئەوە چۆنت ئارەزوو لێیە سوود لەم نامانە وەربگرە. جارێ ئەو نامەیەت بۆ دەنێرم کە خوشکم بۆ ئێرەی بۆ ناردووم. خوشکەکەم، کۆنتێس ماریا نیکولاڤنا تولستویا کە ئەدرەسەکەی ئوتێلی متروپل-ە لە مۆسکۆ دۆستی تۆرگینیف بووە. تورگنیف منی لەبەر نووسینەکانم خۆشدەویست، بەڵام بەر لەوەی ئاشنایەتی دەگەڵ مندا پەیدابکات، دۆستو ئاشنای خوشکم بوو، و نامەی بۆ دەنارد. بچۆ لای خوشکم، جگە لەم نامەیە، دەبێ نامەێن جوانی دیکەی ئەوی لەلا هەبێ. زۆرم حەز لە کارەکانتە، چونکە بەلای منەوە زۆر جوانن. دەربارەی تورگینیف جارێ هیچ نانووسم چونکە زۆرم پێیە دەربارەی ئەو، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە هەمیشە خۆشمویستووە. بەڵام تەنیا دوای مردنی وەکو پێویست قەدریم زانی. دڵنیام تۆش بە هەمان چاوەوە دەڕوانیتە بایەخی تورگینیف کە من دەی بینم. بۆیە زۆر زۆر لە کارەکەت رازیمو پێی شادو خۆشحاڵم. وێڕای ئەمەش ناتوانم رەئی خۆمی دەربارە نەڵێم. سیفەتی بنەڕەتیو سەرەکی ئەو راستگۆییە. بە بۆچوونی من لە هەر بەرهەمێکی ئەدەبی دا، بە تایبەتی بەرهەمی هونەری، سێ فاکتەری سەرەکی هەیە:

١- چ جۆرە پیاوێك قسە دەکات؟

٢- چۆن قسە دەکات؟ باش یان خراپ؟

٣- قسەی بیرو زمانی یەکە؟ ئایا ئەوەی بیری لێدەکاتەوەو هەستی پێدەکات تەواوە؟

بە بۆچوونی من ئاوێتە بوونو یەکانگیری ئەم سێ فاکتەرە بناغەو سەرچاوەی بەروبوومی هزری بەشەر پێکدێنێ. تورگینیف پیاوێکی فرە خاس بووە - هەڵبەتە نە زۆر قوڵ، و تا ئەندازەیەك لاواز، بەڵام دڵپاكو بە ئەدەب - کە هەمیشە ئەوەی لە بیرو هەستیا بووە، ئەوەی بەسەر زارەوە بووەو ئەوەی گوتووە، قسەی دەمو دڵی یەك بووە. ئەو سێ فاکتەرەی سەرێ بەدەگمەن لە بەرهەمێن خەڵکی دیکەدا، وەکو بەرهەمەکانی تورگینیف یەکانگیر بووە. دیارە لەمەش زیاتر لە نووسەرێك چاوەڕوان ناکرێت، لەبەر ئەمە بەرهەمی تورگینیف لە ئەدەبیاتی ئێمەدا باشترینو پڕ بەرەکەت ترین بەرهەم بووە. تورگینیف باش دەنووسێتو بەردەوام خەریکی خوێندنەوەو موتالا بووەو ئەنجامی خوێندنەوەکانی لە بەرهەمەکانیا ڕەنگی داوەتەوە. تورگینیف بە پێچەوانەی

**خەڵکانی ترەوە، سوودی لە توانا و بەهرەی خۆی، توانا و بەهرەی چاکە نوێنی، بە مەبەستی وەشێردنی روحی خۆی، نەدیتووە، بەڵکو هەوڵیداوە هەموو شتێك ئاشکرا بکات. هیچ جۆرە دوو دڵی و ترسێکی نەبووە، بە بۆچوونی من ژیان و بەرهەمێن وی بە دوو قۆناغدا رۆییون:**

**١- ئیمان بە جوانی، ڤیان سەبارەت بە ژن و هونەر، ئەم ئیمان و باوەڕە لە گەلێك لە بەرهەمەکانیا بەرجەستەو دیارە.**

**٢- بە گومان بوون لەم ئیمان و باوەڕە، یانی گومان کردن لە هەموو شتێك و ئەم حەقیقەتە بە شێوەیەکی خەمناك لە بەرهەمی "بەسە"دا دیارە.**

**حەزم لێیە شتی زیاتری دەربارە بڵێم، زۆرم پێ ناخۆش بوو کە نە یان هێشت قسەی لە بارەوە بکەم((١))**

**ئەمڕۆ یەکەم رۆژە کە لە هەڵەچنی ئەو کتێبەی کە بۆ چاپم ئامادە کردووە، بوومەوە، دوێنێ دوا هەڵەچنکراوەکەم بۆ چاپخانە بردەوە، لێ نازانم دایەرەی سانسۆر چ قەرارێکی لەسەر دەدا((٢)). باوەڕناکەم مۆڵەتی چاپی بدەن. لەلایەکی تریشەوە پێموانیە بتوانن رێگەی لێبگرن. دۆستانە دەستەکانت دەگوشم.**

***ل. تولستوی***

***پەراوێز:***

***١- دوای مردنی تورگینیف لە هەیڤی ١٨٨٣/١٠ ئەنجوومەنی لایەنگری ئەدەبیاتی روسیا ویستی کۆڕێکی فراوان بۆ یادی تورگینیف بگێڕێت و داوا لە تولستوی بکات کە لەو کۆڕەدا وتاربدات، لێ سەرۆکی دایەرەی چاپەمەنی دەوڵەت گوتی کە تولستوی پیاوێکی شێتە و دەبی چاوەڕوان و پێشبینی هەموو شتێکی لێبکرێ. لە ئەنجامدا فەرمانڕەوای مۆسکۆ کۆڕەکەی هەڵوەشاندەوە.***

***٢- مەبەستی تولستوی کتێبی (باوەڕی من لە سەر چ بنەمایەکە؟) کە بە زەبری چەند راپۆرێکی مەدەنی و ئاینی کتێبەکە کۆکرایەوە و نەهێڵرا بڵاوبکرێتەوە.***

## بۆ ت. م. بنداروف

## مۆسکۆ، ١٨٨٦/٣/١

**پارەکە نامەکەتم پێگەیی بەڵام نەمتوانی وەڵامت بدەمەوە. دوێنێ نامەیەکم لە لیونید نیکولاڤیچەوە پێگەیی کە پەیوەندی بە تۆوە هەبوو، نها وەڵامی هەردوو نامەکە دەدەمەوە.**

وتارەکەی تۆم بۆ گەلێك لە دۆستانی خۆم کۆپی کردووەتەوە. بەڵام هێشتا بە چاپم نەگەیاندووە ئەمڕۆکە بە پۆستەدا بۆ گۆڤاری (سەروەتی روسیا)ی دەنێرم کە لە پترزبۆرگ دەردەچێت ،و بە گوێرەی توانا هەوڵدەدەم بە دڵی تۆ و بێ هیچ جۆرە دەسکاریو لێ لابردن یا زیادەکردنێك بڵاو ببێتەوە. هەرکاتێ بڵاوبێتەوە نوسخەیەکت بۆ دەنێرم. زۆر شتی بە کەڵکم لە وتارەکەی تۆ دەرهێناوەو هەڵێنجاوەو لەو کتێبەدا کە دەربارەی هەمان بابەت خەریکی نووسینیم باسی دەکەم، و دەڵێم ئەم بابەتانەم لە بەرهەمێن زانایانو دانایانی ناودارەوە وەرنەگرتووە، بەڵکو هی (ت. م. بنداروف)ی دێهاتیە. زۆر حەزدەکەم نووسینەکانی خۆم دەربارەی ئەم بابەتە بۆ تۆ بنێرم، لێ نزیکەی پێنج ساڵە ئەوەی لەمبارەیەوەو دەربارەی ئەمەی کە "چۆن بە گوێرەی رێنوینییە خواییەکان دەژیم؟" دەنووسمو لەلایەن حکومەتەوە قەدەغە دەکرێتو کتێبەکانم یان دەبن بە خۆراکی ئاگر یان رێگەی بڵاوبوونەوەیان نادرێت . هەر لەبەر ئەمەشە کە بۆم نووسیت بە خۆڕایی خۆت ئەزیەت مەدە کە داوای مۆڵەتی چاپکردنیان لە وەزارەتی ناوخۆ یان شەخسی ئیمپراتۆر بکەیت. چونکە چ ئیمپراتۆرو چ وەزیران رێگە نادەن لەم بارەیەوە تاقە قسەیەك بکەیت.بۆیە دەترسم کە رێگە نەدەن وتارەکەی تۆ بە تەواوەتی بڵاو ببێتەوە، مەگەر خۆڵاسەیەکی کورتی بڵاوببێتەوە. حەزدەکەم بەرهەمە بە نرخو شایستەکەی تۆ بخوێنمەوە، بەڵام تا ئەم جۆرە کێشەو کۆسپو لەمپەرانە هەبێ هیچ کارێك ناکرێت.

من پێموایە هەرکاتێ مرۆڤ حەقیقەتی خوایی دەرك کردو خستیە سەر زمان یان نووسی. هەرگیز قسەکانی لە نێو ناچن. موسا لە دیتنی خاکی مەوعود مەحروم کرا کەچی میللەتی ئیسرائیلی بەرەو ئەو خاکە رابەرایەتی کرد. جا ئەم حەقیقەتە بۆ هەر هەموو بەندەکانی خوا راستو دروستە. ئەو جوتیارەی کە ئاوڕێکی پاشەوە دەداتەوە تا بزانێ چەندی جووت کردووە، بەد سروشتە. من ئەم قسەیە دەربارەی خۆم دەگێڕمەوە، کاتێ کە کتێبانی بێ بایەخم دەربارەی بابەتێن سواو دەنووسیو ستایشی خەڵکانم دەکرد، پێشوازی لە بەرهەمەکانم دەکراو بەردەوام بڵاودەبوونەوەو تەنانەت تزارش دەیخوێندنەوەو ستایشی دەکردن، بەڵام هەرکە ویستم بکەومە خزمەتی خوداو ئەوە بە مرۆڤان نیشان بدەم کە بە گوێرەی یاسایێن خوایی کار ناکەن، هەمووان لێم راپەڕینو کتێبەکانم قەدەغەکرانو سوتێنرانو دەوڵەت منی بە دژمنی خۆی دانا. وێڕای ئەمەش حەزدەکەم پێت بڵێم کە ئەم وەزعو حاڵو ڕەوشە خەمبارو ناڕەحەتم ناکات، بەڵام دەبێتە مایەی شادمانیم. چونکە دەزانم ئەم خەڵکانە بۆچی لە بەرهەمەکانی من دەڕەونەوەو هەست بە بێزاری دەکەن. لەبەر ئەوەیە کە باسی یاسایێن خوایی دەکەمو ئەوانیش ئەم یاسایانەیان بە خەیاڵی خۆیان پایەماڵ کردووە، لە کاتێکا من دەزانم یاسایێن خوایی نایەتە وەشێرتنو ناتوانرێ بکرێن بە خۆراکی ئاگرو لە نێو ببرێن. بەڵکو تا زیاتر دژایەتی بکرێن، لە بەرچاوی ئەو کەسانەی کە روو لە خودان روناکتر دەنوێنن. جا لەبەر ئەمە تۆش لەبەر ئەوەی وەڵامی داوەکەت نەدراوەتەوەو وەڵامەکەیت وەرنەگرتووە نائومێد نەبیت و بڵێی ئەو کەسانەی کە زویریان کردوویت عەفو دەکەی. هەروەها لەوەش مەڕەنجێ کە خزمانت ، کەسە نزیکەکانت لە هزرو بیری تۆ حاڵی نابنو قەدری نازانن. تۆ باکت چیە؟ بە هەرحاڵ هیچ کارێکی مرۆڤانی نیە لە پێناوی

غرورو خۆپەرستیدا خۆت ئازار بدەیت.هەرکاتێ لە رای خودادا هەوڵ بدەی خودا کاری تۆ دەبینێو پاداشتی هەر کارێکت دەداتەوە. ئامانجی تۆ ئامانجێکی خواییەو بەری خۆی داوەو دەدات، بەڵام نابێ چاوەڕوانی ئەوە بیت بەری رەنجی خۆت بدینیو بیخۆیت، من بە تەجروبە بۆم دەرکەوتووە کە نووسینەکانی تۆ یارمەتی خەڵکانێکی زۆری داوەو لە ئایندەشدا یارمەتیان دەدات. هەڵبەتە بە تەمای ئەوە مەبە بەری ئەم رەنجو زەحمەتانە وا زوو بە زوو بدوریتەوە،و ناشبێ چاوەڕوانی شتی وا ببی.

ناتوانم هەموو خەڵکی وادار بەکارکردن بکەم، چونکە هەموو هێزەکان، هەموو کارتەکان لە دەستی کەسانێکن کە حەزیان بە کارکردن نیە. خەڵکی دەبێ بە خۆیان بگەنە قەناعەت کە ژیان بە کارو کارکردنەوە، یەجگار لە بێکاریو مشەخۆری خۆشترو سوودمەندترە. زۆر کەس پەی بەم حەقیقەتە دەبەنو بە خوایشتی خۆیان دەست لە مێملیو مشەخۆری هەڵدەگرنو بە تینو تاوێکی زۆرترەوە دەکەونە کاری کشتیاری. گومڕایان بە پێچەوانەوە خۆیان لە گێلی دەدەنو خۆیان لە ئاست ئەم حەقیقەتە نابینا دەکەن، بە هەموو هێزو توانایانەوە داکۆکی لە بێ کاری دەکەنو تا ماوەیەکی زۆر پەی بە هەڵەی خۆ نابەن. و هەڵبەتە تا ئەو کاتەی کە حەقیقەت دەرك ناکەن هیچ کارێکیان دەربارە ناکرێتو دەبێ یاسا خواییەکانیان بۆ روونو شەرحو شرۆڤە بکەی تا بەرەو حەقیقەتیان رێنوێنی بکەی.

تۆ ئەم ئەرکە ئەنجام بدەیتو لەم رێگەوە خزمەتی خودا بکەیت، هەنگێ بۆت دەردەکەوێ کە چۆن سەرکەوتن بۆ تۆ دەبێت نەك بۆ ئەوان. بەڵام ئایا زوو بەزوو پەی بەم حەقیقەتە دەبەیت؟ ئەمە بەندە بە ویستو مەشیەتی خواییەوە. ئەمە باوەڕی منە.

خودا ئاگاداری دۆستی هێژاو بەرام تیموف میخائیلوڤیچ بێ! خودا یاوەرتان بێ! ئەگەر وتارەکەتان بڵاونەبووەوە بۆتی دەنێرمەوە.

## بۆ و. ئای. ئالکسیف
## ئۆکتۆبەر – دێسەمبەر/ ١٨٨٦

**دۆستی ئازیزم ڤاسیلی ئیڤانوڤیچ**

دڵم بە حاڵت دەسووتێ دۆستی ئازیزم! بەڵام لێم مەگرە ئەگەر بڵێم ئەوەندەی خەمباری ئەوەم کە روحی پڕ میهری تۆ ئالکاوی ڤیانێکی ئەمەندە بچووكو تایبەتی بووە، ئەوەندە خەمباری لە دەستدانی کچەکەی تۆ نیم. خۆشویستنی خوداو بەشەران، بەبێ خۆشەویستی کەسێکی

تایبەتی بە هەموو تین‌و تاوێکی رووحەوە، تەسەورێکی پوچە، بەڵام خۆشویستنی کەسێك پتر لە خوداو بەشەران تەسەورێکی زۆر لەوەش پوچترو بیٚ ماناترە. من لەم دواییانەدا زۆر نەخۆش بووم‌و لە هەموو کاتیٚ پتر بە راشکاوی بیرم لە مەرگ کردەوەو بەم ئەنجامە گەییم کە ژیان‌و مردن بەو جۆرەی لە نێو ئێمەدا باوە ئەوە دەخوازیٚ کە ئەوپەڕی سوود لەو هێزە وەربگرین کە ئێمەی خوڵقاندووە. یانی پێویستە بە ئەشقەوە مومارەسەی ژیان بکەین‌و دنیا بەجیٚ بێڵین. بەڵام وەکو تۆش دەزانیت ئەم وشەو زاراوانەی ڤیان‌و مەحەبەت‌و خۆشەویستی لە رادەبەدەر ئاڵۆزن. هەموو کەسێك وەکو پێویست بیر لەم وشانە ناکاتەوەو نایزانێت، بەڵام پەی بردن بە مانای ئەم قسانە تاقە رێگای رزگارییە. بەڵام چۆن‌و لە چ روویەکەوە؟ من بەش بە حاڵی خۆم تا ماوەیەك لەمەو پێشیش زۆر پەیم بە مانای ئەم وشانە نەبردبوو. بە بۆچوونی من رێگەی راست‌و دروست بەمجۆرەی خوارەوەیە: وەکو چۆن پەندو ئامۆژگاری پێشینان دەڵێت: پێویستە رێنوێنییە خواییەکانمان خۆش بوێت. یانی چاکەو راستی بکەین بە رێنوێنی خۆمان، چاکەو راستی بکەین بە رێگەو رێباز، چاکەو راستیدۆستیش دەکاتە پراکتیزەکردن‌و بڵاوکردنەوەو بەباوکردنی چاکە بە گوێرەی تواناو دەرفەتی خۆت. ئەمە یەکەم کارە کە دەبیٚ مرۆڤ ئارەزووی بکات‌و بە جۆریٚ ئەنجامی بدات کە شوێنەواری کارەکانی – چەند بچووك‌و کەمیش بیٚ– بۆ خۆی دەربکەویٚ‌و بە چاوی خۆی بیبینیٚ. بەبیٚ جێبەجێکردنی ئەم مەرجە هەوەڵین‌و سەرەتاییە، چاکەدۆستی مەحاڵە، چاکە دۆستیەك کە شادمانی‌و بەختەوەری لە نێو بەشەراندا چێبکات. بەڵام هەرکاتیٚ ئەم ئاوات‌و ئارەزووەت تێدا هەبێت‌و بتەویٚ حەقیقەت‌و چاکە لە دنیادا بڵاوبکەیتەوە – دەیڵێمەوە ئەگەر بەرادەیەکی کەمیش بیٚ– پێویستە ئەم ئەشق‌و دۆستایەتیەت دەربارەی بەشەران لە قۆناغی یەکەمدا دەربارەی ئەو بەشەرانەی کە لە حەقیقەتەوە دوورن، پیشان بدەیت. جاریٚ واز لەو بەشەرانە بێنی کە کەمتر لە خەڵکانی دی لە حەقیقەتەوە دوورن‌و تەنیا بە تەوازع‌و مەحەبەتەوە رەفتاریان دەگەڵ بکەیت‌و لە هەمان کاتدا بە دڵ‌و گیان ئەو کەسانەت خۆش بویٚ کە پەیان بە گرینگی‌و بایەخی چاکەو ڕاستی بردووە. ئەوانەت، بە تایبەتی مناڵان، زۆر خۆش بویٚ. چونکە ئەوانە بۆ ئامانج‌و ئایدیالێك تێدەکۆشن کە هێم‌و بناغەی ژیانی ئێمە پێکدێنیٚ‌و لە من باشتر، کە لە ئاست واسواساندا گەندەڵ بووم‌و ژیانم لەوتاندووە، تێدەکۆشن‌و دەخەبتن. بەم شێوەیە تۆش (ناجا)ت خۆش ویستووە، بەڵام بۆ تەنیا هەر ئەوت خۆشبویٚ؟ خۆ ئەگەر هەمیشە هاوڕەگەزانی خۆت لەبەر ئەوەی کە باشترین خزمەتگوزارانی پرەنسیپ‌و رێنوێنییە خواییەکانن خۆش بویستبایە بەم ڕادەیە بۆ مەرگی کیژە ئازیزەکەت خەمناك‌و خەمبار نەدەبوویت. ڤاسیلی ئیڤانوڤیچ! بۆیەم خۆش دەویێی چونکە لوتفێکی زۆرت بەرانبەرم هەیە،و سوپاست دەکەم کە لەو کەڵکەڵەو واسواسەیەی کە هەڕەشەی لێدەکردم رزگارت کردم(١).

بەڵام بەرەئی من لەو دواییانەدا وەکو پێویست گوێت بە رۆحی خۆت نەداوەو گیاکەڵە ، هزرو زەینی گرتوویت. وەستان ناشێت. دەبیٚ بچیتە پێشیٚ‌و هەموو هێزو توانای روحی خۆت بخەیتەکار. دۆستی ئازیزم من داوای بوردن دەکەم کە هەمیشە لە جیاتی دڵدانەوە، لە سەرواقیعی سۆزداریتان کە زۆر شارەزای نیم، بەڵام دەتوانم مەزندەی لێبدەم، سەرزەنشتتان

دەکەم. تەنیا یەك فاکتەر دەبێتە مایەی رەنج و خەمباری، ئەویش ئەم ئیعترازو ناڕەزایەتیەیە کە وێڕای چاکەکاری و خەڵکدۆستی، بۆ دەبێ گیرۆدەی ئەم کۆست و کارەساتە ببم؟ تاقە مایەی تەسەلاو دڵخۆشی تۆ پێویستە ئەوەبێ کە بەخۆت بڵێی من ئەرکی خۆم جێبەجێ کردووەو هیچ درێغییەکم نەکردووە. تۆ خودانی هێزێکی مەعنەوی مەزن و گیانێکی چاکەکارانەو توانایەکی ڤیان و مەحەبەت ئامێزی گەورەیت، بۆیە نابێ دوچاری بێ ئومێدی ببیت، بەڵکو دەبێ درێژە بە ژیان بدەیت و لە ڕای خودادا خزمەت بکەیت تا بەوپەڕی مەمنونیەوە، قەرەبووی ئەو خۆشی و شادیە بکەیتەوە کە لە ژیاندا هەستت پێکردووە، تەمەتوعت پێوە کردووە. توند توند لە هەمێزت دەگوشم، نامەم بۆ بنووسە.

*ل. ت*

***پەراوێز:***

***١- ڤاسیلی ئیڤانوڤیچ لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا ئەوە باس دەکات چۆن کاتێ تولستوی داوای لێکردبوو یارمەتی بدات کە لە واسواسەو کەڵکەڵەی ڤیانی ئاشپەزی مسکێنەکانی رزگاری ببێ، و چۆن رێنوێنی دەکردو لەو ئەشق و ڤیانە ناپوختەو نا بەجێیەی سارد دەکردەوەو دەیگەڕاندەوە.***

## بۆ ئا. ئی. ئەرتل
## یاسنایا پولیانا، ١٨٩٠/١/١٥

**ئالکساندر ئیڤانوڤیچ**

دەربارەی ناپلیون هیچ بابەتێکم نیە(١)، هەڵبەتە زۆر ڕاستە کە باوەڕو بۆچوونی خۆم لەمەڕ ئەو نەگۆڕیوەو لە هەموو روویەکەوە بەو باوەڕەمەوە پابەندم، هیچ لایەنێکی ئەرێنی لە ژیانی ئەودا نابینم. باشترین بیوگرافی ئەو پیاوە "بیرەوەرییەکانی سانت هیلانە"و یاداشتەکانی دکتۆرەکەیەتی. دەربارەی کەسایەتی ئەو دەکرێ ئەوپەڕی لاف و گەزاف لێبدرێ، بەڵام چارەی بەرەواژو ئاوەژوو و قەڵەوی بەو ورگە زل و کڵاوە عەنتیکەیەوە کە لە دورگەی سانت هیلانەدا پیاسەی دەکردو یادگاری ژیانە دەستکرد ئامێزەکەی خۆی هەڵدەدایەوە زۆر قێزەوەرو نەفرەتئەنگێز بوو. لە خوێندنەوەی ئەو کتێبە زۆر ناڕەحەت و بێزار بووم، بەداخەوەم بۆچی دەربارەی ئەم قۆناغەی ژیانی ئەو وەکو پێویست موتالاًم نەکردووە. ئەم ساڵانەی دوایی ژیانی ئەو کە تیایدا هەوڵدەدات کۆمیدیای شکۆی خۆی نمایش بکات، بەڵام خۆی لەلای عەیانە کە سەر ناکەوێ، بە چاکی شکستی تەواوەتی ئەخلاقی و مەرگی پەندئامێزی ئەو نیشان دەدات. دەبوایە. ئەم بەشەی ژیانی، بەشە هەرە گرینگەکەی ژیاننامەکەی پێك بێنێ. سەبارەت بەچیرۆکی (سوناتای کروتزر)، دوێنێ ناردم بۆ سوروزنکۆ، ئەو گەرەکیە بە لابردنی هەندێ بەشی، مۆڵەتی

چاپکردنی لە دایەرەی سانسۆر وەربگرێت. حاڵی حازر خەریکی کۆپی کردنین، هەرکاتێ پەرژام نوسخەیەکت بۆ دەنێرم. خودا یارو یاوەرتان بێ. ئەگەر بە هەڵە نەچووبم، دەستت داوەتە نووسینی بیوگرافی ناپلیۆن و بودا. ئاها! تۆ دەتوانی چ کتێبانێکی باش بۆ جەماوەری خەڵك بنووسیت. خودا ئاگادارت بێ.

*ل. تولستوی.*

***پەراوێز:***

***١- چرتکوف پێشنیازی بۆ ئەرتل کردبوو کە بیوگرافی ناپلیون بنووسێت. ئەم کتێبە بە چاپ نەگەیی، بەڵام ئەم نامەیە ئەوە نیشان دەدات کە بۆچوونی تولستوی دەربارەی ناپلیون دوای بڵاو بوونەوەی ڕۆمانی شەڕو ئاشتی، داوای زۆری لەسەر بوو بێ...***

## بۆ ن. ن. کولکا
## یاسنایا پولیانا، ١٨٩٠/٤/٩

کولکا دۆستی ئازیزم، چتۆ دەشێت من تۆم خۆش نەوێت. من بۆیەم تۆ خۆش گەرەکە چونکە یەکەم مەسیح دەخوازێت ڕۆڵەی بەشەر یەکتریان خۆشبوێ. دووەم بۆیەم خۆش گەرەکیت چونکە دۆستو هاوکاری منو هاوبیرو باوەڕمیت. ئایا ئەمە شایانی خۆشەویستیو مەحەبەت نیە؟ سێیەم کە لە هەموو ئەوانی دی گرنگترە، تۆم لەبەر خاتری خوداو خودی خۆم خۆشدەوێ. چەند لە کۆتایی ئەم ژیانە نزیکتر دەبمەوە – هەستدەکەم زۆر لە مەرگەوە نزیکم– لە نێو هەر هەموو هـزرو بیرو هەستو سۆزو ئیعترافاتەکانمدا خاڵێك زیاتر لە جاران بەرجەستە دەبێ و دەردەکەوێت کە بە بۆچوونی من نەك هەر بە گرینگترین خاڵ دێتە ژماردن، بەڵکو تاقە خاڵێکە کە دەکرێت لەبەر ڕۆشنایی بژیت،و نها من بە پشتیوانی ئەو خاڵە دەژیم. هەموو ڕۆژێك چەندین جار بەمجۆرە دەپاڕێمەوە، دوعا دەکەم: "ئەی بابی من کە لە ئاسماندایت، تەنیا یەك شت لەم دنیایەدا بەلای منەوە پیرۆزە، ئەویش ناوی تۆیە – یانی جەوهەری تۆیە– جەوهەری تۆش جگە لە ڤیان، لە مەحەبەت، هیچی تر نیە. تەنیا یەك ئاواتم هەیە، ئەویش ئەوەیە کە دەسەڵاتی تۆ، حکومەتی تۆ، یانی ڤیانو مەحەبەت لە سەرانسەری دنیادا بەرقەرار بێتو بڵاوببێتەوە. وەکو چۆن لە ئاسماندا هەتاو و مانگو ستێران بێ هیچ جۆرە پێکادانێك هەڵدێنو ئاوا دەبنو هیچ جۆرە کێشەو کێشماکێشێك لە نێوانیاندا روو نادات. لە تۆم داوایە لەم دنیاشدا پەیوەندییە مرۆڤانیەکانی ئێمە بە کۆمەکی ڤیانو مەحەبەت، بێ هیچ کێشەو پێکادانێك روو بدەن.

جا بۆ بەشداری لە بە رقەراری حکومەتو دەسەڵاتی ڤیان، ژیانم پێ عەتا فەرموو، چونکە ئەمەیە ژیان. کارێ بکە – یان وەکو ئارەزوومە – کە هەڵەکانی رابردووم لەمەڕ ڤیان – هەڵەی ترم نین –

**نەبنە کۆسپ و لەمپەڕی ژیانی ئەمڕۆم و منیش لەلای خۆمەوە هەموو هەڵەکانی خەڵکانی دی لەمەڕ ڤیان بە تەواوەتی لە هزرو ویژدانمدا بسڕمەوە. لە ڕق و توڕەیی و خزین و نەخۆشی کە کۆسپین لە ڕێگەی پەرەسەندنی ڤیان، رزگارم بکە. بە تایبەتی خۆم و دڵم لە توڕەیی و ڕق و نوقستانی ڤیان و مەحەبەت رزگاربکە.**

**بەمجۆرە من دەپاڕێمەوە، دوعا و نزا دەکەم و هەموو جارێکیش دوعایەکەم دەگەڵ هەلومەرجەکانی ژیاندا پێکدەگرم و بەمجۆرە هەوڵدەدەم بژیم. بۆیە سەبارەت بە ڕابردوو زۆر لە ئامانج نزیك دەبمەوەو فێردەبم خۆ لە ڕق سەبارەت بە حەیوانات و کەسانی غایب و گریمانەیی بپارێزم و بێهوودە پێنەکەنم. بەتایبەتی فێری ئەوە دەبم بە گوێرەی توانا، ئەوەندەی لە توانامدا بێت هیچم بۆ خۆم نەوێت و شوێنی پێویست لە دڵی خۆدا بۆ ڤیان و مەحەبەت بکەمەوەو بەم ڕێگە نیمچە ئاسانە بەرقەرارییەك بە پەیوەندییە باشەکانم دەگەڵ هاوسەرەکەم یان سیرزا یان ڕۆژنامەنووسان و پەیامنێران و هەروەها مەی نۆشان دەبەخشم،و چەند لە مەرگ نزیکتر دەبمەوە زیاتر چاوم دەکرێتەوەو ڕوونتر دەبینم. ئەمە تاقە ئەرکی ژیانی ئێمەیە کە پێویستە بخرێتە سەرووی هەموو ئەرکەکانی ترەوە. ئەمە ئەرکێکی فرە مەزن و بێ کۆتایی و گشتگیرەو هۆو نیشانەی حەقیقەتی ئەم ئەرکە لە خودی خۆیدا پەنهانە.**

**ئەمە ئەو هۆیەیە کە لەگینە ببێتە مایەی ئەوە کە تۆم خۆش نەوێت و بە داوای لێبوردنەوە بەڵگەو بیانووەکانی تۆ دەربارەی گورگان(١) بە هەند نەگرم. دەزانم نە تۆ گورگیت و نەچرتکف، بەڵکو هەموومان لایەنی لاوازمان هەیە، ئەگەری هەڵەکردن و لە ڕێ دەرچوون و خزانمان هەیە، وەکو ڕوبار لە ڕۆییشتنداین، هەندێجارێ پاك و قوڵین، هەندێجار لێڵ و تەنکین.**

**کاتێ کە دەڵێیت لە مەوقیعی ئێمەماناندا دەبێ یەکەم ئامانجی ئێمە چاوپۆشیکردن بێت لە سەروەت و سامان، ڕاست دەکەیت . پێویستە لەمبارەیەوە یارمەتی یەکتر بدەین و هەرکەسەو لەلای خۆیەوە هەوڵی خۆی بدات. من بەش بە حاڵی خۆم ئەم ڕێگەیە دەگرمە بەر، تکام وایە پێم بڵێی ڕای تۆ چیە؟و پێویستە لەمبارەیەوە چ ڕەفتارێك بگرمە بەر؟ هیچ ترسێکت لەوە نەبێ کە لەگینە دوچاری هەڵە ببیت. بیروبۆچوونی خۆت بە ئاشکرا بڵێ، تۆ لەمبارەیەوە زۆربەی شتەکان زۆر لە من ڕوونتر دەبینی.**

***ل. ت***

***پەراوێز:***

***١- تولستوی لێرەدا ئاماژە بۆ نامەیەکی پێشتری کولکپی دەکات کە لەو نامەیەدا نووسەر جیاوازی بیروباوەڕی خۆی و چرتکوف-ی خستبووە ڕوو.***

## بۆ ئیمپراتۆر ئالکساندری سێیەم

### مۆسکۆ، ٢-١٨٩٤/١/٣

**خاوەنشکۆ!**

ئەگەر شێوازوتۆنی ئەم نامەیەو ئەو داوایانەی کە لە خاوەنشکۆتانم هەیە لەو نامەو داوایانەی کە پێیان ڕاهاتووی جیاواز بێ، داوای بوردن دەکەم. بیکە بە خاتری خوا بمبورەو بێ هیچ دڕدۆنگیەك موتالأی فەرموو، چەند دەکرێت بە هەمان ڤیانو مەحەبەتی برایەتیەوە، کە تایبەتە بە تیرەی بەشەرەوەو تاقە فاکتەرە کە منی بۆ نووسینی هانداوە، تەمەشای بفەرموو، لە ئۆکتۆبەری ئەمساڵەوە – لە ڕاستیا لە پارەوە ١٨٩٣– بە ناوی تۆوە زاڵمانەترینو نەنگیترین تاوان کە پێچەوانەی هەموو یاسایەکی خوایی و مرۆڤانیە، دژی شازادە دیمیتری ئالکساندرۆڤیچ، سەرهەنگی خانەنشین کە حاڵی حازر لە تاراوگەی قەفقازە ،لەسەر بیروباوەری مەزەبی وبەتایبەتی دژی هاوسەرەکەی ئەنجام دراوە. بە خۆت لە نامە هاوپێچو پاشکۆکەدا کە چونکە ڕاستەوخۆ ئاراستەی تۆ نەکراوە، بۆیە مەرجەکانی نامەیەکی دەرباری تێدا ڕەچاو نەکراوەو من بە ئانقەست هیچ دەسکارییەکم نەکردووەو تاقە وشەیەکم بۆ زیاد نەکردووە، بۆتان دەردەکەوێ کە لە زەمانی ئێمەدا ئەو ئیفتراو بوختانەی کە بە قسەی هەموو جێبەجێکاران، بە ناوی تۆ و یانی بەناوی دەسەڵاتی باڵاوە ئەنجام دراوە ، چەند زاڵمانەیە. بەپێویستی دەزانم چەند ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی ئەم بابەتەو چۆنیەتی ژیانو کەسایەتی کیلکوف بخەمە ڕوو. کیلکوف تاقانەیماڵباتێکی دەوڵەمەندە، یەکەمجار وەکو سەرباز لە گاردی ئیمپراتۆری دا خزمەتی کردووە، پاشان لە لەشکرکێشی بۆ سەر تورکیا، پێموایە فەرماندەیی یەك لیوای قوزاقی لە ئەستۆ بووەو لەم ئۆپەراسۆنەدا، لە شەڕێکی تەن بە تەن دا بە دەستی خۆی ئەفسەرێکی تورکی کوشتووە. ئەم ڕووداوە کارێکی وای تێکرد کە یەکسەر فەرماندەکەی خۆی ئاگادار بکاتەوە کە لەوەی پتر ناتوانێ لە خزمەتی سوپادا بمێنێتەوەو هەرکە لەشکرکێشییەکە تەواو بووە داوای ئیستیقالەی کردووە. چونکە دڵنیا بوو ئەوە مەسیحیەتەی کە ئەو پەیڕەوی دەکرد، خوازیاری گرتنەبەری ژیانێك بوو کە بە تەواوەتی پێچەوانەو دژی ئەو کردارو ڕەفتارە بوو کە لە گوندێکا گرتبوویەبەر. لەو گوندەدا ئیدی چاك بێ یان خراپ ژیانی خۆی بە گوێرەی ئەو بیروباوەڕەی کە لەمەڕ مەسیحیەت لە نكو وی چێ بوو بوو، ژیانی خۆی ڕێکخست. هەرچی سەروەتو سامانێکی لە دایکییەوە بە میرات بۆ مابووەوە بە گوندییەکانی بەخشیو هیچ شتێکی بۆخۆی هەڵنەگرتو لە و زەوییەدا کە بە کرێی گرتبوو بە کارو ڕەنجی شانی خۆی کەوتە پەیدا کردنی نانی ڕۆژانەی خۆیو ماوەی دە ساڵ بەمجۆرە ژیا.

من بۆیە هەموو ئەم وردەکارییانە دەگێڕمەوە تا سەرنجی خاوەنشکۆ سەبارەت بە ڕاستگۆیی ئەم پیاو ڕاکێشم کە چون کەمترین دوو دڵی سەبارەت بە لە دەستدانی پایە سوپاییە گەورەکەیو مولکە زۆرەکەی کە زۆر لە پایە سوپاییەکەی زیاتر بووە، نەداوە. تەنیا بۆ ئەوەی لە بەردەم ویژدانی خۆیدا بە درۆزن دەرنەچێت حەوت ساڵێك لەوە پێش دەگەڵ کیژێکدا بە نێوی ڤاینەر کە

کیـژی سـەرهەنگێکی خانەنشـین بـوو، ئاشـنایەتی پەیـدا کـردو زەماوەنـدی دەگەڵـدا کـردو دوو منـداڵی لێـی بـوو. گـەورەترین تۆمـەتێك کـە دەیدەنـە پـاڵی ئەوەیـە کـە بـە گـوێرەی یاسـای ئـاینی زەماوەنـدی نـەکردووەو منداڵـەکانی غوسـڵی تەعمیـد نـەکردووە. بـەڵام ئـەو مینـاکی میلیونـان مەسیحی دیکە لەبەر بێ باوەڕی بە لایەنی پیرۆزی غوسڵی تەعمیدو زەوجین خۆی لە ئەنجامدانی ئەم ڕێورەسمە نەدزیوەتەوە، بەڵکو ویستویەتی بیروباوەڕی کڵێسای ئەرتـەدوکس ڕەفز بکاتـەوەو کەڕەتی سفری بکات. جا چونکە پیاوێکی راستگۆیە نەیویستووە ڕێوڕەسمێك جێبەجێ بکات کە باوەڕی پێی نیە. ئەو پیاوە لە حوزوری من و هـەموو ئەوانـەی کـە هـەوڵیان دەدا قەناعـەتی پـێ بکەن کە لە کڵێسادا زەماوەند بکات و منداڵەکانی غوسڵی تەعمید بکات، دەیگوت: ***"ناتوانم مل بۆ ئەم ڕێوڕەسمانە بدەم چونکە ئەگەر بچمە نك کەشیش و داوای لێبکەم ڕێوڕەسمی مارەبڕین-م بۆ ئەنجام بدات یان منداڵەکانم غوسڵی تەعمید بکات، و لێم بپرسێت ئایا باوەڕم بـەم ڕێوڕەسمـە هەیە، دەبێ یان درۆی دەگەڵ بکەم، کە هەرگیز ناتوانم کاری وا بکەم، یان حەقیقەت و راستی پێ بڵێم کە باوەڕم بـەم یاساو ڕێسایانە نیـەو تـەنیا بۆ ڕواڵـەت و رواڵـەتپارێزی ئـەم یاسا و ڕێسایە ئەنجام دەدەم، ئەوسا یارۆی کەشیش چەند شەریف و ئابڕومەندش بێ دەرم دەکات"***.

هەڵبەتە کەسێك لە گوندێکی دوورە دەست بژی و بە ڕەنجـی شـانی خـۆی پـاروە نـانێکی بژی و نەمر لە کاری کشتوکاڵی بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی پەیدا بکات و پیاوێکی دەوڵەمەندو بەنێوبانگ و ناسراو کە هـەموو موڵکـەکانی خـۆی بـۆ خـەڵکی وەقف کردبێـت، ناشـێت سـەرنجی گونـدییان و جووتیـاران ڕانەکێشـێت، بۆیـە ئـەو خەڵکـە بـۆ بـەرگری لـە خۆیـان لـە بەرانبـەر هـەر دەسـتدرێژی و زێدەگاڤیەك پەنایان وەبەر ئەو دەبردو سەبارەت بە گومـان و دوو دڵـی بـاوەڕێن مـەزەبی پرسـیان بـەو دەکـردو ئـەویش بـە قسـەو بـە کـردەوە یارمـەتی دەدان و گومـان و دوو دڵیـەکانی بـۆ روون دەکردنەوە، بێ ئەوەی بیشارێتەوە ئەوەی ئەو دەیڵێت جەوهـەری حەقیقەتـە خواییەکانـە، و تـەنیا ئەو حەقیقەتە خواییانە خێر بۆ تیرەی بەشەر دەدەنەوە.

ژیانی ئەو بە ترسناك و خەتەر لە قەڵەم دراوەو مخابن بە گـوێرەی ئـەو مامەڵـەو ئیجرائاتانـەی کـە لـەو سـاڵانەی دواییـەدا بـە نـاوی تـۆوە دەگـەڵ ئـاژاوەگێڕان و خەتاکارانـدا گیراوەتـە بـەر حـوکمی حـەوت سـاڵ دوور خسـتنەوەو ئیقامـەی ئیجبـاری دراوەو بـۆ خـراپترین شـوێنی قـەفقاز ڕەوانـە کراوە.

هەرچـەندە ئـەم دوور خسـتنەوەیە بـۆ ئـەو کـە نـان پەیداکـەرو سەرپەرشـتیاری خێزانەکەیـەتی، زاڵمانە بووەو لە هەر هەموو ئەو دەسکەوتە ناچیزانەیان کە بە درێژایی ساڵانێك بە ڕەنجی شان و ئارەقی ناوچەوان لە نشیمەنگاکەی پێشووی بە دەستی هێناوە، مەحروم و بێ بەشیان کردووە، لــە ژینگــەو هەلومــەرجی دژوارو ســەخت و نائاســایی تاراوگەشــدا، بەوپــەڕی ئاســوودەیی و ئارخەیانی تەحەمولی گرفت و کێشەکانی کردووەو لە قەفقازدا درێژەی بە هەمان ژیانی ئەوسای گونـدی چـارکوف داوەو بـە ڕەنـج و کـاری خـۆی زەمینـەی ژیـانێکی سـاکارتری فەراهـەم کـردووەو یارمەتی دانیشتوانی ئەو دەڤەرەی داوەو پارەکە، کاتێ کە نەخۆشی وەباو چاوقوڵکە بڵاوبووەوە کۆمـەکێکی فـرەی خـەڵکی کـردوووە. بـەڵام هـەر هـەموو ئـەم کارانـە بـەلای مـامورانی تـاقیبکردنی

ئەوەوە بەس نەبووەو ئیدی کارێکی زاڵمانەو نەنگینیان بەرانبەر بە پیاوێکی خودان عیال کردووە، وەکو لە نامە هاوپێچەکەدا هاتووە، خۆیان بە ماڵەکەیدا کردووە، منداڵەکانیان کە هێشتا بچووکن و لە تەمەنێکان زۆریان پێویست بە دایك و باوکیانە، لە خۆی و ژنەکەی جیا کردوونەتەوە، لە کاتێکا سوور زانیویانە کە خۆی لەبەر ئەوەی مەحکومە بە نەفی و دوورخستنەوە نەدەتوانێ دەگەڵ منداڵەکانیا بڕوات و نە هیچ ئیمکاناتێکی هەیە بیخاتە بەردەستی ژنەکەی تا ئەو دەگەڵ منداڵەکاندا بڕوات.

خاوەنشکۆ! تێکڕای ئەم کارەساتانە بە ناوی تۆوە ئەنجام دراوە.

دوور نییە ئەم نامەیە ڕقت هەستێنێ و بە خۆت بڵێی: ئەم پیاوە بە چ هەقێك ڕێگە بە خۆی دەدات ئەم شتانە بۆ من بنووسێت؟ خاوەنشکۆ! من لەمبارەیەوە هەقێکم هەیە لەوەسفکردن نایەت کە هەمیشە فەرامۆشی دەکەین، و لەوەیە ئێستا باسی بکەم دووچاری سەرسامیت بکات. ئەم هەق و مافە، مەحەبەت و ڤیانی برایانەی منە سەبارەت بە تێکڕای تیرەی بەشەر کە یەکێك لەوانە خودی خاوەنشکۆیە ، بە هەموو ئەو لەمپەرە رواڵەتیانەوە کە تۆی ئیمپراتۆری گەورەترین ئیمپراتۆریەتی جیهان لە منی نەفەری ڕووتە جیا دەکاتەوە. من باوەڕم وایە تۆ کە ڕێگەت داوە ئەم جۆرە کارە ستەمکارانەیە بە ناوی خۆتەوە بکرێت هەڵەت کردووە، دووچاری هەڵە بوویت. لە ئینجیلدا دیاریکراوە چۆن لەگەڵ برایانی تاوانباری خۆتا ڕەفتار بکەیت. من لەمبارەیەوە بەمجۆرە ڕەفتار دەکەم: "هەرکاتێ برایەکەت قسورێك یان هەڵەو خەتایەکی دەرهەق کردیت، هەوڵبدە خۆت بە تەنیا ئامۆژگاری و ڕێنوێنی بکەی. خۆ ئەگەر بە گوێی کردیت، مانای وایە دوو جار سەرکەوتوووی".

کە دوا نامەی چلکۆف و هاوسەرەکەیم پێگەیی و داوای یارمەتیان لە من دەکرد بە ڕادەیەك توڕەو پەست بووم کە ویستم دەمودەست ڕاپۆرتێك لەمبارەیەوە بۆ ڕۆژنامەکانی هەندەران ڤڕێ بکەم، لێ کە لە بەردەم خودادا لە خۆم پرسی ئایا ئەم کارەی من کارێکی بەجێی شایستەیە، بۆم بە دیارکەوت ئەم کارە نابەجێ و نالۆژیکیە. چونکە بڵاوکردنەوەی وتار لە ڕۆژنامەکاندا ناتوانێ هیچ گۆڕانێك لە بڕیاری ئەولیای ئومورداا چێبکات، بە تایبەتی ئەگەر ناڕازی بن، ئەمە جگە لەوەی کە ئەگەر من ئەم ڕێگەیە بگرمە بەر مانای وایە بە گوێرەی ئینجیل مامەڵەم لە تەك تۆدا نەکردووە، بۆیە بڕیارم دا بە گوێرەی پەندو ڕێنماییەکانی ئینجیل ڕاستەوخۆ نامە بۆ خۆتان بنووسم و بە هیوا بم کە نەك هەر توڕەتان نەکەم، بەڵکو وەکو برایەك بتان بینم. هیچ کەسێك ئاگای لەم نامەیە نیە تەنیا پیاوێك نەبێ کە جێی باوەڕو متمانەیەو نەمدەتوانی لەمبارەیەوە چاوپۆشی لە هاوکاری ئەو بکەم.

دەترسم ئەم نامەیەم گۆساخانە بێتە بەرچاوت و لە یەکەم ساتەوە زویرت بکات و هەستێکی خراپت دەرهەق بە من لە نك چێبکات کە دیارە یەجگار زۆری پێ قەڵس و خەمناك دەبم. بەڵام چ کارێکی دیکەم پێدەکرا؟ بێدەنگی لەمبارەیەوە مەحاڵ بوو، چونکە بێدەنگی ویژدانی ئازار دەدام و هەروەها نووسینی نامەی دوورو درێژو بە ئاوو تاو وبەکار هێنانی وشەی قەبەو قەڵەوو ریائامێز کە لە نووسینی نامەدا بۆ سوڵتانان باوە، لە توانای من بەدەر بوو و ئەمە جگە لەوەی

لایەنێکی خراپتری هەیە، چونکە نامەیەك بەو تۆنو شێوازە مەرجدارو دەستکردە بێتە نووسین، ناتوانیٚ وەکو پێویست گوزارشت لە مەبەست بکاتو کار لە دڵو دەروونی ئەو کەسە بکات کە بۆی دەچیٚ. لە کاتێکدا من دەزانم هەرکاتیٚ قسەکانم بگەنە دڵی تۆ داواکەم ڕەت ناکرێتەوە، لەبەر ئەمە خاوەنشکۆ! هیوادارم بەسەر ئەو هەستی بەدخواییەدا کە لەگینە ڕاشکاویو ڕاستەوخۆیی ئەم نامەیە لەلاتی دروست بکات، ولە تۆ ناوەشێتەوە، زاڵ ببیتو، باوەڕبکەیت کە تاقە هاندەرو ڕێنوێنی من خۆشەویستی تۆیە. یانی ئەو خۆشەویستیو مەحەبەتە مەسیحیانەی کە دان بە جیاوازی پایەی نێوان بەشەراندا نانێت،و تاقە ئامانجی ئەوەیە چاکەو چاکەکاری لەنك بەشەران چێبکات.

من وا وێنا دەکەم تۆ بەوە ڕاهاتبی لە هەر هەموو ئەو داوایانەدا کە لە تۆ دەکرێت، لایەنی بەرژەوەندی یان بە شێوەیەکی گشتی لایەنی تایبەتی ببینیتەوە. هەرکە نامەیەك یان داوایەکت پێدەگات، هەمیشە وا بیر دەکەیەوە کە ئەم داواکارە چ شتێکی بۆ خودی خۆی دەوێت؟ بەڵام ڕاستت گەرەکە من بۆ خودی خۆم هیچ شتێکم ناویٚو پێویستم بە هیچ نیە. تۆ نە دەتوانی هیچ شتێکم وێدەیتو نە لە هیچ شتێك مەحرومو بیٚ بەشم بکەیت. ئەو شتەی کە ڕیٚ بە خۆ دەدەم لە تۆی داوا بکەم نەك هەر بۆ من بەڵکو بۆ کیلکۆفو خێزانەکەیو خودی تۆش زەروری نیە. کیلکۆفو خانەوادەکەی بە ئاسانی، خۆ لەبەر ئازارو دەردو ناڕەحەتی تاراوگەو دوورخستنەوە ڕادەگرن. چونکە ئەوان بە ناوی مەسیحەوە مل بۆ هەموو جۆرە ناڕەحەتیەك دەدەن. تەنانەت خەڵکانێکی باشتر لەو رەعیەتو هاووڵاتیە ئەڵمانیەی کە بۆ کەمکردنەوەی ڕەنجو عەزابی بیٚ گوناهانی گیرۆدەو داماو ئەسپەکانی خۆی فیدا دەکرد، یان ئەو پاسەوانەی کە بۆ یارمەتی داماوانو لێقەوماوان فەرمانی سەروی خۆی جێبەجیٚ نەدەکرد لە دەوری ئەوان خڕ بوونەتەوەو بەرە بەرە هەموو خەڵکی، لە خەڵکانی کۆڵکە خوێنەوارەوە تا خوێندەواران پەیوەندی بەوانەوە دەکەن. جا تۆ خاوەنشکۆ پاش ئەوەی لەو ئیجرائە ترسناكو ناڕەوایەی کە بە ناوی تۆوە کراوە ئاگادار دەبیتەوە ناتوانی هەست بە عەزابو ئازار نەکەیت. یان کۆمەڵێك خەڵکی خۆپەرستو ریاکارو ماستاوچی دەورت بدەن کە ئامادە بن پاکانە بۆ نەك هەر ئیجرائاتو فەرمانەکانی تۆ، بەڵکو بۆ ئەو ئیجرائاتەش بکەن کە بە ناوی تۆوە دەکرێت،و تەنانەت ستایشیشی بکەن.

جا مەعز بۆ ڕەزای خوا گویٚ لەو قسانە مەگرە کە بە ناوی بەرژەوەندی وڵاتو بە تایبەتی بەرژەوەندی کڵێساوە دەیکەن، تا ئیجرائاتی دژە مەسیحیەتی وەکو دابڕینو جیاکردنەوەی منداڵان لە دایکان، ئاساییو ڕەوا نەیەتە بەر زەینو چاوتان.

گویٚ لە قسەی ئەوانەی دەوروبەرت مەگرەو باوەڕیان پیٚ مەکە. چونکە هیچ کەسێك لە هەر پلەو پایەیەکدا بێت هەر لە تۆوە کە ئیمپراتۆریت تا دەگاتە پۆلیسێکی میناکی ئەو کەلانتەری کە ئەو منداڵانەی لە داوێنی دایکیان دەرهێناوە، هەقی هیچ ئیجرائێکی دژی یاسای ڤیانو مەحەبەتی خوایی نیە، ئەو یاسایەی کە هەم لە ئینجیلدا ڕاگەیەنراوەو هەم لە ویژدانی ئێمەماناندا هەیە. هیچ جۆرە سەختگیریو زەبرو زەنگێك ڕەوا نیە، چونکە هیچ جۆرە ئیجرائێکی زاڵمانەی میناکی ئەو ئیجرائاتانەی کە لەم دواییانەدا بەوپەڕی توندی جێبەجیٚ دەکرێت ناگاتە ئامانج. بە

پێچەوانەوە لەگینە لایەنگرانی کڵێسا بۆ ئیجرائاتی نا مەسیحیانە هان بدات. ئەمە جگە لەوەی هەر هەموو بیانوو بەڵگەکان چ هی دەوڵەتو چ هی کڵێسا، چەندیش باوەڕمان پێیان بێ، وەکو هەمیشە دەبینین لەوەیە نادادپەروەرانە دەربچن، بەڵام ئەمەی کە هەر یەکێك لە ئێمە لەوەیە لە هەر ساتێکدا ئەم دنیا بەجێ بێڵین و بگەڕێینەوە بۆ نك ئەو خودایەی کە هێناومانیەتە ئەم دنیایە، بووەتە مایەی چێبوونی یاسایەکی جاویدانی حاشا هەڵنەگر کە هەمان یاسای ئەشق و ڤیانە. بە گوێرەی ئەم یاسایە شتاقمان(کەسمان) ناتوانین بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە ئیجرائاتی زاڵمانەی دزێو یان نەنگیندا بەشداری بکەین. دیارە کەس ناتوانێ کەمترین گومان لەمە بکات.

خاوەنشکۆ! ئەوەی کە عەرزم کردوون ئەرکی هەر مرۆڤێکە. بە تایبەتی بۆ یەکێکی پیری میناکی من کە پێم بە لێوار قەبرەوەیە. خودا ئاگادارە ئەم نامەیەم بەوپەڕی راستگۆیی و سۆزی برایانەوە بۆ نووسیویت. پیاوێك کەوتووەتە ناخۆشترین و هەستیارترین و پڕکێشەترین تەنگانە وهەڵوێستێکەوە کە بشێت ئینسانێك تووشی ببێت.

## بۆ ت. ل. تولستویا، کیژەکەی
## مۆسکۆ، ١٨٩٤/٣/٢٢

**تانیای ئازیزو خۆشەویستم،**

بیکە بە خاتری خوا هەوڵبدە بە وردی گوێ لە قسەکانم بگریتو وەکو پێویست لێی بگەیت. ئەگەر لە شوێنێکدا هەڵەم کردبێ، یان لە هەندێ خاڵدا توندڕەویم کردبێ، ئەوەی بەلاتەوە زیادە لای ببە. بەڵام هەمووی لە هزرو زەینی خۆت وەدەرمەنێ، لە ناخی دڵەوە گوێ بگرەو ئەو حەقیقەتانەی بە گوێتیا دەدەم قەبوڵ بکە. دوای ئەم پێشەکیە دڵنیات دەکەم لەوەتای بەم مەسەلەیەم زانیوە، شەوو رۆژ لە خەیاڵمدایەو بەیانیان و ئێواران و شەوان کاتێ کە لە خەو ڕادەبم زۆرم ئەزیەت دەدات، ن. ن پوپوف(١) نها لەلای من رۆییوە. دوو رۆژە کە یەکتر دەبینین، بەڵام هەمیشە لە حوزوری خەڵکیدا زۆر دەگەڵ یەکتردا دڕدۆنگ و سارد بووین، من بە پێی توانا بۆ ئەوەی خۆم لە گفتوگۆیەکی ناخۆش و تەوهین ئامێز بدزمەوە، بەوپەڕی لووتبەرزی و خۆپەرستی تەماشای ئەوم دەکردو وای بۆ دەچووم کە ئەم (ن. ن)ـە مەڕی پێغەمبەرە. بەڵام ئەم رەفتارە هیچ ئەنجامێکی نەبوو، و ئاقیبەت ئەو گفتوگۆ گیان پڕوکێنە ڕووی دا.

هەمان چیرۆکی هەمیشەیی بوو، واتا دووبارە کردنەوەی ناخۆش و بێ تامی ئەم رووداوە لەلایەن ئەوەوەو بێزاری من لە گوێگرتن بۆ قسەکانی ئەو بوو. جا بەر لەوەی تۆ لە بەرەنجامی ئەم گفتوگۆیە ئاگادار بکەمەوە پێت دەڵێم کە بە جدی و بە شێوەیەکی راستەوخۆ بیرم لەم

ڕووداوە کردووەتەوە، هەڵبەت بە تێپەڕبوونی زەمان ئەم چیرۆکە زیاتر دەبووە مایەی سەرسامی من.

لە سەرەتادا بە تەواوەتی هەستم بە قەباحەتو دزێوی ئەم پێشهاتە نەکرد، لێ پاشان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆتر گرینگی ئەم ڕووداوەم بۆ ڕوونتر بووەوە. مەسەلەکە زۆر سادەو ڕوونە، تۆ دەگەڵ پیاوێکدا پەیوەندی نزیكو نهێنیت گرتووە، کە عادەتەن ئەو جۆرە پەیوەندییە کاتێ چێدەبێت کە حەز لەو کەسە بکەیو ئاشقی ببیت، پەیوەندییەك کە وەستان نازانێو ڕۆژ بە ڕۆژ توندتر دەبێتو هەردوو لایەنەکە بەرادەیەك لێکدی نزیك دەکاتەوە کە زەوجینی لێبکەوێتەوە جا چ زەوجینی شەرعی بێ یان نا شەرعی بێ، ئەو پیاوەی کە تۆ هەڵت بژاردووە، پیاوێکی قێزەونو بێزراوەو تەنانەت نزیکترین خزمو کەسوکاری خۆیشی لێی بە گلەییو گازاندەنو سەرزەنشتی دەکەن، پیاوێکە کە ڕابردوویەکی باشی نیە، ئەو پیاوەتیو مەردایەتیەی تیا نیە کە ژن گەرەکیەتی، لە هەموو ئەمانەش خراتر ئەوەیە کە ژنداره(٢). مالا پێی گوتووم کە گوایە تۆ بە سەڵتی دەزانی، بەڵام ئەمە ڕاست نیەو ژنداری ئەو هێندەی دی دزێوی هەستە گومانـاویو پەنهانەکانی زیاد دەکات. جا لەبەر ئەمە کەی ڕاستە تۆ بە عازەبو سەڵتی بزانیو لە کاتێکا هەموو خەڵکی بزانن کە ژنی هێناوە، وا خۆشیت خەڵەتاند، ئەدی ئەو حەقیقەتە چۆن لە خەڵکی دەشاریتەوە؟ .

ئەم پەیوەندیانە لەڕادە بەدەر قووڵ بوونەتەوەو کەسایەتی ئەو پیاوە بە جۆرێك ئاشکرا بووە کە تۆ ناتوانی بەبێ هەستی شەرمەزاری دان بە حەقیقەتەکاندا بنەی. تۆ ئێستاش نامەی بۆ دەنووسیت، پەیوەندیت لەگەڵی هەیەو تەریقیش نابیتەوە. لە بیرمە کاتێ کە لە (شەقامە درێژە)کەی مۆسکۆ دا تۆم لەگەڵ ئەودا بینی هێندەم بەزەیی بە تۆدا هاتەوەو هێندەم شەرم بەخۆ هات، کە خوێنی دڵم هاتە جۆش. ئەو ئامادەیە چاوپۆشی لە هەموو شتێك بکات، دەستبەرداری هەموو شتێك ببێت. قەناعەتی بە دروستی بۆچوون هەڵسەنگاندنەکانی من هەیەو لە هەموو ڕوویەکەو هاوڕەئی منە. داوام لێکردووە نامەت بۆ نەنووسێتو– هیوادارم تۆش نامەی بۆ نەنێریت– و چیتر تۆ نەبینێو من لە هەموو شتێکی تۆ ئاگادار بکاتەوە. ئەویش لەبری ئەمە دەیویست نامەیەك بۆ تۆ بنێرێت وداوات لێبکات کە چیتر نامە بۆ ئەو نەنێریت، لێ لەگینە دواتر نامەیەکی دیکەت بۆ بنێرێتو تەوازۆت بۆ بێنێتەوە کە بۆچی داوای لێکردویت نامەی بۆ نەنێرێتو بەمجۆرە ئەم گەمەیە تا هەتا هەتایە بەردەوام بێت. جا من ئامۆژگاریت دەکەم کە هەموو یادگارو گشت نامەکان بسووتێنیو ئەم واریقاتو سەربهوردە بە داوێك بزانی کە لەوە بوو کێشەو کێشماکێشێکت لەگەڵ ئیبلیس دا بۆ بنێتەوە، بۆیە لەمە بە دواوە بە پارێزتربە دەگەڵیا. ژیان شتێکی مەزنو گەورەیە، تۆ دنیایەك پێشهاتو ڕووداوێن خۆشت لەبەر دەمە. حەیف نیە کە ئایندەی خۆت بکەیت بە قوربانی ئەم واریقاتو بویەرە؟ تۆ داوات لە من کردبوو داوای لێبکەم ڕێگە بدات بیرەوەرییەکانی وەخوێنم. لە بیرم چوو ئەو داوایەی لێبکەم، ئەمە جگە لەوەی حەزم نەکرد ئەو جۆرە داوایەی لێبکەم، چونکە هیچ حەزناکەم ئەم بیرەوەریانە وەخوێنم. و ئەم گەرەکە جارێکی دی لە ڕووی بەزەییەوە دڵم بە حاڵی تۆ بسووتێ. حەزناکەم لەوەی پتر تۆ لە

حاڵی لەقەفرتێدا، لە نێو ئەم زەڵکاوە پڕ لە گومان، خاپاندن‌و سەرانسەر درۆیەدا بدێنم. بە هەر حاڵ وێڕای ئەمەش داوای لێدەکەم کە بیرەوەرییەکانی وەخوێنم‌و لەگینە راز ببێ. لێ دڵنیام ئەم بیرەوەریانە هێندە دی مکووڕم دەکات لەسەر ئەو ئامۆژگارییەی کە کردمیت.

ئازیزەکەم بمبورە، لە بەر توندی ئەم نامەیە، لەمەودوا بەبێ متمانەیی عەزابی روحم مەدە. یانی متمانەت پێم هەبێ. هەمیشە دەگەڵ مندا مەحرەم بە. من لە ڕای ڕاگرتنی دڵی تۆدا ئامادەم سەد هێندەی تر عەزاب بکێشم. ئەمانە هەر قسەی رووت‌و بۆش‌و بەتاڵ نین تانیای ئازیزم! لە ناخی دڵەوە ماچت دەکەم، بمبورە ئەگەر تەوهێنێکم پێ کردبیت!

*پەراوێز:*

*١- ن. ن پوپوف یەکێك بوو لە هاوکارانی تولستوی*

*٢- پویوف لە ساڵی ١٨٨٨دا لە هاوسەرەکەی جیا بوو بووەوە.*

## بۆ م. ل. تولستوی
## یاسنایا پولیانا، ١٦-١٨٩٥/١٠/١٩

میرزا! بۆیە نامەت بۆ دەنووسم چونکە ئەوەی گەرەکمە تێتی بگەیەنم ناتوانم بەدەمی و زارەکی بیڵێم. پێدەچێت لەمپەرێکی بتەوی ئەو تۆ کەوتبێتە نێوان پەیوەندییە شەخسییەکانمان کە ئەگەری هەر جۆرە پەیوەندییەکی نێوانمانی سڕیوەتەوە. جا بە هۆی ئەم لەمپەرەوە ئێمە بەردەوام لە یەکدی دوور دەکەوینەوەو ئەم دووریو فاسیڵەیە بەڕادەیەك زیادی کردووە کە لێکدی حاڵی بوونمانی زۆر لە جاران دژوارتر کردووە. نها بۆ شکاندنی ئەم دیوارو لەمپەرەو وەبیر هێنانەوەی ئەو خاڵە گرینگەی کە پێویستە لە تۆی بگەیەنمو بەبێ ئەوە ژیان بۆ تۆ لە جاران پتر دژوار دەبێت، بڕیاری نووسینی ئەم نامەیەم داوە. تکایە بە دیقەتو وردی وەیخوێنەو بیر لە چەمكو نێوەرۆکەکەی بکەوە. ئەو زەحمەتە دێنێ، چونکە لە کاتی نووسینی ئەم چەند دێڕەدا بە هەزار زەحمەت جڵەوی فرمێسکی خۆم دەگرت، لافاوی هەستو سۆز دڵی دەگوشیم. هەوڵدەدەم ئەوەی لەم دواییانەدا، لە شەوانی دوورو درێژی بێ خەویدا، بەدەم ئازارەوە بیرم لێی دەکردەوەو هەستم پێدەکرد، بە تەواوەتی دەری بڕم. ئەوەی بۆ تۆی دەنووسم ئاندریوشاو هەموو لاوانی هاوتەمەنو هاوشێوەی ئەویش دەگرێتەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی زیاتر بیرم لای تۆیە، لە دڵی خۆمدا هەست بە میهرو سۆزێکی ئاسایی سەبارەت بە تۆ دەکەم، زیاتر رووی دەمم لە تۆیە. هیچ شتێك بۆ ئاندریوشا نانووسم چونکە مەودایەکی زۆری لەو رێگا مەترسیدارەی کە نها تۆش گرتووتەبەر، بڕیوەو ئومێدێکی ئەوتۆم پێ نیە وەکو خۆم گەرەکمە پەی بە قسەکانم ببات و بە دروستی لە چەمكو ناوەرۆکەکەیان حاڵی ببێت. ئێمە لەو دوو کەسە دەچین کە دوو سەمتو ئالی پێچەوانەیان گرتووەتەبەر، هەندێجار یەکتر دەبینن و هەندێجار لێکدی دوور دەکەونەوە،و تا زیاتر دەچنە پێشێ پتر لێکدی دوور دەکەونەوەو ئیدی کاتێ دێت کە بانگی یەکتر ناژنەون(نابیستن) یان بەزەحمەت دەیژنەون. هیوادارم تۆ هێشتا لە مەوداو فاسیلەیەکدا بیت کە بتوانی گوێت لە قسەکانم بێ، قسەکانم بژنەوی، نها ئاندریوشا ئەوەندە دوور کەوتووەتەوە کە زۆر زەحمەتە دەنگی من بژنەوێت، لە کاتێکا تا پتر لە من دوورتر دەکەوێتەوە زیاتر پێویستی بە بیستنی دەنگی منە، بۆیە تا زار دەیگرێ هاوار دەکەمو بانگی دەکەم ، هێشتا بە هیوام کە گوێی لە بانگو هاوارم بێت و بگەڕێتەوە یان بەلای کەمەوە بۆ ساتێك هەڵوەستە بکات. نها نامەیەکم بۆ ئەویش نووسی، بەڵام لەم نامەیەدا تەنیا ئاماژەم بۆ هەڵوێستو واقیعی سەختو دژواری ئەو کردووە، بەڵام سەبارەت بە تۆ بەم ئومێدە نامەت بۆ دەنووسم کە رێگە لەو کێشەو ئاریشەیەت بگرم.

لە هەموو ئەو گەنجانەی کە لە تەمەنی تۆدانو لە هەمان هەلومەرجی تۆدا دەژین، لە وەزعو حاڵێکی یەجگار مەترسیداردان. ئەم مەترسیە لەوەدایە کە لە تەمەنی ئێوەدا، یانی لەو کاتو

قۆناغەدا کە خووخدە، داب‌و نەریتان قاڵب دەگرن‌و میناکی دەقی کاغەز بۆ هەمیشە دەمێنن بێ هیچ هەڵوەستەیەکی ئەخلاقی‌و مەزەبی دەژین‌و تەنیا چاوتان لە کەموکوڕیەکانی پرەنسیپی فێربوون‌و پەروەردەیە کە ناچارن پەیڕەوی بکەن‌و بە هەموو شێوەیەك هەوڵدەدەن خۆتان لە پەیڕەویکردنی ئەم پرەنسیپ‌و بنەمایانە رزگار بکەن‌و روو بکەنە ئەو حەزو ئارەزوو وکەڵکەڵانەی کە لە هەموو لایەکەوە بەرەو خۆیان ڕاتان دەکێشن‌و ئەم وەزع‌و حاڵەتان بەلاوە زۆر ئاساییەو پێتان وانیە ،نابێت حەقیقەت بەمجۆرە بێ. راستت دەوێ ئێوە نەهەقتان نیە، هیچ خەتاو گوناحێکتان نیە، چونکە لەم ژینگەو هەل‌و مەرجەدا پەروەردە بوون‌و هاوتەمەنانی تۆش هەمان وەزع‌و حاڵیان هەیە، لە کاتێکا ئەم وەزع‌و حاڵە نائاساییە لە هەموو روویەکەوە ترسناکە. بۆیە یەجگار ترسناك‌و مەترسیدارە چونکە هەرکاتێ ئامانجی ژیان بوو بەو شتەی ئێوە بیری لێدەکەنەوە، یانی هەمیشە لە تاقیب‌و خەمی حەزو ئارەزووی تازەو گەورە بێ، ئەوا بە گوێرەی پرەنسیپێکی حاشا هەڵنەگر، پاش ئەوەی لەسەر تێرکردنی ئارەزوو ومەیلە جۆراو جۆرەکانی میناکی نەوسنی‌و سك لەوەڕێنی، بەرەڵڵایی، قوماربازی، ئارایش، یان لە ڕادەبەدەر خوودانە سازو ئاواز، ڕادێ، دەبێ هەمیشە لە تاقیبی لەزەت‌و رابواردنی زیاتردا بیت. چونکە کاتێ ئارەزوو وشەهوەتێك پاراو بوو، جاری دووەم‌و سێیەم هەمان لەزەتی هەوەڵجار نابەخشێتەوە، بۆیە دەبێ بکەویتە تاقیبی تێرکردن‌و پاراوکردنی مەیل‌و ئارەزوێن تازەترو بە هێزتر، تەنانەت یاسا‌و پرەنسیپێك هەیە کە بە گوێرەی ئەو یاسا‌و پرەنسیپە ، لەزەت بەتەساعودی ماتماتیکی زیاد دەکات، ئیدی ئەم پرەنسیپ‌و یاسایە هەمیشە دێتە دی: لە هەوەڵەوە ئارەزووی تووە فەڕەنگی‌و بەرە بەرە دەبێ بە ئارەزووی شیرینی‌و ئاوی نەبات‌و شەربەتێن جۆراوجۆرو پاسکیل‌و ئەسپ سواری‌و سوسیس‌و پەنیرو شەراب‌و ژن‌و جا چونکە بەهێزترین ئارەزوو شەهوەت، ئارەزوو‌و شەهوەتی سێکسییە، ئەم هەستە لە شێوەی ئەشق‌و نەوازشت‌و دەستپەڕو جووت بوون‌و جیماعدا دەردەکەوێ،‌و ئیدی درەنگ یان زوو دەبێت بە ئارەزوو‌و شەهوەتپەرستی‌و چونکە ناتوانی لە بری ئەم لەزەتانە لەزەتێکی تازەی بەهێزتر بدۆزیتەوە، دەست بە زیادکردنی ئەم لەزەتە لە ڕێگەێن دەستکردەوە دەکەیت وەك پەنابردنە بەر شەراب‌و ئەفیون‌و مۆسیقای شەهوەتبزوێن،‌و لە ئەنجامدا کەسە ئالودەکە رۆژ بە رۆژ پتر لە زەڵکاوی داڕوخان‌و ریسوایی دا رۆدەچێ.

ئەم ڕێگەیە هێندە ئاساییە کە هەموو لاوان چ دەوڵەمەند چ هەژار، جگە لە ژمارەیەکی کەم، بتەوێ‌و نەتەوێ دەیگرنەبەرو خۆ ئەگەر لە فەرزێکا لە کات‌و وەختی گونجاویشدا بە خۆبێنەوەو بەلای ڕێگەی ڕاست‌و دروستی ژیاندا بابدەنەوە، کەم دا بێژێك هەر لەکەدار دەبن،‌و خۆ ئەگەر هەر بەخۆدا نەیەنەوە ئەوا بە تەواوەتی لە زەڵکاوی گەندەڵیدا نابوت دەبن. بە چاوی خۆم سەدان لاوی وام دیتون کە لە قوڕی رەش نیشتوون. وەکو چۆن نها ئاندریوشا بە بەرچاوی منەوە خەریکە تیا دەچێ. ئەمە خەتەرو مەترسییەکە کە هەڕەشە لە هەموو لاوان بە دەوڵەمەندو هەژارەوە دەکات. بەڵام ئاشکرایە ئەم خەتەرە بۆ دەوڵەمەندانی وەکو تۆ

ماڵوێرانکەرترە، چونکە دەتوانن ئاسانتر شەهوەتو ئارەزووی خۆتان پاراوبکەنو لە کەسانی دی زووتر بە مەبەست بگەن، کە بریتییە لە هەمان شەهوەتبازیو نقوم بوون لە زەلکاوی نابووتی لە ڕێگای شەرابو مۆسیقای شەهوەتبزوێن. مخابن لەم سەردەمەی ئێمەدا ئەم خەتەرە ترسناکترە، چونکە یاسا و رێسا قەدیمیەکانو بەها و ئارمانجە کۆنەکانی ژیان زیاتر لەلایەن ئەنگۆوە پایەماڵ کراوە. یاسا و ڕێسا و ئارمانجو بەها نوێیەکان نەك هەر بە دڵی ڕاو بۆچوونی گشتی نیە، بەڵکو بە پرەنسیپو بەهاێن سەیرو سەمەرەو مایەی تەوسو توانجو تەنانەت موزیرو پڕ زیانیش لە قەڵەم دەدرێن. منیش کە پیاومو بە هاسانی دەخەڵەتێمو لە ڕێ دەردەکرێم ئەم ڕێگای تێرکردنو پاراوکردنی بەرەبەرەیەی مەیلو شەهوەتو ئارەزووانەم بڕیوە، لێ میناکی هەموو لاوانی رۆژگاری خۆم یاساو رێساو بەهاو ئارمانجی زۆر روونی خۆم هەبوو. هەڵبەتە رێساو بەهاێن مەخسەرە ئامێزو ئەشراف بوون، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە روخانو کەوتنیان پاراستم. بۆ نموونە بۆ من ئەو کارانەی کە ئێوە دەیکەن، وەکو بادەنۆشی دەگەڵ جووتیارانو عەرەبانچی، یان ئاشقێنی زەقو ئاشکرا دەگەڵ ژنی دێهاتیدا، بە ئەندازەی دزی یان پیاوکوژی مەحاڵ بوو. ئامانجو بەهاکانی ژیان بە جۆرێ بوو کە واداریان دەکردم هەمان ڕێگەی ژیانی بابو باپیرەم بگرمە بەرو درێژەی پێبدەم. یانی هەوڵبدەم پایەیەکی دیارو سەنگینی کۆمەڵایەتی بەدەست بێنم، بۆیە دەبوایە میناکی ئەوان رواڵەتپارێزی رەچاو بکەمو سەلارو سەنگین بمو میناکی وان مەمنونی وەزعو حاڵی خۆم بمو شوکرانە بژێر بم.

ئەم ئایدیالو ئارمانجانە بۆ رۆژگاری ئەمڕۆ بۆ منو رەنگە بۆ تۆش زۆر گەوجانەو نابەجێ بێنە بەرچاو... بەڵام هێندە بتەوو بەهێز جێگیر بوون کە لە زۆر خزینو گومڕا بوونیان گێرامەوەو لە زۆر هەوەسبازیان دوور خستمەوە. ئێستاش هەندێ ماڵباتی نەجمیزادەو ئەشراف هەن کە ئەم جۆرە ئارمانجو ئایدیالانەیان، کە لاوان لە زێدەڕۆیی دەگێڕنەوە، تیادا ماوە. وا تەسەوردەکەم کە تۆش لەم دابو نەریتو پرەنسیپو بەهایانە ئاگاداریت، ئەوانە ئیدی دەگەڵ ئەو رۆژگارەدا تێك ناکەنەوەو دەبێ نەمێننو بۆیە ئەو گەنجانەی لە ژێر کاریگەرىو دەسەڵاتی ئەم دابو نەریتو پرەنسیپانەدا پەروەردە بوون لە زۆر بواری ژیاندا رووبەڕووی نائومێدی دەبنەوەو ئازار دەچێژن، بەڵام لە پێشینان باشتر پەروەردە دەبنو بە پێچەوانەی ئێوەوە کە هیچ جۆرە ئایدیالو ئارمانجێکتان نیە، لە هەرەتی پشکوتووندا پەژمردە نابنو هەڵناوەرن.

وەزعو حاڵی تۆو زۆری وەکو تۆ مایەی ترسە. بە تایبەتی لەبەر ئەوەی هیچ جۆرە یاساو بەهاو ئایدیالێکتان نیەو میناکی بوکەڵەێن بێگیان بە دەوری تەوەرەی شەهوەتو ئارەزووکانتاندا دەسوڕێنەوەو هەموو لەو زەلکاوو گەنداوەدا دەچەقنو نقوم دەبن کە تەسەور ناکرێ ڕێگەی نەجاتی هەبێتو، رۆژ بە رۆژ پتر دیلو یەخسیری ژنو مەی دەبن.

لەم وەزعو حاڵەی ئێوەدا تەنیا یەك ڕێگەی ڕزگاری هەیە، تا زووە بە خۆتانا بچنەوە، چاوێ بە دەوروبەری خۆتاندا بگێڕنو ئارمانجو ئایدیالی خۆتان بدۆزنەوەو لە خۆ بپرسن کە هەر یەکەتان دەتانەوێ بگەنە کوێ؟ و چۆن بژین تا بگەنە ئامانجو ئاواتی خۆتان؟
بەڵێ وەزعو حاڵی ئێوە ترسناکە، چونکە ئەگەر خەڵکانێکی دروستکار بن بە هیچ ناوێکەوە درۆ دەگەڵ خۆتاندا ناکەنو دەزانن بیروباوەڕێن کۆن، دابنو نەریتێن رابردوو و ئەوەی بە ناوی مەزهەبەوە لە قوتابخاناندا بە ئێوەی دەڵێنەوە کۆمەڵێك توڕەهاتە کە هیچ کەسێك باوەڕی پێی نیە. هەروەها دەزانن ئەو ئارمانجو ئایدیالە ئەشرافیانەی کە وا دەخوازن خۆ دوور بگرنو بۆ ئەوەی بەسەر جەماوەری خەڵکیو ڕەمەکی مەردمدا زاڵ بن دەبێ لە خەڵکی دی باشتر، سەلارترو سەنگین ترو بەزەوقتربن، هەر هەمووی ئایدیایی سواوو پواوو بەسەر چووە. ئێوە بە چاوانی خۆ دەبینن کە جەوهەری ژیانی خەڵکانی دەوروبەرتان ئەوەیە کە ئەوپەڕی لەزەت لە ژیان بدینن، هەرکاتێ بژنەون خەڵکانێك هەن کە شتێکی تازە دەخەنە روو یان جلی خراپ لەبەردەکەنو خواردنی خراپ دەخۆنو لە خواردنەوەو سیغار خۆ دەپارێزن، ئەوەی دەربارەی ئەوان دەیخوێننەوە یان بە چاو دەیبینن، قەناعەتتان لا دروست دەکات کە ئەوانە خەڵکانێکی بێ ئاوەزنو بێ ئەوەی بیروبۆچوونیان هەڵسەنگێنن، پێشوەختە حوکم دەدەن کە ناتوانن هیچ شتێك لەوانەوە فێر بنو کارتان بە کاریانەوە نیە. هەموو لاوانی رۆژگاری ئێمە بە گشتی،و تۆو ئەندریوشاو گشت ئەندامانی ماڵباتی ئێمە بە تایبەتی، سوور دەزانن کە دەتوانن لە هەموو شوێنێکدا تاقیبی چارەسەری گرفتو کێشەو ئاریشەکانی خۆتان بکەن تەنیا لە نێو (تاریك هزران)(٢)دا نەبێت،و ئەوانە تەنیا کۆمەڵە خەڵکێکی بێ ئەقڵنو هیچی تر،و تەنیا بەو چاوەوە تەمەشای من دەکەن کە نووسەرێکم سەماو جریدبازیو ڕاوو شکارم باش وەسف کردووەو نها دەستم بە گوتنو نووسینی شتانێکی عەجیبو غەریب کردووەو بە خۆتان دەڵێن "ناتوانێ لاوانی سادەی وەکو ئێمە فێری ڕێو ڕەسمی ژیان بکات." ئێوە کە تا ئەم رادەیە لە منەوە نزیکن، لەم رووەوە خراپ بیردەکەنەوەو سەرچیغ چوونو دەرهەق بە من بێ ئینسافی دەکەن،و لە کەسانێك دەچن کە لە رادەبەدەر لە شتێکەوە نزیکن تا باش تەمەشای بکەنو بە دروستی بیدینن لە کاتێکا ئەوەندە بەسە بە ئاستەمێك دەست درێژ بکەن کە شتەکە بە دەست بگرن.
ئەوەی زیاتر ئەزیەتم دەدات ئەو جیاوازی نۆڕینەی بەینی ئێمەیە، بەینی منو لاوانە کە بە فێڵو دەهۆی دەستکردی دژمنانی چاکەکاری هاتۆتە ئاراوەو دەخوازم بەم نامەیە لە بنجو بناوانەوە هەڵی تەکێنم. ئەم دژمنانە دەربارەی هەموو کەسو هەموو ئوسوڵێك، بە گشتی دەربارەی پەیڕەوانی تولستوی و تاریك هزران و پزاو چرتکوفو ئەقڵ سووکانو گیاخۆرانو دەروێشانو ئاین پەروەرانو سواڵەتگەران، حوکمی بنجبڕو حەددی خۆیان داوە. حوکمەکەیان ئەمەیە کە پێیان وایە هەموو ئەم شتانە جگە لە خەیاڵاتی پوچی هیچی ترنینو لایەنی پراکتیکیان نیەو بەشێوەیەکی گشتی دەگەڵ حەقیقەتەکانی ژیاندا ناگونجێنو تێك ناکەنەوەو تەنیا بە کەڵکی کەللەپوتان دێتو بەهیچ جۆرێ دەردی لاوانی دڵسافو سادە کە

بە نیاز نین خۆیان لە خەڵکی دی جیا بکەنەوەو گەرەکیانە وەکو خەڵکی دیکە رۆژگار بەسەربەرن، دەرمان ناکات.

ئەم جۆرە بۆ چوونە دەربارەی ئەو پرەنسیپ و ڕێسایانەی کە من بڵاویان دەکەمەوەو هەموو عومری رابردووم بۆ تەرخان کردووەو تا دوا هەناسە هەموو توانای خۆمی بۆ تەرخان دەکەم، زۆرم ئازار دەدات.

من بۆ ئەوە ئەم رێبازو قوتابخانەیە بڵاو ناکەمەوە کە دڵی خۆمی پێخۆش بکەم، بەڵکو لە بۆ ئەوەی دەکەم کە ئەم رێبازو قوتابخانەیە تاقە رێگەی رزگاری مرۆڤانە لە گەندەڵی و خراپی، بەتایبەتی ئێوەی نۆ لاوان کە ڕاستەوخۆ بە پیری گەندەڵییەوە دەچن و بە تاقە رێگای گەییشتن بەو ئارەزووانەی دەزانن کە لە دڵی خۆدا پەروەردەی دەکەن. ئەوەی من دەیڵێم لە هەنبەر ئەو ئارمانج و ئایدیالە قورس و ئاڵۆزو دوورە دەستانەی کە ئێوە هەڵتان بژاردوون، سادەترین و ئاسانترین رێگەی رزگارییە.

جا ئەوەی من دەیڵێم و بڵاوی دەکەمەوە تەنیا بۆ چوون و نۆڕینی خودی من نیە، بەڵکو هەمان ئەو رێنوێنیانەیە کە مەسیح و تێکڕای بژاردەترین و باشترین تاکی تیرەی بەشەر کاریان لەسەر کردووە، و بریتییە لەوەی کە لادان و کەچرەوی و خراپە کاری و گەندەڵیەکانی ژیانی ئێوە، بە خۆتان نیشانبدەم، ئەو ژیانە سەراپا تاریك و نوتەکەی کە تیایدا نابینا وەکو پەپولە چۆن خۆی بە چرادا دەدات، باڵی خۆتان دەسوتێنن و بێگوێدان بەو چاکە کاریانەی کە شایستەی ئێوەیە، هەر شوێنێکتان بێتە پێش پێی لەسەر دادەنەن و پێیدا دەڕۆن. ئێوە هیچ جۆرە ئایدیال و ئامانجێکتان لە ژیاندا نیەو بێ ئامانج و مەبەست و تەنیا بە فەرمانی هەوەس و ئارەزووەکانتان دەژین و هەر رۆژەی روو دەکەنە لایەك، لە کاتێکا ئەمە مەبەست و مانای ژیان نیە. ئەو شتەی من لەبەر رۆشنایی رێنوێنییەکانی مەسیحدا دەیڵێم و سەمت و ئالییەکەیتان بۆ دیاری دەکات و رێگەی ژیانتان پێ نیشان دەدات، رێگایەك کە دەشێت بە ئاسانی و کەیف خۆشی پێیدا بچیتە پێشێ، رێگەیەك کە بچووکترین لادان لێی هەزاران نەگبەتی و رۆژە رەشی لێدەکەوێتەوە. ئەم رێنوێنیانە مانا و ئامانجی ژیانتان بۆ روون دەکاتەوە، بەبێ ئەوە ژیان دەوەستێ، چونکە تاقە رێبەری هەوەس و ئارەزووانە.

ئەوەی ئێمە ئایدیالی پێدەڵێین لە ڕاستیدا جگە لە ئامانج و مانای ژیان هیچ شتێکی تر نیە. ئارمانج و ئایدیالی مرۆڤ چەند نزم و بچووکیش بێ وەکو چاوچنۆکی و تەماعکاری لە کۆکردنەوەی سەروەت و ساماندا، هەر دەبێتە مایەی زاڵ بوون بەسەر هەوەس و ئارەزوودا. هەروەها ئایدیالی پایە خوازی و شۆرەتخوازیش بەسەر شەهوەتڕانی و هەوای نەفسدا سەردەکەوێ و زاڵ دەبێت. بەڵام هەر هەموو ئەم ئارمانج و ئایدیالانە ڕەوتەنی و کاتین و دەبڕێنەوە، بۆیە دەبێ تاقیبی ئایدیالێکی جێگیرو پایەدارو مکوم بیت، ئەم ئایدیالەش تەنیا لە رێگەی پەیبردن بە چەمك و مانای ژیان بەو شێوەیەی کە مەسیحیەت رایگەیاندووە دەشێت بە دەست بهێنرێت.

ئەم چەمك و مانایە بریتییە لەوەی کە ژیانی مە خۆبەخۆ هەڵگری ئارمان و ئایدیالێك نیە کە تێرو پاراو ببێ، لە سنوورێکدا بوەستێ، بەڵکو ئارمانج و ئایدیالان لە دەرێی بوون و دەسرەسی ئێمەدان، بۆیە مەبەست و ئامانجی ژیانی مە بریتی لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی کە بۆی دروست بووین. جا بۆ کەشفی ئایدیالی ڕاستەقینە ئەقڵ و ئاوەزمان پێدراوەو ئەمە سیفەتی هاوبەشی تێکرای تیرەی بەشەرەو توانای ئەوەمان دەداتێ کە ئەو شتەی لەبەر رۆشنایی ئەقڵ و بە زەبری ئەقڵ، بەر لە هەزاران ساڵ، لەلایەن کەسانێکەوە کە زۆر لە مێژە نەماون، بەدەست هێنراوە، وەربگرین و ئەوەی بە ئەقڵ و لە ڕێگەی ئەقڵەوە بە دەستی دێنین بۆ خەڵکانێك بگوازینەوە کە هەزاران و بگرە ملیونان ساڵ پاش ئێمە دێنە دنیایە. جا پەیڕەو کردنی ئەو شتەی کە بە زەبری ئەقڵ و ئاوەز هاتووەتە کەشفکردن ئامانجی سەرەکی و بنەڕەتی ژیانە و ئەقڵ باشترین بەهرەی ئینسانە.

ئەمە جگە لەوەی پەیڕەویکردنی کەشفیاتی ئەقڵ بە پێچەوانەی تەسەور و وێنای ئەو کەسانەوە کە هەرگیز بیریان لە گرینگی ئەقڵ نەکردووەتەوە، ئەوەندەش ئەستەم و ئاڵۆز نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، زۆر ئاشکرایەو بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەرك و وەزیفەی یەجگار روون و سادە بۆ بنیادەم بەرقەرار دەکات.جا ئەقڵ وخواستەکانی ئەقڵ بەند نییە بەو ئەقڵە شەخسیەی ئێمەوە کە بەسەر بونەوەرانی جیهانیەوە رەنگدانەوەی هەبێ، بەڵکو ئەم خواستە ئەقڵیانە پەیوەستن بە ئەقڵ و ئاوەزی تێکڕای تیرەی بەشەرەوە کە لە شێوەی ئەو پەندو ئامۆژگاری و یاساو ڕێساو ڕێنماییانەدا کە دەگەنە ئێمە بەرجەستە دەکرێن. هەڵبەتە مەبەست ئەوە نیە هەر شتێ لە پێشینانەوە گەیی بێتە ئێمە وەکو خۆی، بێ چەندو چوون وەری بگرین، بەڵکو پێویستە تێکڕای ئەم ڕێنماییانەی گەییونەتە ئێمە لە محەکی ئەقڵی خۆمانی بدەین و هەڵی بسەنگێنین، ئەوەی دەگەڵ ئەقڵی ئێمەدا دەگونجێت وەری بگرین و پاشان بیکەین بە ڕێنوێنی ژیانی خۆمان.

بۆ نموونە ئەم بیرو ئەندێشە دێرینانەی کە خودا بریتییە لە تەسلیس و مەسیح خودایەو غوسڵی تەعمید فەرزە وەکو بیرو ئەندێشەی ماقول و پەسند گەییوەتە من، لە کاتێکا ئەقڵی من ئەم بیروباوەڕانە بە دروست نازانێت، بۆیە من ئەم بیروباوەڕانەم وەکو یاسای ژیان بۆ خۆم قەبوڵ نییەو قەبوڵی ناکەم. بەڵام بە پێچەوانەوە هەندێ یاساو ڕێسای دیکە گەییوەتە من کە ئەقڵم دەیبڕێ و قەبوڵمە. یان ئەمەی ئەو شتەی بۆ خۆتی پەسند ناکەی نابێ بۆ خەڵکی دیکەشی پەسند بکەی،و تێکڕای بەشەر خوشك و برای یەکترن، یان چونکە مرۆڤ ناتوانێ ژیان ببەخشێت نابێ دەست درێژی بکاتە سەر ژیانی کەس، یان مرۆڤ دەبێ هەمیشە لە تاقیبی کەماڵدا بێت و ئەگەر جارێ تیرەکەی وە بەردی نامرادی کەوت نابێ نائومێد بێت و ورە بەر بدات بەڵکو پێویستە هەڵەی رابردووی چاك بکاتەوەو هەوڵبدات جارێکی دی دووچاری هەڵە نەبێتەوە. یان خێری مرۆڤ وا دەخوازێ کە دڵیان لای یەکدی بێ و سەبارەت بە یەکتری گوزەشت و بووردنیان هەبێ، یان پێویستە بە هانای لێقەوماوان و هەژارانەوە بچن و هاوخەمی و هاوسۆزیان لەگەڵ بکەن،و خێری بەشەر لەوەدایە کە هەر پیاوێك تەنیا ئاشقێنی

دەگەڵ هاوسەری خۆیدا بکات، و ژنیش تەنیا دڵ بە یەك پیاو بدات، یان چ بەختەوەری تاك و چ شادمانی کۆمەڵگە وا دەخوازێ کە هەر تاکێکی تیرەی بەشەر کارێکی هەبێت و نەبێ بەبارو مێملێ بەسەر خەڵکانی ترەوە، یان ئەمەی کە بۆ دابینکردنی ئارامی بەرژەوەندی کۆمەڵگە دەبێت هەر مرۆڤێك بە جۆرێ رەفتار بکات کە ئەگەر هەموو کەسێك چاو لەو بکات بەختەوەری گشتی نەك هەر کورت نەیەنێ بەڵکو زیاتر ببێ. ئەم جۆرە دەستوراتە دێرینانە ئیدی بەرەنجامی حیکمەتی چینی یان هندیانی کۆن و یا تازە بێ، یان بەرەنجامی رێبازو قوتابخانە فەرەنسی یان ئەڵمانیەکان بێ، من ئەو دەستوراتەم قەبوڵەو وەکو دەستوراتی ژیانی خۆمم قەبوڵن، چونکە دەگەڵ هزرو بیری مندا تێکدەکەنەوەو دەگونجێن. ئەم وردکردنەوەو هەڵسەنگاندنەی بەرەنجامی ئەقڵی پێشینانە و، هەڵبژاردنی ئەو بەشەی کە دەگەڵ ئەقڵی مندا دەسازێ و دەگونجێت، بە مانای پەیڕەوکردنی دەستوراتی ئەقڵە.
لە سەرەتای دروست بوونی جیهانەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆ رۆڵەی بەشەر درێژەیان بە کۆکردنەوەی ئەم پرەنسیپ و دەستورە ئەقڵانیانە داوەو نها لە سایەی ئەم هەوڵ و کۆششەدا، خاوەنی دەستوراتی زۆر روون و ئاشکراین کە ئەگەر پەیڕەوییان بکەین لە هەر رەنج و زەحمەتێك بە دوور دەبین و چاکەی ڕاستەقینەمان دێتە ڕێ و سوودی لێوەردەگرین.
هەر ئەم دەستورات و ڕێنماییە ئاشکرایانەی مەسیحیەتە کە من بانگەوازی بۆ دەکەم و فێری خەڵکی دەکەم، چونکە دەستورات و ڕێنمایی گرینگ و روون و ئاشکران.
شیلەی جەوهەرو پرەنسیپی مەزەبی مەسیحیەت ئەوەیە کە چاکی راستەقینە بە مرۆڤ نیشان دەدات و تێی دەگەیەنێ کە هێم و بناغەی ئەم چاکییە بریتییە لە ئەنجامدانی ئەرکی خۆت لە دنیادا، هەروەها هەموو ئەو شێوە لەزەت و هەوەسبازیانەی، کە زیان بەم چاکییە دەگەیەنن، پێ نیشان دەدات. مەسیحیەت ناوی تەفرەدان و داو و خاپاندنی لەم لەزەتە ڕواڵەتیانە ناوەو زۆر بە وردی شیان دەکاتەوەو مرۆڤ هوشیار دەکاتەوە کە توخنی نەکەوێت،و ڕێگەی نیشان دەدات کە چۆن لەو داو و تەپکەو تەڵانە رزگار ببێت،و لە جیاتی ئەوانە لەزەتە حەڵاڵ و ڕاستەقینەکان بۆ بەشەر دەژمێرێت، و لە هەمان کاتدا ئەوە دەسەلمێنێ کە هەرکاتێ مرۆڤ ڕادەستی کەچڕەوی و گومڕایی بوو چۆن دەبێ بە غولامی ئەڵقە لە گوێی هەوەسبازی و شەهوەتپەرستی و بە دەستی خۆی بناغەی شادمانی خۆی وێران دەکات.
گرینگرین و سەرەکی ترین فریوێك کە مەسیحیەت مرۆڤی لێ ئاگادار دەکاتەوە بریتییە لەم تەسەورەی کە بەختەوەری دەکاتە رازیکردن و تێرکردنی مەیل و غەریزە شەخسیەکان. مرۆڤ ،یانی مرۆڤ وەکو حەیوان هەمیشە لە تاقیبی رازیکردنی مەیل و غەریزەکانی خۆیدایە، لێ گومڕایی و فریو لەوەدایە کە وا خەیاڵ بکات ئەم لەزەت و لەزەتخوازیە مایەی چاکییە، بەڵام فەرقی نێوان ئەم بۆچوونەی کە گوایە تێرکردن و رازیکردنی غەریزەو مەیل چاکەی لێدەکەوێتەوە، بۆیە دەبێ بایەخی پێ بدرێت، لەگەڵ ئەم راستیەی کە هاندانی غەریزەو مەیل و هەوای نەفس، مرۆڤ بە فەرسەخان لە چاکی راستەقینە دوور دەخاتەوە، بۆیە دەبێ کەوی بکرێ و جڵەو بکرێ، بەقەد فەرقی نێوان ئەرزو ئاسمانە.

هەركەسێك گوێ لە بانگەوازو گازی ئەقڵو ئاوەزبگرێت، زۆر بە روونی لایەنی گومڕایی و ماڵوێرانكەری شەهوەتڕانی و ئارەزووپەروەری بۆ بە دیاردەكەوێت. چونكە جگە لەوەی كە رازیكردن و تێركردنی هەر جۆرە مەیل و ئارەزوویەك لەسەر حیسابی مەیل و ئارەزووەكانی دیكە دێتە دی، بۆ وەدەستهێنانیشی دەبێ بكەویتە ململانێ،و دوای وەدیهاتنی هەر ئارەزوویەك، مرۆڤ كەڵكەڵەی ئارەزوویەكی تازەترو دژوارتری دەكەوێتە سەر، بۆیە مرۆڤ تا لە هەوەسبازی و ئارەزووپەرستیدا پەی بە مەترسی فریوو گومڕایی نەبات، تووشی گومڕاییەكی ترسناكتر لە گومڕایی یەكەمی دەبێت، كە ئەویش بریتیە لە لاوازكردن و تاریك كردنی ئەقڵی خۆی، بەوەی كە لە رادەبەدەر خوو دەداتە دوخانیات و مەینۆشی و مۆزیقا.

هەر هەموو ئەو كەچڕەوی و ئیغرائاتە بچووكانەی كە بەشەر هاندەدەن و لە چاكی راستەقینەی دوور دەخەنەوە و زەمینەی ئازارو بەدبەختی بۆ خۆشدەكەن، پەیوەندییان بەو یەكەمین جووتە گومڕاییەوە هەیە كە ناوم بردن. مرۆڤ لەزەتی خۆاردن و چێژی پێدراوە بە مەرجێ میانڕەوی ڕەچاو بكات و لە كارو چالاكی غافڵ نەبێت. ئادەمیزاد لە كاتی برسیەتیدا نانی جۆ بەلەزەتێكی زیاترەوە دەخوات وەك لەوەی لە سەر تێری ئەناناس یان باشترین قارچك بخوات، لە كاتێكا ژیانی خۆی بە جۆرێ رێكخستووە كە لە تۆوایە نایەوێ هەرگیز هەست بە برسێتی بكات و بەردەوام بە خواردنی قورس و چەورو نا ئاسایی چێژەی خۆ خراپ دەكەن و بە زۆری خۆی لە هەر جۆرە لەزەتێكی خواردن مەحروم و بێبەش دەكات و هەمیشە دادو بێدادیەتی لە دەست ئازاری گەدە.

مرۆڤ ئەو توانایەی دراوەتێ كە ماسولكەكانی خۆی بخاتە كارو لەزەت لە ئیسراحەت بدینێ، كەچی هەموو كارەكانی خۆی دەخاتە ئەستۆی خەڵكانی دیكەو خۆی لە لەزەتی خۆشی ئیسراحەت مەحروم دەكات و لە كاركردندا توانا و لێهاتووی خۆی لە دەست دەدات.

مرۆڤ ئەم بەختەوەرییەی دراوەتێ كە دەگەڵ خەڵكانی دیدا پەیوەندی بگرێت و لەزەت لە دۆستایەتی و برایەتی ببینێ، بەڵام لە جیاتی لەزەت لەم بەخشش و بەهرەیە وەربگرێت، لە رووی روح زل و فیزو دەعیەو خۆپەرستیەوە خۆی لە هەموو كەسێك دووردەگرێت و هاتووچۆی كەس ناكات، تەنیا هی چەند كەسێكی كەمی میناكی خۆی یان لە خۆی خراپتر نەبێت.

مرۆڤ لەزەت و بەهرەی ڤیان و زەوجینی دراوەتێ كەچی ئەم لەزەتە بەدەستپەڕو هەوەسبازی زایە دەكات.

باڵاترین لەزەت بە مرۆڤ دراوە كە لەزەتی ئەقڵە، كەچی مرۆڤ بە دووركەوتنەوە و لادان لە چالاكییە ئەقڵانیەكان، ئەقڵی خۆی بە توتن و شەراب و هەوەسپەرستی و خۆفرۆشی بەفیڕۆ دەدات و خۆی دێنێتە ئاستی حەیوانی بێ هەست و شعور.

ئەمە ئەوە پرەنسیپ و ڕێنماییانەیە كە من بڵاویان دەكەمەوە و بانگەوازی بۆ دەكەم، كەچی تۆو خەڵكانێكی زۆری وەكو تۆ بە بیرو ئەندێشەی خەیاڵی و سەرو سەمەرەو ئاڵۆزی دەزانن كە نایەتە پراكتیزە كردن. ماناو چەمكی ئەم پرەنسیپ و رێنوێنیانە بە كورتی و رونی و

ڕەوانی بریتییە لە دوورە پەرێزی لە کاری گەوجانەو بە فیڕۆدانی ئەو هێزو بەهرە خوداییەی کە بەهەر یەکێك لە ئێمەمانان بەخشراوە. چونکە بە فیڕۆدانی ئەم هێزو توانایە نە بە قازانجی ئێمەیە و نە بە قازانجی خەڵکیەو تاقە ئاکامو ئەنجامێك کە هەی بێت مەحروم کردنی ئێمەیە لەو شادیە گەورەیەی کە لەبەر دەستی هەمووماندایە. ئەم پرەنسیپو ڕێنوێنیانە داوامان لێدەکەن باوەڕی تەواومان بە ئەقڵی خۆ هەبێو بەوپەڕی پاکی بیپارێزینو پەروەردەو چاودێری بکەین، هەرکاتێ ئەم ڕێگەیەمان بە سەرکەوتووی گرتەبەر، لەزەتو بەختەوەری ڕاستەقینەو جاویدانی ژیان ڕۆژ بە ڕۆژ پتر بە پیرتەوە دێتو بەرەو خۆیت ڕادەکێشێت.

***پەراوێز:***

١- *ل. م، تولستوی: کوڕی تولستوی یە. بەڵام تولستوی ئەم نامەیەی بۆ کوڕەکەی نەنارد، بەڵکو لە جیاتی ئەوە نامەیەکی ئاشکراتری نارد کە لەوێدا ئاشکراترو رونتر مەبەستی کوڕە شازدە ساڵانەکەی دەربارەی زەماوەند دەگەڵ کیژێکی دێهاتی دا باس کردووە.*

٢- *ئەندامانی خێزانەکەی تولستوی کە دەگەڵ بیروبۆچوونەکانی ئەودا نەبوون، هەوادارانی تولستویان بە "تاريك هزران" ناو دەبردو باوەڕیان وابوو کە هزروبیرەکانی تولستوی ئاڵۆزو تێگەیشتنیان قورسو زەحمەتە.*

## بۆ و. ج. چرتکوف
## گاسپرا، ١٩٠٢/٦/٢

**دۆستی ئازیزم فلادیمیر گریگوروفیچ!** دوا نامەی تۆم پێگەیی. ئەو نامەیە بوو کە تیایدا لێت پرسیووم رەئی ئێمە لە روسیادا دەربارەی بارودۆخەکە چیە. من بەش بە حاڵی خۆم هەر چەندە لە روسیادا دەژیم، بەڵام ناتوانم بە ڕاشکاوی رەئی خۆم بڵێم کە کار بەرەو کوێ دەڕوات. کە دەڵێی خەڵکی روسیا لە کەروێشکە خەو ڕابوون، زۆر ڕاست دەکەیت. ئەمە شتێکی تازەیە. چەند ڕۆژێك لەمەپێش دۆستی ئازیزمان، پولیگین بۆی نووسیبووم حکومەتی ئێستا قسەی کابرایەکی مەستی بیر دەخاتەوە کە دەیگوت: "ئەگەر مەینۆشی بکەی دەمریتو ئەگەر نەشیکەی هەر دەمریت، کەواتە باشتر وایە مەینۆشی خۆت بکەی!" ئەو دوو فاکتەرەی کە دەبێ حیسابی بۆ بکرێ ئەمانەن: یەکەم ئەوەیە کە میللەت بێدار بووەتەوەو دەستی بەجمو جۆڵ کردووە، دووەم ئەمەیە کە دەوڵەت وەکو هێلکە شەیتانۆکە

رۆژ بە رۆژ زیاتر خۆی بە قاوغەکەی خۆیدا دەکات، نەك هەر بەو هیوایەی کە درێژە بەم بارودۆخەی ئێستای بدات، بەڵکو بۆ بارودۆخێکی کۆنترو خراپتر بگەڕێتەوە. هەڵبەتە لە ئەنجامی پێکدادانی ئەم دوو فاکتەرەدا دەبێ بارودۆخێکی تازە پەیدا ببێ کە من ناتوانم پێشبینی بکەمو تەسەوریش دەکەم هیچ کەسێك نەتوانێ پێشبینی بکات. چونکە مێژوو هەرگیز دووبارە نابێتەوە. تاقە شتێ کە دەیزانین خەتەرناکی بارودۆخەکەیەو هەرکەسێك بخوازێت پێشگیری لەم خەتەرو مەترسیە بکات دەبێ بە جددی دەست بەکاربێت. بە تەواوەتی هەست بە زەرورەتی ئەم کارە دەکەمو نها مژوڵی نووسینی وتارێکم لە ژێر سەرناڤی "گوتارێك بۆ کرێکاران" کە لە تەواوبووندایەو تا چەند رۆژێکی دی بۆتی دەنێرم(١). پێرێش گۆڤاری ئازادی ستروڤ و هەروەها گۆڤاری ژیانم پێگەیی. یەکەمیان تاڕادەیەك باش بوو، بەڵام "ژیان"ەکەم بە هیچ جۆرێ بە دڵ نەبوو، جگە لەمەی کە شێوازو تۆنی وتارەکە جدی نیە، عەیبی سەرەکی ئاڵۆزیو ناڕونیەتی، یانی دەیەوێت پێشوەختە ڕێڕەوی ژیانی مرۆڤ دیاری بکاتو بیبەستێتەوە بە بەرقەراری سوسیالزمەوە. لەم وتارەدا ئاماژە بۆ زۆر خاڵی سەرنج راکێشو جوان کراوە، وەکو مانگرتنو سزادانی ڕامیاریو نەفیو دوورخستنەوە، وێڕای هەموو ئەمەش بە شێوەیەکی گشتی ناتوانم تەسەوری ئەوە بکەم ئەم وتارە چ کارێك لە هزروبیری خوێنەرانی گۆڤارەکە دەکات؟ بەڵام سەبارەت بە وتارەکەی لەمەڕ (فێرکردنو پەروەردە) لاپەڕەی یەکەمی نموونە چاپیەکەو لاپەڕەی سێیەمم بە دەست گەییوە، بەڵام لاپەڕەی دووەمم هێشتا بە دەست نەگەییوە. لەوە دڵگران مەبە کە بە دەستی خۆم نامەم بۆ نەنووسیویت. توانای تەواوی نووسینم هەیەو دەشنووسم. لێ نها شەوێیەو ئەمڕۆ خۆم فرە ماندوو کردووەو هەر ویستم هەواڵم بزانیت. لە جێگە هەڵدەستمو رۆژ لە هەوای ئازادا بەسەر دەبەمو هەرچەندە وەکو هەموو پیران پشتم چەماوەو گرفتی خۆم هەیە، دەتوانم بیست سی هەنگاوێك بنەم.

ئەوەی دەمویست گوتم. خودا حافیز دۆستی ئازیزم، نامەی زیاترم بۆ ڤڕێ بکە، هەر بەینی خۆمان بێت هەرچەندە حاڵم روو لە باشییە، هەستدەکەم بەم زووانە ئەم دنیایە بەجێدێڵم. هەڵبەتە هەمیشە لە بیری ئەمەدا نیمو بەشێوەیەکی گشتی هەست بە ئاسودەیی دەکەم.

*ل. تولستوی.*

***پەراوێز:***

*١- هەرچەندە تولستوی لە یاداشتەکانی خۆیدا نووسی بووی لە ٣ی حوزەیراندا ئەم وتارەی تەواو کردووە، بەڵام تا ٧/٢٢ هەر خەریکی پاکنووسکردنەوەی بووە، وتارەکە لەلایەن چرتکوفەوە لە ژێر سەر ناوی (گوتارێك بۆ کرێکاران) لە ساڵی ١٩٠٢دا بڵاوکرایەوە.*

## بۆ پ. ئای. بیرژۆکوف
## یاسنایا پولیانا، ١٩٠٤/٤/١٥

**دۆستی ئازیزم نچرا،** نامەکەتم پێگەیی و خۆشحاڵ بووم کە بە سەلامەتی و سەرکەوتووی لەو کێشەیە رزگار بوویت(١). ئەو بیۆگرافیەم، کە لەمەڕ منت ئامادە کردووە، پێ گەییوە. هێشتا نەم خوێندووەتەوەو چاوەڕوانی خوێندنەوەیم(٢). بە تەمام کاتێ وەیخوێنم کە بتوانم باری سەرنجی خۆمی لەسەر تۆماربکەمو ئەو خاڵانەی پێویستن ڕاستیان بکەمەوە، بە شێوەیەکی گشتی بەوپەڕی وردی بۆ چاپی ئامادە بکەم. تا چەند رۆژێکی دی دەست بەم کارە دەکەم.

١- ئەوەندەی بیرم مابێ، من دوو جار سەفەری هەندەرانم کردووە، یەکجار بە تەنیا سەفەرم کردو وا بزانم لە ساڵی ١٨٥٧دا بوو. دووەمجار دەگەڵ خوشکم داو بە دەریادا سەفەرم کردو لە ساڵی ١٨٦٠دا بوو. لە بیرمە کە لە رۆژی راگەیاندنی ئازادی کۆیلەکانی روسیادا، کە لە رۆژنامەکانی ئینگلیستاندا بڵاو بووەوە، لەندەنمان بەرەو روسیا بەجێ هێشت.

٢- بویەرو دیمەنی ئیعدامکردنەکەم لە سەفەری پێشودا بینی.

٣- سەفەرەکەی قەفقازم دەگەڵ براکەم لە رێگای ڤولگاو هەشتەرخانەوە کرد. براکەم پێشتر چووبووە قەفقاز، بەڵام من یەکەمجارم بوو دەگەڵ ئەودا دەچووم.

٤- تورگنیف-م دواتر، کە هەردووکمان لە ماڵی (فت) بووین، بۆ دوئێل بانگ کرد. ئەم شتە لە پاریس رووی نەدا

٥- ئەو ماوەیەی کە لە لەندەن لامدابوو، بۆ ماوەی یەك مانگو نیو تەقریبەن هەموو رۆژێك (هـزرن)م دەبینی، و دەربارەی زۆر شت گفتوگۆم لەگەڵیا کرد، گفتوگۆیەکی خۆش. وا بزانم هیچ شتێکم لەم بارەیەوە نەنووسیوە، بەڵام دەبێ چاوێك بە بیرەوەریەکانما بگێڕم. کە بەرەو برۆکسل وەڕێ کەوتم هرزن نامەیەکی دامێ بۆ پرودین، لەو ماوەیەدا کە لە بروکسل بووم چەندین جار (پرودین)م بینی و زۆرم خۆشویست. لە بروکسلدا (لیلویل)(٣)م بینی، پیر بوو بوو، لەوپەڕی دەسکورتیدا دەژیا. کاتێ کە لە بروکسل بووم زیاتر دەچوومە دیدەنی دوندوکوف کوسارکوف(٤). شازادە دوندوکوف هێشتا لە ژیاندا بوو و دەگەڵ هاوسەرو منداڵەکانیدا دەژیا. یەکێك لە ژنانی خانەوادەکەیانم لە قرم دیتبوو، ئەمە مێردی بە کۆنت گرەدن، کە بە سیاسەتوانێکی چالاکی دەڤەری بیسکوف دەژمێردرا، کردبوو.

٦- قسەکانی نازاروف سەبارەت بە سزادانو تەمبێ کردنی من دروستن. بۆیە سزایان دامو حەپس کرام چونکە نەچووبوومە دەرسی ئیوالف-ەوە. نازانم بۆچی حەزم لە چارەی ئەو نەدەکرد.

٧- تەنیا باسی هەندێ کەسێن سەردەمی منداڵی خۆمم بۆ بیرەوەرییەکانم زیاد کردووە.

٨- گۆرانیەکان دوو دانە بوون. من ئەوەی کە خانم(٥) بۆی ناردووم، بۆ تۆی دەنێرم. هەمیشە لە بیری تۆدام و ڕێزی یەجگار زۆرم بۆ هەردووکتان هەیە.

*ل. ت*

وتارەکەی لەمەڕ جەنگم نووسیوە. ئاگادار کردنەوەی هەردوو میللەت نیە، بەڵکو لایەنێکی گشتی هەیەو ئێستا دوا بەشیم تەواو کرد.

***پەراوێز:***

***١- تولستوی ئاماژە بۆ ئەو کێشەیە دەکات کە کەسێك بە نێوی ڤاسیلوسکی، بۆ بیرژوکوفی دروست کردبوو. بیرژوکوف ئەو پیاوەی کە لە ماڵی خۆیدا پەنا دابوو. لێ کابرا لە جیاتی ئەم چاکەیەو ئەم میوانپەروەرییە، کۆمەڵێك کێشەی زۆری بۆ بیرژوکوف نابووەوە.***

***٢- بیرژوکوف، بەرگی یەکەمی بیوگرافیەکەی تولستوی بۆ تولستوی ناردبوو کە تولستوی پێیدا بچێتەوە. بیرژوکوف داوای هەندێ رونکردنەوەی، سەبارەت بە هەندێ خاڵان، لە تولستوی کردبوو.***

***٣- لیلویل (١٧٨٦- ١٨٣١) مێژوونووس و سیاسەتوانێکی پۆڵاندی بوو کە پاش بەشداری لە شۆڕشی پۆڵاند (١٨٣٠- ١٨٣١) ڕۆیی بۆ بەلجیك.***

***٤- دوندوکوف کورساکوف (١٧٩٠- ١٨٦٠)، جێگری سەرۆکی زانکۆی زانستەکان.***

***٥- مەبەست کیژەکەی میلوسویچە کە بۆ دڵنیایی پرسیاری شاعیری ئەسڵی ئەم دوو گۆرانیەی لە تولستوی کردبوو.***

## بۆ و. ژ. چرتکوف

**١٣-١٩٠٤/٥/٢٣**

**دۆستی ئازیزم فلادیمیر گریگوروفیچ**

لە ساڵی ١٨٩٥دا دەستم بە نووسینی جۆرە وەسێتنامەیەك(١) کرد، لەو نووسینەدا داوام کردبوو کە ،چی لەو شتانە بکرێ کە لە پاش مەرگ لە دووم جێدەمێنێ. داوام کردبوو کە خێزانەکەم و ستراکۆف و تۆ هەموو نووسینەکانم تەتەڵە بکەن و ڕێك بخەن. بۆیە داوام لە تۆ کردووە کە ئەو زەحمەتە قەبوڵ بکەی، چونکە لە لوتف و مەحەبەتی تۆ بەرانبەر بە خۆم ئاگادارم و بەو بەهرەو زەوق و سەلیقەیەوە کە لە تۆدا دەیبینم، تۆ دەتوانیت شتەکان تەتەڵە بکەیت و بڕیار بدەیت کە چ شتێکیان لا ببرێ و چ شتێکیان دابنرێ، کەی و لە کوێ و بە چ

**شێوەیەك چاپ بکرێن، ئەمە جگە لەوەی باوەڕو متمانەم بە تۆ هەیەو دەتناسم کە لە ئەنجامدانی ئەو جۆرە کارانەدا چەند جدیو چەند بە ویژدانیت. لە هەموو ئەمانەش گرینگتر ئەوەیە کە دەربارەی دەرکی مەسەلە مەزەبیەکان لە ژیاندا، بە تەواوەتی یەك دەگرینەوەو دەسازێین.**

**من لەو زەمانەدا دەربارەی ئەم مەسەلانە هیچم بۆ نەنووسی، بەلام نها پاش تێپەڕ بوونی نۆ دانەسالێ بەسەر مردنی ستراکۆف داو نزیکبوونەوەی زەمانی مردنی خۆم ، بە پێویستی دەزانم ئەوەی لە یاداشتەکەدا ئاماژەم بۆ کردبوو، و ناوم برد بوو تازە بکەمەوەو داوا لە تۆ بکەم ئەو زەحمە بکێشیت وئەو بەرهەمانەم کە لە دوا بەجێ دەمێنن ئامادە بکەیتو رێك بخەیت،و دەگەڵ هاوسەرەکەمدا بڕیارێکیان لەسەر بدەنو نەخشەیەکیان بۆ دابنەن.**

**جگە لەو نووسینانەی کە لە نك تۆن، دڵنیام کە ژنەکەم دەربارەی بەرهەمەکانی دیکەم — ولە حاڵێکا کە ئەگەر ئەو لە پێش تۆدا بمرێت – منداڵەکانم ئاواتەکەم دێننە دیو لەو بەرهەمانەی کە لە دەف تۆ نین ئاگادارت دەکەنەوەو یارمەتیت دەدەن بۆ کۆکردنەوەو چاپکردنیان.**

**ڕاستت گەرەکە لە نێو هەموو ئەم بەرهەمانەدا، جگە لەو بیرەوەریانەی کە لەم ساڵانەی دواییدا نووسیومن، هیچیانم بەلاوە گرینگ نینو هەرچییەکیان لێدەکەن زۆرم لەلا گرینگ نیە: بیرەوەرییەکانم، ئەگەر نەشم پەرژێت بە شێوەیەکی روونتر بیان نووسمەوە، ئەوەی تا ئێستا نووسیومەتەوە، رەنگە بایەخی خۆی هەبێت، بە تایبەتی لەبەر ئەو بیرانەی لەوێدا خراونەتە روو. بۆیە چاپکردنی ئەم بیرەوەریانە بە مەرجێ شتە زیادەو بێ کەلکەکانی لێ تەتەڵە بکرێ، رەنگە بە کەڵکی هەندێ کەسانی بێتو سوودێکی هەبێ، هیوادارم تۆ ئەم کارە بە باشی ئەنجام بدەیت، وەکو چۆن دەربارەی بەرهەمە بڵاونەبووەکانم ئەنجامت دا. هەڵبەتە سوپاست دەکەم بۆ ئەو زەحمەتەی بە بەرهەمەکانمەوە کێشاوتەو بۆ ئەو ئەزیەتەی بە بیرەوەریو نووسینەکانی ترمەوە دەیکێشیت. تەباییو یەکماڵی من دەگەڵ تۆدا یەکێك بووە لە لەزەتە هەرە گەورەکانی دوا ساڵەکانی تەمەنم.**

***لیڤ. تولستوی***

***پەراوێز:***

***١– ئەم وەسێتنامەیە چونکە تەقریبەن شەقڵی فەرمی هەیە ناو و بەروارەکەی بە دەستخەتی خودی تولستوی نووسراوە.***

## بۆ چانگ چینگ تونگ
## یاسنایا پولیانا، ١٩٠٥/١٢/٤

*بەڕێزو بەرکەتی*

ئەو کتێبەی که بۆت ناردووم، بەتایبەتی نامەکەت زۆری خۆشحاڵ کردم... لە ماوەی تەمەنی درێژی خۆمدا چەندین جار دەرفەتی دیتنی ژاپۆنیانم بۆ ڕەخساوەو دیتوومن. لێ تا نها هیچ چینییەکم نە دیتووە، یان ڕاستتر دەرفەتی پەیوەندیم دەگەڵ کەسێکی چینی دا بۆ هەڵنەکەوتووە، کە زۆر بەتاسەوە بووم دەرفەتێکی وام بۆ بڕەخسێت. چونکە دەمێ بوو وەکو هەر ئەوروپاییەك تا ڕادەیەك شارەزاییم لەمەڕ پڕەنسیپو بنەما مەزەبیو فەلسەفیەکانی چین پەیدا کردبوو، هەڵبەتە بە تەواوەتی نا. هەڵبەتە هەندێ زانیارم دەربارەی کونفوشیوسو مینچیوو لاتۆتزەو ئەو شرۆڤەو ڕاڤانەی لە قوتابخانەکانی ئەواندا باو بووە، هەبووە، بە تایبەتی بنەماکانی موتی کە لەلایەن مینچیووەوە ڕەفزکراوە، کارێکی قوڵی تێکردووم. هەمیشە ڕێزی میللەتی چینم لەلا بووەو ئەم ڕێزو حورمەتەم لە ئەنجامی ئەو بویەرانەی کە لە ماوەی جەنگی ترسناکی ڕوسو ژاپۆن دا ڕوویان دا، هێندەی دی زیادی کرد. لە ماوەی ئەم جەنگەدا میللەتی چین ڕێبازو هەڵوێستێکی هێندە شایستەو پەسندی گرتەبەر کە لە هەنبەر ئەو ڕێبازو هەڵوێستەدا، بایەخی سەرکەوتنەکانی ژاپۆنیەکان، نەك هەر ناکاتە هیچ، بەڵکو لە هەنبەر ئەم ڕێبازو هەڵوێستەدا، ڕادەی شێتایەتیو ستەمکاری چ ڕوسەکانو چ ژاپۆنیەکان بەشێوە ڕاستەقینەو قێزەونەکەی خۆی، بە تەواوەتی ئاشکرا بوو. هونەری میللەتی چین لەوەدایە کە سەلماندویەتی بایەخو گرینگی میللەتێك لە دڕیو زبریو کوشتاردانیە، بەڵکو زیاتر لەوەدایە کە تا لە تواناداب میللەتێکی بەسەبرو حەوسەڵەو هوشیار بێ، سەرباری هەر ئیستیفزازو ئیهانەو ئازارێك، گیانو وڕەی بەرخودانو بەڕەڤانی بەر نەداتو خۆی لە خراپەکاری بپارێزێو تەحەمولی زوڵمو زۆرداری پێ باشتربێت لە زوڵمو ستەم کردن. میللەتی چین هەرچەندە لە ڕابردوودا لە لایەن میللەتانی مەسیحی ئەوروپاییەوە زۆری غەدرلێکراو زۆری تەحەمول کرد، لەم شەڕەی دوایی دا ئەوەی نیشان دا کە پەیڕەوی لە گیانی مەسیحیەت دەکات، یان بەشێوەیەکی باشتر بیڵێین لە حەقیقەتی جاویدانو هاوبەشی هەمووان کە هێمو بناغەی گشت ئاینان، بە مەسیحیەتیشەوە پێکدێنێ، ئاگادارە. ونۆرێنو بۆچوونی دەگەڵ هی میللەتانی مەسیحیو دەوڵەتی ڕوسیا جیاوازە. ئەمە باوەڕو بۆچوونی دروستی ئێوەم ، دەربارەی جیاوازیو ناکوکی نێوان حکومەتو جەماوەر وەبیر دێنێتەوە.

هێشتا کتێبەکەی تۆم نەخوێندووەتەوە ، چونکە ئێستا پێم گەیی. لێ وەکو لە نامەکەی تۆدا دەردەکەوێ، ترسی ئەوەم هەیە ئەوەندە دەگەڵ بۆچوونەکانی تۆدا نەبم. لە نامەکەتدا ئاشکرایە کە دەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەدایت کە قەرارە لە دامو دەزگا حکومەتیو کۆمەڵایەتیەکانی چین دا بکرێن – وا وێنا دەکەم لە کتێبەکەشتاندا هەمان دیدو بۆچوونت دەربڕی بێت – ناشێتو ناکرێت کاتێ کە بە گۆڕانکاریان ڕازی دەبیت، لایەنی گەشەکردنی کۆمەڵگەو وەرچەرخانو

پەرەسەندن فەرامۆش بکەی، و لە جیاتی ئەو حاڵەتو دیاردەیە، بێی پشتیوانی لە گۆڕانکارییەك بکەیت کە لەڕێگەی چاولێکەری و لاسایی کردنەوەوە ئەنجام بدرێت: گۆرانکاری چاولێکەریانە، گۆڕانکارییەکە کە بە دیدوبۆچوون و نۆرێنی هەر خەڵکێکی هۆشمەند چ لە ئەوروپا و چ لە ئەمریکا، ناکامی و بێ ئاکامی خۆی سەلماندووە. ئەم کارە هەڵەیەکی تەواوە. گۆڕانکاری دەبێت خۆڕسك بێت و لە جەرگەی تایبەتمەندی و پێویستییەکانی میللەتەوە هەڵبقوڵێ و لە گۆڕانکارییەکانی میللەتانی دی جیاوازبێ و شەقڵی نۆباوی خۆی پێوە دیار بێ. ئەو قەتیسمان و نە گۆڕیەی کە زۆرجار چینی پێ تاوانبار دەکرێ، ئەگەر دەگەڵ ئەو ئەنجامانەدا کە دنیای مەسیحیەت تا نها بە دەستی هێناوە بەراوردبکرێ، هەزارجار لەو وەزعو ڕەوشە نالەبارو نەخوازراوو پڕ شەڕو شۆڕەی دنیای مەسیحیەت باشترە. هەڵبەتە لەمبارەیەوە دەتوانرێ وەزعو ڕەوشی روسیا یان ڕاستت گەرەکە وەزعو حاڵی زۆربەی جەماوەری جووتیاری روسیا ئەفرۆز بکەیت و بپەڕێنی. من چاوەڕوانی گۆڕنکاری نوێ لەم جەماوەرە دەکەم، دەکرێت هەمان چاوەڕوانی لە جەماوەری جووتیاری چین–ش بکرێ. لە خودای گەورەم داوایە چین لە پەیڕەوی کردنی ئەو ڕێبازە دووربخاتەوە کە ژاپۆن گرتویەتەبەر. چینییەکان وەکو هەموو خەڵکێکی دی پێویستە هێزو نێروی مەعنەوی خۆیان پەروەردە بکەن ،چونکە خەملین و پەرەسەندنی تەکنیکی بەبێ گوێدان بە نێرۆو هێزی روحی یەجگار پڕ مەترسیە. کە باسی ئەوەت کردووە جۆرە پەیوەندییەکی دەروونی و مەعنەوی لە نێوان هەردوو میللەتی گەورەی روسیا و چین دا هەیە، و پێویستە هەردوو میللەت دەست بدەنە دەستی یەك و پێکەوە بچنە پێشێ، تەواو لە گەڵتدام. بەڵام ئەم هاوکاری و یەکێتییە نابێت شەقڵی دیبلۆماتیك و قەراردادی نێوان دەوڵەتانی هەبێت، بەڵکو ئەم هاوکاری و یەکێتییە پێویستە لە نێوان دوو کۆمەڵگەی کشتوکاڵیدا بە قەرار ببێ، و هەردوو کۆمەڵگەکە، بەجیا لە حکومەتەکانی خۆیان، لە تاقیب و سۆراخی هەموو جۆرە ژیانێکی کۆمەلایەتی تازەدابن. خۆ بە ئازادیە جیاوازەکانی میناکی ئازادی پەیڤ و ئازادی هزرو ئازادی نوێنەرایەتییەوە مژول نەکەن، بەڵکو بکەونە تاقیب و سۆراغی ئازادی راستەقینە کە بریتییە لە ژیان بەبێ حکومەت و بێ تەسلیم بوون بە هیچ هێزێك جگە لە یاساێن ئەخلاقی
زۆر خۆشحاڵم بە پەیوەندیم لەگەڵ تۆدا، و خۆ ئەگەر بەرهەمەکانی من بە شایستەی پاچڤە بزانیت، زۆرت سوپاس دەکەم.

## بۆ ئا. ئا. یارنفت

## یاسنایا پولیانا، ١٩٠٦/٩/٢٥

**ئارویدی ئازیز!** تکات لێدەکەم ئەو پیاوەتیە گەورەیەم دەگەڵ بکە با کەس نەزانێ من ئەم نامەیەم بۆ نووسیویت.ئەم داوایەم لێت هەیە: پیریوکوف پێی گوتم بە گوێرەی قسەو باسێن تەواو ، ئەگەری ئەوە هەیە خەلاتی نۆبڵ بە من بدرێت. ئەگەر ئەو بڕیارە بدرێت، بەرپەرچدانەوەو

وەڵامی من زۆر رەق و توندو ناخۆش دەبێت، بۆیە تکام وایە ئەگەر ئاشناو ناسراوێکت لە سوێد هەیە، هەوڵبدە ئەم خەڵاتە بە من نەدرێت. لەوەیە کەسێك لە ئەندامانی لیژنەی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ بناسیت، یان بتوانی نامەیەك بۆ سەرۆکی لیژنەی ناڤبری بنووسیت و ژێراو ژێر داوای لێ بکەیت هەواڵی رازی نەبوونەکەی من بڵاو نەکەنەوە.

هەڵبەتە من خۆم دەتوانم ئەدرەسی سەرۆکی ئەکادیمیا پەیدا بکەم و داوای لێبکەم ئەم نهێنییە بپارێزێت، بەڵام پێموایە رەتکردنەوەی پێشوەختەی شتێك کە ڕەنگە هەرگیز بە بیری خەڵکانی دیدا تێ نە پەڕێت، قورس و سەرو دڵگیرە. بۆیە تکا دەکەم ئەوەندەی دەتوانیت هەوڵبدە ئەم خەڵاتە بەمن نەدرێت. چونکە رەتکردنەوەکەی دەمخاتە هەڵوێستێکی ناخۆشەوە. هەندێ هەواڵی ئاڵۆزم سەبارەت بە تۆ لە نازیوسنەوە پێگەییوە، زۆر حەزدەکەم هەواڵی زیاترم لەمەڕ ڕەوشی ژیانت پێبگات، و هیوادارم باری دەرونیت باش بێت و هەر لە شادیدا بیت.

*دڵسۆزتان*

*ل. تولستوی*

***پەراوێز:***

***١- ئا. یارنفتین (١٨٦١-١٩٣٣) نووسەری بەنێو بانگی فنلاندی، تکاکەی تولستوی بەجێهێناو پاچڤەی نامەکەی ئەوی بۆ سەرۆکی ئاکادیمیای نۆبڵ نارد***

## بۆ و. ژ. چرتکوف

## یاسنایا پولیانا، ١٩٠٦/١١/٢٦

خەریکی ئەوە بووم بروسکەیەکت بۆ بنێرم تا لە سەلامەتیت ئاگادارو دڵنیابم. ئیدی نامەکەتم پێگەیی و نها کە خەیاڵم لەمەڕ تۆ ئاسوودە بووە دەتوانم نامەت بۆ بنێرم. لێ ناڕەحەتیەکی دیکە بەرۆکی گرتووم و ئازارم دەدات ئەویش نەخۆشی "مازا"یە. ئەمڕۆ هەشتەمین رۆژە کە تووشی سینەپاڵو وبرك و ژان بووە. حاڵییە یەجگار خراپە. وێڕای ئەوەی کە لە نێو هەموو کەسوکارەکانی خۆمدا بە گرنگترین دۆستی دەزانم، ئەگەر بخوازم لە روانگەی خۆپەرستیەوە قسە بکەم ئەوا مەرگی ئەو نە مایەی داخ دەبێ و نەمایەی بەزەیی. هەڵبەتە دڵم نایەت بەبێ ئەو درێژە بە ژیان بدەم، ئەو بە شێوەیەکی ناماقوڵ دەمڕەنجێنێ و ناڕەحەتم دەکات. لەبەر ئەوەی گەنجەو تەمەنی کەمە زۆر حەزدەکەم بژی، بەڵام لە هەمان کاتدا ئازاری ئەوو کەسەری خانەوادەکە زۆرم ناڕەحەت و خەمبار(١) دەکات. جا لەم سەروبەندەدا مەرگ بەردەوام لێم نزیك دەبێتەوەو لەم دواییانەدا هێندە بێ ئازارو بە شێنەیی و ئاسایی و حەتمی و بەبێ ناکۆکی دەگەڵ ژیاندا، لێم هاتووەتە پێشێ کە بەرەنگاربوونەوەی تەنیا لایەن و شەقڵی غەریزەیەکی حەیوانی وەردەگرێت و هیچ

پەیوەندییەکی بە ئەقڵو لۆژیکەوە نیە، لەبەر ئەمە هەر جۆرە تەقەلاو بەرەنگاربوونەوەیەکی لۆژیکی یان لە راستیدا نالۆژیکی بەڵام ئاقڵانەی میناکی پەنا بردنە بەر زانستی پزیشکی، نابەجیٚو بێهودە دێتە بەرچاو. زۆر بابەتم پێیە بۆ نووسین، هەڵبەتە پاشان نامەت بۆ دەنێرمو بە درێژیی بۆتی باسدەکەم. جا هەنوکە خاڵ بە خاڵ بەرسڤی نامەکەت دەدەمەوە:
مـن هـەقی (سـیتین)(١)م دەربـارەی شەکسـپیر لـە یـادەو بـە تـەواوەتی دانـی پێـدا دەنـێمو دەیسەلمێنم. زۆر بە داخەوە کە ئەوەی دەربارەی وتاری (خوایی و مرۆڤانی) لەسەری رێك کەوتبووین، فەرامۆشم کردو لە گۆڤاری یانەی خوێنەراندا بلاوم کردەوە. بەلام سەبارەت بە کتێبەکەم دەربارەی شەکسپیر تا نها دوو نامەم لە ئینگلیستانەوە پیٚ گەییووە کە دوو کەسی ئینگلیـز خۆشـحاڵی خۆیـان لەمـەڕ ئـەم بەرهەمـە دەربڕیـوەو لـەم رووەوە زۆر خۆشـحاڵم. لـە خوێنـەرانی روسـیەوە چـەند نامەیـەکی تانـەو تەشـەرئامێزم لـەو بارەیـەوە بـۆ نووسـراون کـە ئەوانەش خۆشحاڵیان کردووم.
وتارەکەی خۆتان دەربارەی (فیچر) بنووسە. بە هـەرحاڵ شتێکی باشو بە سوود دەبێت. و تۆ بە باشی لە عۆیەی ئەو کارە دێیت ،چونکە بە نۆڕینی تۆ ئەو فەیلەسوفێکی کەچڕەو و لادەرە. بـەلام تـەنیا خـاڵی پێویسـت ئەوەیـە کـە خـۆت لـە هـەر گـرژیو ئـاڵۆزیو تـوڕەیی و سەرزەنشتیٚ دوور بگرێتو لە جیاتی ئەوە دلۆڤانو مێریڤانو بە بەزەیی بیت. رێك وەکو چۆن کاتیٚ پیاوێکی نەخۆش دەگەڵ پیاوێکی ساغو تەندروستدا بەراورد دەکەین،و دەرهەق بە نەخۆشەکە سۆزو بەزەیی دەنوێنین. بەزەیی هاتنـەوە بـە حاڵی پیاوێکدا کە لـە نیعمـەتی ژیانی مەعنەوی مەحرومو بێبەشە کاریگەرترو خەمناکترە. دیارە کە گوێت لەم قسانەی من دەبێت هەستێکی ترسناك بەرۆکت دەگرێت، چونکە خودی من زۆرجار و بگرە هەمیشە بە شێوەیەکی ناخۆشو کرێت ئەم پرنسیپو بنەمایانەم ژێر پیٚ ناوە. تەواو ڕاستە، لیٚ مرۆڤ تا پیرتر دەبێت زووتر پوختەو پەروەردە دەبێت،و تۆ باوەڕناکەیت چۆن لەو دواییانەدا بۆم دەرکەوتووە چەند کەسێکی ناڕەسەنو ناجسن بووم. لەم رۆژانەدا زۆرجار رێکدەکەویٚ کە من دوایەمین بەرهەمم بۆ خوازیارانو داواکارانیان دەنێرم، بەلام لە ناردنی زۆربەیاندا دوو دڵی دەمگریٚ، چونکە بیرم دەکەوێتەوە ئەم بەرهەمانە تەژین لە هەستێن ناپەسندو مەحکوم کردنێن زاڵمانەو بیٚ ویژدانانەو تەنیا برێکی کەمیان لە محەکی رەخنە دەردەچن. بە نیازم خەتێکی ڕاستو چەپ بەسەر هەموو بەرهەمە کۆنەکانمدا بکێشمو لەم ماوە کورتەدا کە لە تەمەنم ماوە، دەست بە نووسینی بابەتی تازەو خاڵی لە بوغزو کەربو کینە بکەم. خودا حافیز! نامەی زیاترم بۆ بنووسە.

*ل. تولستوی*

ئەمڕۆکە بەرەبەیان ئەم نامەیەم نووسی. ناسا لە سەعات دووی شەودا کۆچی دوایی کرد. هێشتا ناتوانم پەی بە گەورەیی و کاریگەریی ئەم کۆستو خەسارەتە بەرم.

***پەراوێز:***

***١- مەبەست لە شەڕی نێوان دوو وەشانکارە، لەسەر چاپی کتێبێك دەربارەی شەکسپیر، کە تولستوی قەول و قەراری دەگەڵ یەکێکیاندا بە نێوی دل. د. سیتین کردبوو.***

## بۆ س. ئا. تولستویا، هاوسەرەکەی
## یاسنایا پولیانا، ١٩١٠/٧/١٤

١- دەفتەری بیرەوەریەکانم بە هیچ کەسێك نادەم، بەڵکو لەلای خۆم هەڵیدەگرم(١)

٢- بیرەوەرییە کۆنەکانم لە چرتکۆف وەردەگرمەوەو خۆم هەڵیدەگرمو لەوەشە بە ئەمانەت لە بانقێکدا دای بنەم.

٣- جا ئەگەر ئەمەی کە ئەو بەشەی لە ژێر کاریگەری هەستو سۆز، ناکۆکی کێشماکێشەکانی ئێمەدا نووسراوە، لەوەیە لەلایەن ئەو ژیاننامە نووسانەی ئایندەوە، کە دەگەڵ تۆدا میانەیەکی باشیان نیە ئیستغلال بکرێت - ئەگەر هەندێ هەستو سۆزێن رەوتەنیو تیژتێپەڕ چ لە بیرەوەرییەکانی مندا هەبن چ لە بیرەوەرییەکانی تۆدا ناشێت بەپێوەری پەیوەندییە راستەقینەکانی ئێمە حەساو بکرێت - ئامادەم لە بیرەوەرییەکانمدا یان لە نامەیەکی وەکو ئەم نامەیەدا، نۆڕینو دیدی خۆم سەبارەت بە تۆو هەڵسەنگاندنی ژیانی تۆ، بەڕاشکاوی دەربڕم.

دیدو بۆچوونی من سەبارەت بە تۆو ئەنجامی هەڵسەنگاندن و نرخاندنی من دەربارەی ژیانی تۆ بەمجۆرەیە: وەکو چۆن لە گەنجێتیدا تۆم خۆش ویستووە، سەرباری هەندێ هۆکاری جۆراو جۆر کە لە هەندێ رووەوە بووەتە مایەی ساردی میانەی ئێمە، بەڵام هەر لە بیرم بوویتو هێشتا خۆشم دەوێی. ئەو ساردییەی کە ئاماژەم کردێ لە سەرەتاو قۆناغی یەکەمدا لە سۆنگەی ئەوەوە بوو کە من رۆژ بە رۆژ پتر لە ژیانی دنیایی دوور دەکەوتمەوەو بێزار دەبووم، بەڵام تۆ نە ویستتو نەتوانیت چاوپۆشی لەوە بکەیت، چونکە لەو فاکتەرو هۆکارانە بێ ئاگا بوویت کە لە پشت ئەو بیرانەی منەوە بوون، و ئەمەش شتێکی ئاساییەو لەسەر ئەوە گلەییو گازاندەت لێناکەم. ئەمە قۆناغی یەکەم بوو. بەڵام لە قۆناغی دووەمدا - ئەگەر ئەم قسانەت ناپەسند دێنە بەرچاو داوای بوردن دەکەم، بەڵام ئەوەی هەنووکە لە نێوان ئێمەدا روو دەدات، زۆر گرینگەو نابێ لە وتن یان بیستنی حەقیقەت بترسین - ئاکاری تۆ لەم ساڵانەی دواییدا لە جاران توندتر،و ئامیرانەترو سەرکێشتر بووە. ڕەنگە تایبەتمەندێتی ئەم بیرو هزرانە، هەستی راستەقینەی تۆی دەرهەق بە من سارد نەکردبێتەوە، بەڵام کاریگەرییەکی خراپی کردووەتە سەر دەربڕینو نواندنی ئەم هەستە. ئەمە قۆناغی دووەم بوو، بەڵام قۆناغی سێیەم، کە بە کوشندەترین قۆناغ دێتە ژماردنو خەتاو گوناحی کەسمانی

تیا نیە، لە نۆڕینە تەواو هەڤدژەکانی ئێمەدا بۆ مانـاو ئامانجی ژیـان، خـۆی دەنـوێنێ. بۆچوونمان بۆ ژیان بە تەواوەتی جیاوازە! چ دەربارەی جۆری ژیانو چ دەربارەی چۆنیەتی رەفتـار دەگـەڵ خەڵکیـداو چ دەربـارەی کەرەسـتەو وەسـیلەکانی ژیـان. بـۆ نموونـە مـن دەوڵەمەندیو هەبوونی سەروەتو سامان بە گوناح دەزانم، تۆ بە مەرجی بنەڕەتی ژیانی دەژمێرێت، من ملم بۆ ژیانێکی ناشایستەو خراپ داوە، کەچی تۆ ئەم کارە بە تەسلیم بوونی من لە هەنبەر باوەڕەکانی خۆت دەزانیو بەمجۆرە بەدحاڵی بوونی نێوان ئێمە روو لە زیادی چووە. هۆیەکی دیکەش بۆ ئەم ساردیەی نێوانمان هەیە کە هەردووکمان تیایدا کەمتەرخەمو خەتابارین،و نامەوێ ئێستا باسی بکەم، چونکە بەلای منەوەو بۆ ئێستا گرینگ نیە. گرینگ ئەوەیە کە وێڕای هەموو بەد حاڵی بوونەکانی رابردوو، من هەمیشە تۆم خۆشویستووەو رێزم گرتوویت.

بەڵام سەبارەت بە هەڵسەنگاندنو نرخاندنی ژیانی تۆ لەلایەن منەوە، دەتوانم ئەمە بڵێم: من، یانی پیاوێکی پڕ لە کەموکوڕی، ناڕەسەنو تا حەزبکەی نالەبار،و نە زۆر گەنج، دەگەڵ تۆدا، کیـژێکی هـەژدە سـاڵانی پـاکیزەی رەسـەنو هۆشمەنـدا زەماوەنـد دەکـەم، وێـڕای رابـردووی ئالودەو لەوتاوم مودەتی پەنجا ساڵ دەگەڵ مندا بەسەر دەبەیت، خۆشت دەوێم،و مل بۆ ژیانێکی پڕ گێرمەو کێشە و دژوار دەدەیتو کۆمەڵێك منداڵ دێنێتە دنیاو پەروەردەیان دەکەیت، تەربێتیان دەدەی، سەرپەرشتیو چاودێریان دەکەیت بێئەوەی تووشی هیچ دوو دڵیو وەسوەسەیەك ببی، کە هەر ژنێکی دی لە شوێنی تۆبا لەگێن بوو تووشی ئەوپەڕی نیگەرانیو دوو دڵیو وەسوەسە ببێت. ژنێکی وەکو تۆ بەورە، ساغڵەمو جوان، بەڵام تۆ بە جۆرێ ژیاویت کە من بە هیچ شێوەیەك لەو رووەوە گلەییو گازاندەت لێناکەم، خۆ ئەگەر تۆ خۆت لە ژیانی مەعنەویو روحانی من هەڵنەقورتێنی، منیش ناتوانم گلەییت لێ بکەمو هەرگیز لۆمەو سەرزەنشتت ناکەم، چونکە ژیانی مەعنەوی هەر تاکێك رازێکە لە بەینی خۆیو خوای خۆیدا، جا دەرهێنانی ئەو رازە لە خەڵکی بە کەڵکی هیچ شتێك نایەت. خۆ ئەگەر جارێ لە جاران من تۆم لەم ژیانە مەحروم کردبێ، خۆم لە ژیانی مەعنەوی تۆ هەڵقورتاندبێ ئەوا هەڵەم کردووە و هەست بە تەخسیر دەکەم.

ئەمە بوو ڕەئیو هەڵسەنگاندنی من سەبارەت بە تۆ، بەڵام سەبارەت بەو شتانەی کە لەگینە لە بیرەوەرییەکانمدا دەربارەی تۆ هەبن، تەنیا ئەوەندە دەزانم هیچ شتێکی ناشیرین، دزێوو ناخۆشو پێچەوانەی ئەوەی کە ئێستا دەینووسم، تیا نیە،و بۆیە سێیەمین خاڵ سەبارەت بە بیرەوەرییەکانی من، پەیوەندی بەو نووسینانەوە هەیە کە لەگینە ببێتە مایەی رەنجان، بەڵام لە راستیا هیچ جۆرە ناڕەحەتیەك لە تۆدا دروست ناکات.

٤- ئەگەر پەیوەندی من دەگەڵ چرتکوفدا تۆ ناڕەحەت دەکات، ئامادەم چیتر نەی بینم. بەڵام دڵنیات دەکەم ئەم یەکتر نەبینینە ئەوەندەی بۆ ئەو ناخۆشە بۆ من ناخۆش نیە،و دەزانم ئەم کارە بۆ چرتکوف یەجگار خەمناکەو لە ئەنجامدا منیش ئازار دەدات. وێڕای ئەمەش، هەرکاتێ تۆ بتەوێ، خۆم لە دیتنی ئەو دەپارێزم. نەو دێمە سەر پێنجەمین

خالٚ، ئەگەر ئەم مەرجەی من قەبولٚ نەکەیتو زەمینەی ژیانێکی جێگیرو ئاسودە فەراهەم نەکەیت، من لەو قەولەی خۆم کە بەڵێنم دابوویتیٚ چیتر دوورەپەرێزیت لێنەکەم، ژێوان دەبمەوەو ئەم ماڵە بە جێدێڵم، بەڵام بێگومان ناچمە لای چرتکوفو تەنانەت ئەو مەرجەشی دەگەڵ دەکەم کە لە نزیکی من نەژی. وێڕای ئەمەش گومانی تیا نیە کە دەمەویٚ بڕۆم، چونکە ژیان لەم هەلومەرجەی ئێستادا بۆ من مەحاڵە.

خۆ ئەگەر بمتوانیبا بە ئاسانی ئازاری تۆ تەحەمول بکەم، درێژەم بە ژیان دەدا، بەڵام ئەمە لە کێشی مندا نیە.دوێنیٚ زۆر بە پەشێوی و نارەحەتی بەجێت هێشتم . دەمویست بچمە سەر تەختە خەوەکەو بخەوم بەڵام تا سەعات یەك هەر لە ناو جێگاکەدا تلم داوە و لە سەعات دوودا لە خەوو ڕابووم‌و تۆم هاتیتە بەرچاو. ئازیزەکەم، بەکاوەخۆ بیربکەوەو بە هەموو دڵو دەروونو هەستو سۆزێکتەوە بڕیاری باشتر بدە. سەبارەت بە خۆم،دڵنیات دەکەم بڕیاری خۆم داوەو هیچ ڕێگەیەکی ترم لە پێش نییە.ئازیزەکەم خۆت لە ئازاردانی خۆتو خەڵکی دوور بگرە! چونکە خۆت سەد ئەوەندەی خەڵکی ئازار دەچێژی!.

***بەیانی ٧/١٤***

***پەراوێز:***

***١- دەفتەری بیرەوەرییەکانی ساڵان (١٨٤٧- ١٩٠٠) ی تولستوی لە مۆزەخانەی (مردمیاتوف)ی مۆسکۆدا دانرابوو، بەڵام دەفتەری بیرەوەرییەکانی ساڵانی (١٩٠٠- ١٩٠٩) لە قاسەی یەکێك لە بانقەکانی مۆسکۆدا پارێزرا بوو. هاوسەرەکەی تولستوی دەیویست دوا بەشی بیرەوەرییەکانیش لەلای ئەو بیٚ.***

## بۆ و. ژ. چرتکوف

## یاسنایا پولیانا، ١٩١٠/٧/١٦

دۆستی ئازیزم، حاڵم باشە، تۆزیٚ لە ئاسایی، بیٚ هێزترم. بەڵام بە جدی باشترم، بە خۆشحاڵیەوە کەوتمە هەڵەچنو ڕاستکردنەوەی وتارەکانمو دەگەڵ ئەو زانا ئەمریکاییەدا کە دوێنیٚ هات کەوتمە گفتوگۆ،و هەروەها (مامۆستا ئاواتکا)شم بینی کە کەسێکی یەجگار خۆش مەشرەف بوو، بە پێچەوانەی ئەمریکاییەکەوە، زۆرم کەیف بەو گفتوگۆیە هات کە دەگەڵ خۆیو هاوسەرەکەیم کرد. باسو خواسی من دەگەڵ هەردوو لایاندا تایبەت بوو بە مەسەلە ئاینییەکان. ئەم ڕوسیە دڵپاك و سادەیە، چەند لەو ئەمریکاییە ڕاستگۆتر بوو.

سونیا ئاندریوڤنا، وەکو قەرار بوو دەگەڵ تانیادا بۆ تولا ڕۆییوە. کە من دۆستانی وەکو تۆو گالیاو منداڵانی وەکو تانیاو ساشام هەبن، ئیدی بۆچی دەبیٚ گلەیی لە ڕۆژگار بکەم، من عادەتمە

هەرکە شتێکم بیر بکەوێتەوە یان هەرکە خەبەرێك دەژنەوم روندك بە چاوانما دێتە خوارێ. بەڵام ئەگەر ڕاستت دەوێ زۆر بە ئاشکرا هەستدەکەم تا چ ڕادەیەك ئاسودەمو بە شێوەیەکی گشتی ئەم گریانە لە هەموو لایەکەوە کاریگەرییەکی باشی هەیە، بۆیە ئەگەر وردە نارەحەتیو نیگەرانیو کوێرەوەریو نامرادیان بە دەرهاویشتەی نزیك بوونەوە لە کۆتایی ژیان دابنرێ، بەڕاستی شتێکی گاڵتەجارە.

ئەمڕۆ بە تەما بووم بێم بۆ لای تۆ، هەڵبەتە ئەگەر ڕێگەیان دابام. یانی سۆنیا ئاندریوڤنا بە خۆی لەمبارەیەوە شتێکی بگوتبایە، بەڵام چونکە پەلەی ڕۆییشتنی بوو، هیچی نەگوت. بۆیە جارێ چاوپۆشی لەو هاتنە دەکەم، بەڵام بەدەردی فەرەنسیەکان دەڵێن "ئەو شتەی دوا دەکەوێ، نابێ بە لە دەست چوو دابنرێ"(١). دیدەنی تۆ ، بۆ دەرفەتێکی دی هەڵدەگرم. زۆر مەمنونی لیزاویا ئیڤانودنام کە یادی منی کردووەتەوە. گومانم لەوەدا نیە ئامۆژگارییەکانی ئەو بۆ من یەجگار پێویستو بە سوود دەبێت. بۆیە لەم لایەنەوە دڵنیام کە بە سازای گوتووە: "چارەی هەر دەردێك تەنیا خۆشەویستیو مەحەبەتە، خۆشەویستیو مەحەبەتە." قسەکانی ئەو زۆریان دڵ خۆش کردووم،و دووبارە کردنەوەیانم لەلایەن تۆوە پێ دەرمانە. لە جیاتی من سوپاسی بکە.

ئەگەر باوەڕم بەوە نەبوایە کە بەرهەڵستی سونیا ئاندریوڤنا لە دیداری من دەگەڵ تۆدا ، کاری خودایە نەك هی ئەو، ئەو ڕەفتارەیم زۆر بە نەنگینو حەیابەرەو ناشیرینو ناخۆش وەردەگرت. لەوەیە هەموو شتێك تەنانەت دوا نامەی تۆش ئاگری تووڕەیی ئەو پتر خۆش بکاتو گیانە ترسناكو ژەهراویو ئازاردەردەکەی لە لا ببوژێنێتەوە، چونکە ئەو شوێنەواری پیلانگێڕیو فەندەڵ فێڵان، لە هەموو شتێکدا دەبینێ. تەنانەت لەو کەسانەشدا دەیبینێ کە هیچ پێویستییەکیان بە خاپاندنو تەزویر نیە.

بە گالجا بڵێ سوپاسی دەکەم بۆ نامەکەیو بە دڵ هاوخەمی دەکەمو دڵم بە حاڵی دەسووتێ. لە خۆڕایی نیە کە متمانەم پێیەتیو خۆشم دەوێ. نامەی کەسێکی ژاپۆنیت بۆ دەنێرم، بەڕاستی نامەیەکی بێ ناوەڕۆکە. جارێکی دیم خوێندەوە. ئیدی بە خۆت دەزانی پێویستە بە نەزاکەتەوە وەڵام بدرێتەوە.

ئەگەر هیچ پێشهاتێك ڕووی نەداو نامەم بۆ نەنووسیت، وەکو جاران وەرە دیدەنیم. خودا حافیز!

*ل. ت*

***پەراوێز:***

*١- تولستوی کە زمانی فەرەنسی زۆر باش زانیوە، ئەو پەندەی لە دەقەکەدا بە زمانی فەرەنسی هێناوەتەوە.*

## بۆ و. ژ. چرتکوف
## یاسنایا پولیانا، ١٩١٠/٨/١٤

دۆستی ئازیزم سوپاست دەکەم کە ئەو نامەیەت بۆ ناردووم. زۆرم پێ ناخۆشە کە ئەوەندە بە خەمی منەوەیت. ئێستا کەوتمە ئەم بیرەی لە جیاتی قسەکردن نامەیەك بۆ سونیا ئاندرۆڤنا بنوسومو ئاگاداری بکەم کە بۆ خوا حافیزی بۆ لای تۆ دێم. بەڵام کە بۆ ماڵ گەڕامەوە هێندەم بە پەریشانیو خەمباریو بەستەزمانیو داماوی بینی، کە لێبڕام پرسی پێنەکەمو ڕەزامەندی ئەو بۆ دیتنی تۆ وەرنەگرم. بە هەرحاڵ ئەگەر سەفەری من بە تەنیا کەمە — لە حاڵێکا ئەگەر بێم، وا باشترە وەکو تانیا پێشنیازی کردووە، دەگەڵ سونیا ئاندریوڤنادا بێم — دەزانم، ئەم توڕەییە بێ ئامانەی ئەو ڕەنگە دەستکردو بە ئانقەست بێ — تا رادەیەکیش وایە — یان نەخۆشیەکی تایبەتی بێ و کۆنترۆڵو جڵەوی لە دەست دەربێنێ. خۆ ئەگەر بڵێین خەتای خۆیەتی، ئەوا نابێ ئەم خاڵە لە بیر بکەین ئەم خەتایە بۆ رابردوو دەگەڕێتەوە. ئەو حاڵی حازر مایەی لۆمەو گلەیی نییە، بەڵکو مایەی بەزەییەو بەلای کەمەوە بۆ من نابێ هێندەی دی توڕەی بکەمو ڕەنجو عەزابی زۆر زیاتر بکەم. لەلایەکی ترەوە تەسەورناکەم پێگیری من لەسەر نەخشەو بڕیارەکانم کە بە دڵی ئەو نیە، هیچ ئەنجامو ئاکامێکی باشی بۆ ئەو هەبێت. هەروەها من بۆیە ئەم هەڵوێستو ڕێگەیەم هەڵبژاردووە چونکە بە تەجروبە بۆم دەرکەوتووە، کە عینادیو لاساریو رکەبەری ئازارم دەدا، لە کاتێکا تەسلیم بوون بۆ من نەك هەر ئاسانە، بەڵکو ئۆخژنو خۆشیم دەخاتە دڵو دەروون. بۆیە ئاشکراکردنی ئەم سازشو نەرمکێشییە لە هەموو حاڵێکا بۆ من ئەستەم نیە. من بە تەجروبە بۆم دەرکەوتووە کە پێداگری لەسەر ڕێبازی خۆم، ئازارم دەدات، کەچی تەسلیم بوونو سازان ئاسانترە. بەڵام تەحەمولی ئەمە بۆ (سازا)ی پاكو بێگوناح کە گەنجو خوێن گەرمەو بەردەوام لەلایەن دایکییەوە هێرشی زاڵمانەو ناخۆشی دەکرێتەسەر، زۆر ئەستەمو زەحمەتە. بۆیە هەر کاتێ هەست بە تانە بکات بە گژ دایکیا دەچێتەوەو ئەم کارە بۆ ئەو ترسناکە.

زۆر بە داخەوەم کە جارێ لە دیتنی تۆو گالیاو لیزاوتا ئیڤانودنا مەحرومەو بە تایبەتی کە زۆرم حەز لە دیتنی ئەلیزانوڤیا بوو. زۆر مەمنونی ئەو لوتفەتم کە سەبارەت بە خۆمو کەسوکارم نواندووتە.

لەو چەند ڕۆژەی دواییدا حاڵم خراپ بوو، بەڵام هەنووکە هەست بە چاکبوون دەکەمو لەم رووەوە زۆر خۆشحاڵم، چونکە ئینسان کاتێ حاڵی باش بێ، ڕەنگە کەمتر کاری دزێوو ناشیرین بکات یان قسەی نابەجێ بکات.

حاڵی حازر جگە لە نامە نووسین هیچ کارێکی دی ناکەم، لە کاتێکا زۆرم حەزلێیە دەست بەکارێن دی، بە تایبەتی چالاکیەن هونەری بکەم. کاتێ کە لە مبارەیەوە بیردەکەمەوە هەستدەکەم بەرهەمەکانی من شادیو ئۆخژن بە دڵو دەروونت دەبەخشن. لەوەیە شتێکی باشی لێدەربچێ، بەڵام ئەگەر واش دەرنەچوو چارچیە و چ بکەم؟

*ل. ت*

*١٤ /٨ بەرە بەیان*

## بۆ و. ژ. چرتکوف

## یاسنایا پولیانا، ١٩١٠/١٠/١٧

**دۆستی ئازیزم**، حەزم لێیە بە دڵی کراوەوە قسەت دەگەڵدا بکەم. ناتوانم ئەو دەردە دڵەی دەگەڵ تۆیدا دەکەم لەگەڵ هیچ کەسێکی تریا بکەم. دەزانم هیچ کەسێك ناتوانێ وەکو تۆ، لە مەبەستو نیازی قسەکانم بگات. لەوە دەچێت قسەکانم بە روونیو رەوانی نەکەم. دوێنێ رۆژێکی ترسناك بوو. پاشان خەڵکی تر وردەکاریەکانت بۆ دەگێڕنەوە، من دەمەوێ لە جیاتی ئەوە، وەزعو حاڵی دەروونی خۆمت بۆ شرۆڤە بکەم. بەڵام دڵم بە حاڵی دەسووتێ،و خۆشحاڵم کە هەندیجار بێ ئەوەی زۆر لە خۆ بکەم هەستدەکەم هێشتا خۆشم دەوێ، وەکو دوێنێ شەو کە بە جۆرە پەشیمانیەکەوە هاتە لای منو دەستی بە فەراهەمکردنی پێویستییەکانی ئیسراحەتی من کردو کەوتە گەرمکردنی ژوورەکەم. هەرچەندە زۆر ماندوو و فرە بێتاقەت بوو، مەحەبەتێکی فرەی دەگەڵدا کردم. ئەگەر خەڵکانێك هەبن کە حەقیقەتی ژیانیان بەلاوە بێ مانا بێ – تەسەور دەکەم بە شێوەیەکی کاتی– دەتوانی چ بکەی.

دوێشەو بە تەمای کوستی بووم، بەڵام ئێستا خۆشحاڵم کە نەچووم. نها لە رووی بەدەنیەوە بێ هێزم، بەڵام لە رووی دەرونیەوە لە خۆم رازیم، بۆیە حەزدەکەم گرێی دڵی خۆمت بۆ بکەمەوەو بیرەکانمت بۆ هەڵڕێژم. تاکو دوێنێ کەمتر بیرم لە حەملە عەسەبیەکانی خۆم دەکردەوە، ئەلهەق هەر بیرم لێنەدەکردەوە، بەڵام دوێنێ زۆر بە روونی هەستم کرد کە لە یەکێك لەم حەملانەدا دەمرم، پەیم بەم راستیە برد ئەگەر چی ئەم جۆرە مردنە لە رووی بەدەنیەوە نیعمەتێکی گەورەیە، چونکە هیچ نەبێ لە ئازاری بەدەنیم رزگاردەکات، بەڵام لەلایەنی روحیەوە، لە ساتە بە نرخەکانی مەرگی ئاسایی، کە لوتفو چاکیەکی تایبەتی هەیە، مەحرومم دەکات. ئەمە کردویەتیە کارێك وا بیر بکەمەوە کە ئەگەر بە هۆی بێ دەرفەتیەوە نەتوانم وەکو پێویست سوود لە دوا ساتەکانی گەڕانەوە بۆ ویژدان وەربگرم، ئەوا بەلای کەمەوە لەمەدا سەرپشکم کە ساتەکانی گەڕانەوە بۆ ویژدان، ساتەکانی بە خۆدا چوونەوە بەسەر سەعاتانو رۆژانو هەیڤان – لەوەیە ساڵاندا کە دووره – دابەش بکەمو لەو کاتانەدا بە شێوەیەکی جدی ترو قوڵتر – نەك لە ئاستی بیرۆنی بەڵکو لە رووی دەرونییەوە – بکەومە گفتوگۆ دەگەڵ ویژدانم داو سوود و لەزەت لە دوا ساتە بەهادارەکانی پێش مەرگی ئاشکراو مسۆگەر وەربگرم. ئەم هەستو بیرە لە دوێنێوە بە سەرما زاڵ بووەو تا ئێستا بەرۆکی زەینی بەرنەداوم،و هەوڵدەدەم تا دەمی مردن بیپارێزم، لەزەتێکی

تایبەتیم لەلا دروست دەکات، کە حەزدەکەم بۆ تۆشی بگوازمەوە، هەر ئەم هەستەیە کە لەم وەزعە دژوارو سەختەی ئێستامدا فریام دەکەویٚو ڕێنوێنیم دەکاتو ئەو شتەی کە تا ئێستا مایەی ڕەنجو ئازارم بووەو لەگینە لە ئایندەشدا هەر بە ئازارو سویٚ بێت، دەگۆڕێتو دەیکات بە سەرچاوەی شادمانیو لەزەت. لەوەی پتر لەسەر ئەم بابەتە ناڕۆم با بمێنیٚ بۆ دوایی.

تۆش هەوڵبدە گرێی دڵی خۆت بۆ من بکەرەوە. ناخوازم بڵێم بمبەخشە، چونکە دڵنیام حەز ناکەیت تاقە وشەیەك دەربارەی شتێك کە شایستەی بەخشین بیٚ لە منەوە بژنەوی، جا بۆیە منیش ڕێكو ڕاست، بیٚ پەردە هەستی خۆم بەرانبەر بە تۆ دەردەبڕم. بەش بە حاڵی خۆم مەمنونی ئەو لوتفەم کە دەرهەق بە من هەتە، ئەوا دیسان شەپۆلی سۆزو گودازان بەسەر دڵما زاڵ بوو، لیٚ تۆ چاو لە من مەکە.

بەڵام بەداخەوەم کە تا نها نەمتوانیوە گالیا بدینم. تۆ لە جیاتی من داوای بوردنی لێبکە. لەوەیە داواو تکاکەم قەبوڵ بکات.

***ل. ت***

***پەراوێز:***

***١– مەبەستی هەوڵە خۆکوژییەکەی سونیا ئاندریوڤنایە. تولستوی لە یاداشتەکانی خۆیدا لە بەرواری ١٦/١٠دا دەڵێت: لە کاتی فراڤینـدا پێمگـوت بـە تـەمام بچـمە دیـدەنی چرتکوف، ئیدی توفانێك هەڵیکرد. بە هەشتاو لە ماڵ وەدەرکەوتو بەرەو تکیاتنکی – ئەو گوندەی چرتکوفی تیا دەژیا– ڕۆیی، سونیا ئاندریوڤنا پاشان گێڕابوویەوە کە بە تەما بووە لەسەر ڕێگای تکیاتنکی خۆی بە عاردیدا بدات، تا تولستوی لە کاتی ڕۆیشتنیا بۆ ئەوێندەر، بەو دەقەوە بیدینیٚ، لە چوونەکەی بۆ لای چرتکوف ژیوانی بکاتەوە. تولستوی لە یاداشتەکانی خۆیدا بە متمانەوە دەڵێت: من بە سواری ئەسپ بە دوایدا ڕۆیشتمو (دوسان)م نارد تا پێی بڵیٚ ناچمە دیدەنی چرتکوف، بەڵام دوسان ئەوی نەدۆزی بووەوە. بۆ ماڵ گەڕامەوە، بەڵام ئەوم نەبینی، سەعات حەوتی ئێواریٚ بوو. ئەنجام گەڕایەوە. جلێکی ڕێكوپێکی لەبەر بوو. بە هێمنی لەسەر کورسیەك دانیشت. هیچ شتێکی نەخواردبوو، بە درێژایی شەو هەر پاڕاوەتەوەو عوزرخوایی کردووەو دانی بەوەدا نا کە بە خۆڕایی من ئازار دەداتو بەڵێنی دا لەمەوپاش ئەزیەتم نەدات. ئەم وەزعو حاڵە دەگاتە کویٚ؟ تولستوی لە ١٦/١٠دا لە یاداشتێکی دا بە ناونیشانی "تەنیا بۆ خۆم" دەڵێت: ئەمڕۆم لێبڕام بچمە دیدەنی تانیا، لیٚ دوو دڵ بووم.و لە پڕ تووشی ماخولیایەکی ترسناك بوو. ئەلهەقی خۆی پێشنیازی کرد بچمە دیدەنی چرتکوف، بەڵام ئەمڕۆکە هەر کە ناوی چرتکوف–م هێنا، بە جاریٚ هاڕوژا. وەزعو حاڵەکە زۆر نالەبارو خراپە. خودا ڕەحمم پێبکات. پێمگوت هیچ بەڵێنێکم نەداوەو نایدەم، بەڵام تا بتوانم خۆم لە ئازاردانی دوور دەگرم. تولستوی جگە لەمە، لە ١٠/١٧، لە هەمان دەفتەری بیرەوەریاندا دەڵێت: نەخۆشو بێتاقەتم، سونیا ئاندریوڤنا***

*باشترە. پێدەچێت هەست بە پەشیمانی بکات، بەڵام لەم پەشیمانیەشدا شوێنەواری توندڕەوانەی ماخولیانوێنی بەدی دەکرێت. زۆر نیگەران و پەریشانە و دەستی من ماچ دەکات و بەردەوام قسە دەکات. لە ڕووی دەرونییەوە حاڵم باشە و دەزانم چ کەسێکم و کێم.*

## بۆ س. ئا. تولستویا، هاوسەرەکەی
## یاسنایا پولیانا، ١٩١٠/١٠/٢٨(١)

دەزانم ڕۆییشتنی من، نارەحەت و نیگەرانت دەکات. بە داخەوەم. بەڵام هەقە تۆش لە وەزع و حاڵی من بگەیت و ئەوە بزانیت کە هیچ کارێکی دیکەم لە دەست نەدەهات و چارم ناچار بوو، وەزع و حاڵی من لە ماڵەوە ڕۆژ بە ڕۆژ خراتر دەبوو، ئەمە جگە لەوەی چیتر ناتوانم بەو تەنتەنەو سەنسەنەو جەلال و شکۆو ڕواڵەتبازیانەی جارانەوە بژیم. حەزدەکەم هەمان ڕێگە بگرمەبەر کە عادەتەن پیرەمێرانی هاوتەمەنی من دەیگرنەبەر. یانی بەو مانایەی کە ژیانی دنیایی تەرك دەکەن و دوا ڕۆژانی تەمەنیان لە ئارامی و گۆشەگیریدا بەسەر دەبەن.

تکایە لە من تێبگە، و تەنانەت ئەگەر بە شوێنەکەشت زانیم تاقیبم مەکە. چونکە هاتنی تۆ وەزعی هەردووکمان، من و تۆش خراپترو نالەبارتر دەکات و نە لە بڕیارەکەمم ژێوان دەکاتەوە و نە دەیگۆڕێت. بە بۆنەی چل و هەشتەمین ساڵی ژیانی ئابڕومەندانەت دەگەڵ منا سوپاست دەکەم و تکات لێدەکەم لە هەڵە و خەتایەکانم ببورە. گەردنم ئازا بکە. منیش لە ناخی دڵەوە گەردنت ئازادەکەم و لە هەر کەمتەرخەیەکت، لە هەر تەخسیرێکت، ئەگەر کەم و کوڕی و تەخسیرت هەبوو بێ، دەبورم. داوات لێدەکەم خۆت دەگەڵ ئەو وەزعە تازەیەدا کە دووری من لە ماڵەوە بۆی دروست کردویت، ڕابێنە و هەرجۆرە هەستێکی دژمنانە سەبارەت بە من لە دڵی خۆت دەربکە. ئەگەر ویستت شتێکم پێ ڕابگەیەنی، بە سازا بڵێ، چونکە ئەو بە شوێنەکەم دەزانێت و کارەکەت بۆ ڕایی دەکات، بەڵام ناتوانێ شوێنەکەمت پێ بڵێ، چونکە بەڵێنی مسۆگەرم لێوەرگرتووە کە بەکەسی نەڵێت!

***لیف تولستوی***

(سازا)م ڕاسپاردووە شتێن پێویستی خۆم و نووسینەکانم کۆبکاتەوە و بۆمی بنێرێت.

***ل. ت.***

ئەوا من ڕۆیشتم. بەداخەوەم کە ڕۆیشتنی من نارەحەت و نیگەرانت دەکات، بەڵام تکایە بمبورە و ئەوە بزانە کە هیچ چارو ڕێگەیەکی ترم نەبوو. بۆ پیاوێکی وەکو من کە پابەندی ویژدانە،

درێژەدان بە ژیانی دەوڵەمەندانە لە نێوان هەژاراندا و پەیڕەویکردنی ژیانی تاوانبارانە لە ژینگەو هەلومەرجی جەلال و شکۆی گەوجانەدا، لە هەنبەر ڕۆژە ڕەشی و کلۆڵی ئەو خەڵکانەدا کە دەوریان داوم، لە توانامدا نەمابوو. من هەمان کارم کردووە کە هەزاران پیری زورهان، وەختێ لە مردن نزیک دەبنەوە، دەیکەن. کاتێ بۆیان دەردەکەوێ کە ژیانی رابردوویان نایەتە تەحەمول کردن، ماڵی خۆ بەجێدێڵن و روو دەکەنە شوێنی پیرۆز و پاک تا بەگوێرەی دڵی خۆیان بژین. زۆربەی ئەوانە لە کاتێکدا کە باوەڕیان دەگەڵ باوەڕی کەشیشاندا تێک بکاتەوە ڕێگەی دێرو کڵێسا دەگرنەبەر، بەڵام من، چونکە ئیمانی مەزەبی و ئاینیم نیە، پە نادەبەمە بەر گۆشەی تەنیایی. پێویستم بە تەنیاییە. تکایە بە دومدا مەیە، و هەرکاتێ بە شوێنەکەت زانیم، هەوڵ مەدە بێی بۆ لام. چونکە هاتنی تۆ جگە لەوەی قوڕەکە لە هەردووکمان خەستتر دەکاتەوە، هیچ سوودێکی تری نیە. خودا حافیز ئەی شەریکەکەی ژیانم. ماوەی چل و هەشت دانە ساڵ دەگەڵ مندا هەڵتکرد. زۆر سوپاست دەکەم کە بە درێژی ئەو چل و هەشت ساڵە ژیانێکی ئابڕومەندانەت لەگەڵ بردمە سەر، دڵسۆزانە چاودێری و خزمەتی من و منداڵەکانمانت کرد. تکات لێدەکەم خۆت دەگەڵ ئەم وەزعە تازەیەدا کە ڕۆیشتنی من بۆی هێناویتە ئاراوە، ڕابێنەو سەبارەت بە من لاساری و سەر سەختی مەکە. تکات لێدەکەم کە گەردنم ئازا بکەیت و لە گشت گوناح و خەتاو کەموکوڕیەکانم ببوری. وەکو چۆن من گەردنت ئازادەکەم و لەهەر جۆرە تەخسیرییەک، ئەگەر تەخسیرێکت هەبوو بێ، سەبارەت بە خۆم دەتبورم و وەکو چۆن من کەمترین ڕق و کینەیەکم دەرهەق بە تۆ لە دڵدا نیە، تۆش هیچ ڕق و بوغزێک بە هۆی دوورکەوتنەوەم لە ماڵ، لە دڵ مەگرە. هەرکاتێ ویستت شتێک بە من ڕابگەیەنی،پەیوەندی بە (سازا)وە بکە. ئەو بە شوێنەکەم دەزانێ و قەولی تەواوەتی داومەتێ کە بە هیچ کەسێکی نەڵێت.

***پەراوێز:***

***١- تولستوی لە دەفتەری بیرەوەرییە تایبەتیەکانی خۆیدا نووسیویەتی کە لە شەوانی ٢٧و١٠/٢٨دا دوچاری قەیرانێک بوو کە واداری کرد ئەو ئارەزووەی مودەتی سێ ساڵ بوو لە دڵیا بوو، پراکتیزە بکات و لە ماڵ هەڵێ.***

## بۆ و. ژ. چرتکوف

## ئوپتینا پوستین، ١٩١٠/١٠/٢٩

بە دیتنی ئانرا سپرجنیکۆ(١) زۆر خۆشحاڵ بووم،من بە تەمای هەواڵی خراپ بووم، کەچی هەواڵێکی یەجگار ناخۆش و دڵتەزێنی دامێ(٢). چاوەڕوانی ئەنجامی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی

خانەوادەییم. تەسەوردەکەم بڕیارێکی باش بدرێت، بە هەرحاڵ گەڕانەوەی من بۆ ژیانی پێشووم، بە هۆی ئەو هەموو گلەیی و گازاندەو سەرزەنشتەی کە لە من کراوەو بە هۆی ئەو مامەڵە ساردو سڕەی دەگەڵما کراوە، لە کاتێکا هێشتا خۆم بە شایستەی ڕێزو حورمەت دەزانم، لەوەیە نەك هەر زۆر زەحمەت بێ ،بەڵکو مەحاڵیش بێت. هیچ جۆرە سازشێك ناکەم و هەرچی دەبێ با ببێ. تاقە شتی گرینگ ئەوەیە کە بە گوێرەی توانا،و تا دەتوانم کەمتر هەڵەو خەتا بکەم.

سوپاست دەکەم کە نامەت بۆ ناردووم، سیرچنیکوت بۆ لا ناردومو هەروەها نامەت بۆ سازا ناردووە. سەبارەت بە وەزعو حاڵی بەدەنیو دەوونیم، ناتوانم بڵێم باشم، لە هەردوو لایەنەکەوە هەست بە بێتاقەتیو نائومێدی دەکەم.

خەمی سازاو منداڵەکانم، سیرزاو تانیامە. دڵم بەحاڵی تۆو بە تایبەتی گالیا دەسووتێ.

خودا حافیز، مەمنونی لوتفی تۆمو سوپاسی ئەو هەموو مەحەبەتەت دەکەم.

***ل. ت***

***پەراوێز:***

***١- A.P. Sergenco لەلایەن چرتکوفەوە بۆ ئوپتینا پوستین هاتبوو تا نامەی چرتکوفو ئالکساندرا تولستوی، بە تولستوی بگەیەنێ. هەموو ڕۆژەکە لە دێردا، لای تولستوی مابووەوە،و تولستوی دوا بەرهەمی خۆی بە ناوی (وەسیلەی حەقیقی) کە دژی ئیعدام بوو، بۆ خوێندبووەوە تا بینوسێتەوە.***

***٢- هەواڵە ناخۆشو دڵتەزێنەکە، پەیوەندی بە ژنەکەی تولستوی یەوە هەبوو. کاتێ زانی بووی تولستوی لە ماڵ هەڵاتووە، بە نیازی خۆکوژی خۆی خستبووە باتڵاغو زەلکاوێکەوە.***

## بۆ ئا. ل. تولستوی، کیژەکەی

## ئوپتینا پوستین، ١٩١٠/١٠/٢٩

**سازای ئازیزم.** سیرچنیکو لە وەزعو حاڵی من ئاگادارت دەکات. وەزعم زۆر دژوارە. هەست بە بارێکی قورس دەکەم. گرینگ ئەوەیە هیچ خەتاو گوناحێك نەکەم. هەموو هەوڵێکم بۆ ئەمە دەخەمە کار، هەڵبەتە گوناحو خەتام کردووەو خەتاش دەکەم، بەڵام هەوڵدەدەم ئەوەندەی لە توانام دابێت کەمترین خەتاو گوناح بکەم.

سەبارەت بە تۆش هەمان ئاوات و ئارەزووم هەیە، بە تایبەتی لەوەتای کە زانیومە ئەرکێکی یەجگار دژوارت لە ئەستۆ گرتووەو لە سە رووی توانای گەنجانەی تۆوەیە. من هیچ بڕیارێکم نەداوەو حەزناکەم بیدەم. هەوڵدەدەم ئەوەی کە ناتوانم چاوپۆشی لێبکەم، ئەنجامی بدەم و بەپێی توانا خۆم لە قەرەی کارێك نەدەم کە دەرەقەتی نەیەم. لە ناوەڕۆکی ئەو نامەیەمدا کە بۆ چرتکوفم نووسیوە دەتوانی هەستەکانم بخوێنیتەوە، بزانی هەست بە چی دەکەم، نەك بیرەکانم. زۆرم چاو لە کۆمەکی تانیاو سیرزایە. گرینگ ئەمەیە کە ئەوان بزانن و خەڵکی تریش تێبگەیەنن کە تاقیبکردنی من و گویّ هەڵخستن و خوتەو بۆڵەو سەرزەنشتی بەردەوام و بڕیاردان بە هەوەسی خۆی لە جیاتی من، نەفرەتی بیّ بنج و بناوان و خۆڕایی لە نزیکترین و زەروریترین دۆستی من(٢)، بۆ من نەك هەر ناخۆشە بەڵکو لە تەحەمول بەدەرە، جا لەم حاڵەدا ئەوەی هەقە بیر لە خۆ غەرقکردن بکاتەوە منم نەك ئەو. چونکە من تەنیا خوازیاری یەك شتم، ئەویش رزگاربوونە لە دەست ئەوو درۆکانی و فریوکارییەکانی و ئەو دژمنایەتی و کەرب و کینەی کە سەراپای داگیرکردووە. هەڵبەتە ئەوان ناتوانن ئەم حەقیقەت و راستیانەی تێبگەیەنن، بەڵام دەتوانن ئاگاداری بکەنەوە. تێکڕای رەفتارو هەڵسوکەوتی دەربارەی من نەك نیشانەی خۆشەویستی نین، بەڵکو بەڵگەو نیشانەی ویست و نیازی ئەوە بۆ کوشتنی من، کە هەڵبەتە بەم ئاوات و ئامانجەی دەگات . چونکە هیوادارم کە کاتیّ جەڵتەی سێیەم لێی دام، راست نەبمەوەو خۆم و ئەویش لە شەڕی ژیانی رابردوو کە حەزناکەم جارێکی دی بگەڕێمەوە سەری، رزگار بکەم.

تۆ تەماشا ئازیزم چەند ناجسن و نەگریسم؟ حەقیقەت لە تۆ ناشارمەوە. لە ساغ و سەلامەتی خۆتم ئاگادار بکە، ماچت دەکەم.

***ل. تولستوی***

دەچین بۆ ساموردینو. دوسان، زۆر سەرقاڵی چالاکییە. وەزعی بەدەنیم باشە.

***پەراوێز:***

***١- مەبەست لە چرتکوفە کە ژنەکەی تولستوی حەزی لە چارەی نەدەکرد.***

## بۆ س. ئا. تولستویا، هاوسەرەکەی

## ساموردینو، ٣٠-١٩١/١٠/٣١

**دیداری ئێمە، بە تایبەتی گەڕانەوەی من بۆ ماڵ ئیدی مەحاڵە.** هەموو دەڵێن ئەم جۆرە دیدارە بۆ تو فرە بە زیانە و بۆ من مەترسیدارە، چونکە بە هۆی تورەیی و پەریشانی و نیگەرانی وپشم و غەزەبی دەرونی تۆوە، وەزع و حاڵی من خراتر دەبێت. من ئامۆژگاریت دەکەم کە خۆت سەغڵەت مەکەو ئەوەی روویداوە بە ئاسایی وەری بگرە،و خۆت دەگەڵ رەوشە تازەکەدا بگونجێنەو لە هەموو ئەمانەش گرینگتر خەمی چارەسەری خۆت بخو.

ناڵێم هەرکاتێ خۆشت ویستم، بەڵکو هەرکاتێ دەرهەق بە من هەستت بە دژمنایەتی و بوغز نەکرد، هەوڵبدە کەمێك لە حاڵ و وەزعی من بگەی. ئەگەر ئەمە بکەیت نەك من مەحکوم ناکەیت، بەڵکو یارمەتیم دەدەیت کە هەندێ ئاسودە ببم و ئەگەری ژیانێکی مرۆڤانیم بۆ دەرەخسێنێ،و بەسەر خۆتدا زاڵ دەبیت و ئیدی حەزناکەیت من بەم حاڵەوە بۆ ماڵ بگەڕێمەوە. باری دەرونی ئێستای تۆو خواستەکانت و هەوڵی خۆکوژیت کە باشترین بەڵگەو نیشانەی ئەوەیە کۆنترۆڵی خۆت لە دەست داوە، دەکاتە کارێك کە گەڕانەوەی من بەم وەزع و حاڵەی ئێستامەوە، مەحاڵ و تەسەورنەکردەنی بێت. رزگار کردنی هەموو نزیکان و کەسوکاری تۆو هەروەها من،و بە تایبەتی خۆت لە رەنج و عەزاب تەنیا لە دەستی تۆدایە. هەوڵبدە هەموو هێزو توانای خۆت بۆ ئەنجامدانی خواستەکانت – بە تایبەتی بۆ گەڕانەوەی من – نەخەیتە گەڕ. بەڵکو بۆ ئارامکردنەوەی خۆت و روحی خۆتی تەرخان بکە. هەنگێ دەبینی بەو ئاواتە دەگەی کە گەرەکتە. دوو رۆژم لە دساموردینو و لە ئوپتینا بەسەر بردوو ئێستا سەفەر دەکەم. بەدەم رێوە ئەم نامەیەم ناردووە. پێت ناڵێم بۆ کوێ دەڕۆم، چونکە پێموایە جودایی چ بۆ تۆو چ بۆ من پێویستە. تۆم خۆش دەوێت و لە ناخی ناخمەوە خەمباری تۆم، بەڵام جگە لەم رێیەی گرتوومەتە بەر هیچ رێیەکی ترم نیە. وا بیرنەکەیەوە بۆیەم ماڵ چۆڵکردووە چونکە تۆم خۆش ناوێت، بە پێچەوانەوە تا ئێستاش خۆشم دەوێی. دەزانم، نامەکەی تۆ راستگۆیانە نووسراوە، بەڵام تۆ ناتوانیێ هەموو خواستەکانت بێنێتە دی. حاڵی حازر مەسەلەی رازیکردنی من و دابینکردنی پێویستییەکانی من لە ئارادا نیە، بەڵکو مەسەلەی هەرە گرینگ ئەوەیە کە تۆ هاوسەنگی دەرونی و روحی خۆت بپارێزیت و رەوش و رێبازێکی ئاقڵانە بەرانبەر بە ژیان بگریتە بەر. تا ئەم مەسەلەیە چارەسەر نەکەیت، بەردەوامبوونی ژیانی تۆ دەگەڵ مندا لە تەسەور نایەت. یانی گەڕانەوەی من بۆ ماڵەوە، بەم وەزع و حاڵەوە کە تۆی تیایت، دەکاتە چاوپۆشی لە ژیان. خۆم بەوە نازانم کە ئەم هەقەم هەبێت. خودا حافیز سونیای ئازیزم! ژیان گاڵتە نیەو ئێمە ئەو هەقەمان نیە بە گوێرەی هەوەس و کەیفی دڵی خۆمان توڕی بدەین، هەروەها ئەندازە گرتنی ژیان بە مەتری زەمانە کارێکی ئاقڵانە نیە.

**لەوەیە ئەم چەند مانگەی کە لە تەمەنی من ماوە، یەجگار گرینگتر بێ لە هەموو ئەو ساڵانەی کە تا نهو بەسەرمان بردووە. بۆیە پێویستە بە باشی بژین.**

***ل.ت***

## دوا نامەی تولستوی بە بیست رۆژ بەر لە مردنی
## ئاستاپاوڤ ، ١٩١٠/١١/١

**رۆڵە ئازیزەکانم سیرزاو تانیا**

**هیوادارم،و ڕاستت دەوێ دڵنیام کە گلەیی و گازاندەی ئەوەم لێناکەن کە بۆ ئێرەم بانگ نەکردوون. هاتنی ئێوە بۆ ئێرە بەبێ دایکتان، دەبێتە مایەی رەنجانی زۆری ئەوو برایەکانی ترتان. ئیدی ئێوە دەبێ ئەمە بزانن. چرتکوفم لەبەر ئەوە بۆ ئێرە بانگ کردووە چونکە هەڵوێستێکی تایبەتی سەبارەت بە من هەیە، چرتکوف ژیانی خۆی بۆ خزمەتی ئارمانجێك تەرخان کردووە کە منیش لە ماوەی ئەم چل ساڵەی دوایی ژیانمدا هەموو هەوڵ و کۆششێکی خۆم وەقفی هەمان ئارمانج کردووە. ئەم ئارمانجە بێجگە لەوەی کە بۆ من لە رادەبەدەر ئازیزو پیرۆزە، بمانەوێ و نەمانەوێ بایەخ و گرینگییەکی فرەی بۆ هەموو تیرەی بەشەر هەیە بە ئێوەشەوە. سوپاستان دەکەم کە رەفتارتان سەبارەت بە من دڵسۆزانەیە. نازانم ئایا ئەم نامەیە شەقڵی خودا حافیزی پێوەیە یان نا؟ بەڵام هەستم کرد پێویستە ئەوەی لە دڵمدایە بۆ ئێوەی باس بکەم. جا بەم بۆنەیەوە حەزدەکەم ئامۆژگارییەکی تۆ بکەم سیرزا: بیر لە ژیانی خۆت بکەوە، لە خۆت بپرسە کێیت و مانای ژیانی ئینسان چیەو چۆن دەتوانی بە شێوەیەکی لۆژیکی رۆژگار بەسەر بەریت. بیروباوەڕی داروینزم و ئەو رێبازو رێچکەیەی کە تۆ بۆ ژیان هەڵتبژاردووە، مانای ژیانت بۆ روون ناکاتەوەو چۆنیەتی ژیانت تێ ناگەیەنێت، بەبێ میتۆدو رێبازێکی ئەمین کە بتوانی بە متمانەوە پەیڕەوی بکەیت، ژیانت پڕ دەبێت لە ناکامی و رۆژ رەشی، بیر لەمە بکەرەوە. بۆیە ئەم راستیەت پێدەڵێم چونکە لە مردندام.**

**خودا حافیز. هەوڵبدەن دایکتان هێور بکەنەوە، هەستدەکەم بەزەییم پێیدا دێتەوە، خۆشم دەوێ.**

***باوکی دڵسۆزتان***

***ل. تولستوی***

## دوا بروسکەی تولستوی بۆ چرتکوف
## ئاستاپاوف، ١٩١٠/١١/٣ سەعات پێنجی پاش نیوەڕۆ.

**حاڵم باشە، بەڵام دڵم هێندە لاوازە که دیدارم دەگەڵ هاوسەرەکەمدا، دەمکوژێت. من هاتووم تا بە گوێرەی باری دەروونی خۆم بژیم...**

*

**چرتکوف، رۆژی ١٩١٠/١١/٢ بۆ ئاستاپاوف هاتو تا مردنی تولستوی لە رۆژی ١٩١٠/١١/٧، سەعات ٦ر٣٠ی بەرەبەیان، بە دیارییەوە مایەوە.**

**تێبینی:**

***رۆژی ٢٠١١/٨/٨، لە سلێمانی، گەڕەکی رزگاری، ماڵی خۆم، لە پاچڤەی ئەم بەرهەمە بوومەوە کە لەم سەرچاوەیەوە کراوە بە کوردی.***

***نامەهای تولستوی***

***ترجمە: مشفق همدانی***

***چاپ اول: تهران، مهرانديش ١٣٨٠ (٢٠٠١)***

***حەمە کەریم عارف***

*** کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.**

- **لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.**

**• یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) رۆژنامەی هاوکاری لە ١٩٧٣/٦/٨ بڵاوبووەتەوە.**

- **لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.**
- **سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢، گۆڤاری نەوشەفەق.**

*** جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك،نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.**

***لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستان بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.**

- **لە هەشتاکانەوە تا ٢٠١٠/٨/٢٠راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.**
- **زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:**

١- **تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩**

٢- **کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم،١٩٨٨،چاپی سێیەم ٢٠٠٧**

٣- **بەیداخ، چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٨٨**

٤- **داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم ٢٠٠٥**

٥- **لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك،چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان**

٦- **کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێڕان چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ**

٧- **نینا، رۆمان، سابت رەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،١٩٨٥ چاپی سێیەم ٢٠٠٥**

٨- ناموٚ، روٚمان، ئەلبیر کاموٚ، چاپی یەکەم، شاخ١٩٨٧چاپی چوارەم ٢٠٠٩ وەشانخانەی سایە،سلێمانی
٩- ڕێبەر، روٚمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) ١٩٨٣، چاپی دووەم، ٢٠٠٧
١٠-شکست، روٚمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راە کارگر)، چاپی دووەم، ٢٠٠٩ خانەی وەرگێڕان.
١١- هاوماڵەکان، روٚمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم ٢٠٠٠ دەزگای گوڵان
١٢ – بێناسنامەکان، روٚمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦
١٣- قوربانی، روٚمان، هیرب میدوٚ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق
١٤- دووره وڵات، روٚمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گوڵان
١٥- ئازادی یا مەرگ، روٚمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سوٚران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨
١٦- چیروٚکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، ٢٠٠٤ کتێبخانەی سوٚران هەولێر
١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گوٚرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥
١٨- ئەو روٚژەی کە ونبووم (کوٚمەڵە چیروٚکی بیانی) چاپی یەکەم،٢٠٠٦
١٩- جیّ پیّ (کوٚمەڵە چیروٚکی فارسی) چاپی یەکەم ٢٠٠٦،نووسەرانی کەرکوك
٢٠- زندە خەون، کوٚمەڵە چیروٚك، چیخوٚف،چ١،دەزگای موکریانی
٢١- چیروٚکستان ،کوٚمەڵێك دەق‌ورەخنەی جیهانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسەرانی کەرکوك
٢٢-دیدارو دەق‌و رەخنە،چ٢٠٠٥،١
٢٣-دیداری چیروٚکڤانی، چ٢٠٠٥،١
٢٤-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ٢٠٠٨،١نووسەرانی کەرکوك
٢٥- میوان، چیروٚك،ئەلبێر کاموٚ

---

٢٦- مەسەلەی کورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥
٢٧- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١٩٩٨١،١
٢٨- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤
٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بوٚ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦
٣٠- کورد لە سەدەی نوٚزدەوبیستەمدا،کریس کوٚچرا،چاپی شەشەم ٢٠١١
٣١ –کورد لە ئینسکلوٚپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨
٣٢- چینی کوٚن، چ١(     )دەزگای موکریانی

---

٣٣- دلێریی خوٚراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی
٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

---

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانوٚنامە، باول ئایز لەر

٣٦- به دوعا شاعیرەكان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٣٧- جولەكەكەی ماڵتا، شانۆنامە،كریستۆفەر مالرۆ.
٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر كامۆ
٣٩- بەد حاڵی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر كامۆ.
٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غوڵام حسەینی ساعیدی)
٤١- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەكسپیر.چاپی یەكەم ٢٠٠٩، بڵاوەخانەی سایە، سلێمانی
٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵڵائەلبوسێری..

---

٤٣- مندالّە دارینە، چیرۆكی درێژ بۆ مندالأن.
٤٤- فاشیزم چییە؟ كۆمەڵە چیرۆك بۆ مندالأن، یەلماز گونای
٤٥- شوانە بچكۆلەكە، چیرۆكێكی درێژی چینی یە بۆ مندالأن
٤٦- زارۆكستان (چوار شانۆنامە بۆ منالأن)
٤٧- چەند چیرۆكێك لە ئەفسانەی یونانی كۆنەوە (٢٣ئەفسانە)

---

٤٨- لە گەنجینەی حیكایەتی توركمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەكەم٢٠٠٨
٤٩- ئەفسانەێن گریكی و رۆمانی، چاپی یەكەم (٢٠٠٤) كتێبخانەی سۆران، هەولێر
٥٠- ئیلیادە، هۆمیرۆس، چ١،دەزگای سەردەم ٢٠٠٩

---

٥١- گۆڤەنــد و زنــار (فەرهــەنگی فارســی - كــوردی) حەمــە كــەریم عــارف، چ١(٢٠٠٦-٢٠٠٨)دەزگای موكریانی
٥٢-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چ١، ٢٠٠١

---

٥٣- چرنیشفسكی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس
٥٤- چایكۆ فسكی، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٦- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی
٥٧- گوگول، نووسەری ریالیست
٥٨- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی
٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
٦٠- خافروغ لە شیعر دەدویٚ، ژیان و بەرهەمی

---

٦١- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا (بە شەریكی) چاپی یەكەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان
٦٢-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە كەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

---

٦٣- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٤- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٥- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکاو ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٦- ریالیزم‌ودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام،چ٢٠٠٤،١،دەزگای سپیرێز

٦٧- قوتابخانە ئەدەبییەکان،رەزا سەید حسەینی، چ٢٠٠٦،١دەزگای موکریانی

٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی

٦٩- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ٢، ٢٠٠٦

٧٠- هونەروژیانی کۆمەلاَیەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی

٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ١،یانەی قەلَەم ٢٠٠٦

٧٢- رێبازە هونەرییەکانی جیهان

٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦

٧٤- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ٢٠٠٧،١

٧٥- دەربارەی رۆمان‌و چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨

٧٦- مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدبی-رۆشنبیری،حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك

٧٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی،٢٠٠٩

٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()

٧٩- پەلَکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤

٨٠- خیانەتی حەلاَلّ، حەمە کەریم عارف

٨١-بووکی هەزار زاوا، کۆچیرۆك، بزورگی عەلەوی

٨٢-ئەبوزەر، د.عەلی شەریعەتی

٨٣-ریوایەت، ڕۆمان، بزورگی عەلەوی

٨٤-وقفات في رحاب الثقافة الكوردية، حەمە کەریم عارف

٨٥-هەژاران، ڕۆمان، دوستوفسکی

٨٦-دەیڤد کۆپەرفیلد، (رۆمانی کورتکراوە بۆ نەوجەوانان) چارلس دیکنز

٨٧-ئۆدیسە، داستان، هۆمیرۆس

٨٨-ظل الصوت و قصص اخرى، تقديم و ترجمة جلال زنگابادی

٨٩-شازادە و گەدا، رۆمان، مارك توین

٩٠-توحفەنمای ئەدەبیاتی جیهانی

٩١-سفرەی فەقیران حەمە کەریم عارف

٩٢-بالَندەکەی من رۆمان، فریبا وفی

٩٣- نامەکانی تولستۆی

*** لـه راپەڕینــەوە تـا نهـوو چـالاكانە بەشـداری بزاڤـی ئـەدەبی و رۆشـنبیریی کـوردی دەکـات وبەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاودەکاتەوە..**
*** ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کـەس و گـروپ و لایـەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بکات...**